**ناوی کتێب: گوڵبژێرێک لە چیرۆکەکانی سادقی هیدایەت**

- نووسەر: سادقی هیدایەت
- وەرگێڕ: عەلی نانەوازادە
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ٨٤
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٢٥٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٥٢- (١٥٥)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**



## پێرست





سێ چیرۆکی ئەم کتێبە (بوومی کوێر، داش ئاکۆل، بووکی پشت پەردە)
ساڵی ١٩٩٥ لە سوید لە کتێبێکی سەربەخۆ دا بە ناوی بوومی کوێر بڵاو بوونەوە.





لە ژیان دا برینگەلێک هەن کە وەک خۆرە رووح بە کاوەخۆ لەپەناوە دەخۆن و دەتاشن.

ناکرێ ئەو دەردانە لای کەس دەربڕی، چونکە هەموو خوویان گرتوە کە ئەم دەردە باوەڕنەکراوانە بە رووداو و پێشهاتی کەم وێنە و سەیر دابنێن و ئەگەر کەسێک بیلێ یا بینووسێ، خەڵک بە پێی داب و نەریتی باو و بڕوای خۆیان هەوڵ دەدەن بە بزەی پڕ لە شک و گاڵتەجاڕەوە دەریبڕن - چونکە مرۆڤ هێشتا چارە و دەرمانێکی بۆ نەدیتۆتەوە و تەنیا دەرمانی ئەو لە بیر کردنی بە شەراب و خەوی مەسنووعی بە تریاک و بەنگە - بەڵام بەداخەوە شوێن داخستنی ئەم دەرمانانە کاتین و لە جیات ئارام کردنەوە دوای ماوەیەک ژانەکە پتر دەکەن.

ئاخۆ رۆژێک کەسێک پەی بە رازی ئەم رووداوە ماوەرای تەبیعیە، ئەم رەنگدانەوەی سێبەری رووح کە لە حاڵی بێهۆشی و بەرزەخی نێوان خەو و بێداریی دا خۆ دەنوێنێ، دەبا؟

من تەنیا باسی یەکێک لەو رووداوانە دەکەم کە بە سەر خۆم هاتوە و





بە رادەیەک کاری تێکردووم کە قەت لە بیری ناکەم و دروشمی شوومی هەتا هەم، لە ڕۆژی ئەزەل هەتا ئەبەد، هەتا ئەو رادەیە کە بەدەر لە فام و ئاوەزی بەشـــەرە ژیانی من ژاراویی دەکـــا ـ ژاراوییم نووسی، بەڵام دەمەویست بڵێم کە داغی ئەوم هەمیشە پێوەبوە و پێوەدەبێ.

من تێدەکۆشم ئەوەی کە لە بیرمە، ئەوەی کە لە پەیوەندی ئەو رووداوانە دا لە بیرم ماوە بینووسم، بەڵکەم بتوانم بیروڕایەکی گشتی لە سەر دەربڕم « نا، تەنیا دڵنیا بم یا هەر لانیکەم خۆم بتوانم باوەڕ بکەم ـ چونکە بۆ من چ گرینگ نیە کە هی دی باوەڕ بکەن یان نەکەن ـ تەنیا دەترسم کە سبەی بمرم و خۆم هێشتا نەناسیبێ ـ چونکە بە درێژایی ئەزموونی ژیان تووشی ئەوە هاتووم کە چ هەڵدێرێکی بە خۆف دە نێوان من و خەڵکی دیکە دا هەیە و تێگەیشتم کە تا دەگونجێ بێدەنگ بم، تا دەلوێ بیری خۆم بۆ خۆم راگرم و ئەگەر ئێستا تەمام گرتوە کە بنووسم، تەنیا بۆ ئەوەیە کە خۆم بە سێبەرەکەم بناسێنم ـ سێبەرێک کە لە سەر دیوار چەمـــاوەتەوە و وا وێدەچێ کـــە هەرچی دەینووسم تامـــەزرۆیانە هەڵیدەلووشێ ـ بۆ ئەوەکە دەمەوێ بە تاقی کەمەوە: بزانم بەشکەم بتوانین یەکدی باشتر بناسین. چونکە لەو کاتەوە کە تەواوی پەیوەندییم دەگەڵ خەڵکی دی بچڕیوە دەمەوێ خۆم باشتر بناسم.

قسەی پووچ! ـ باشە، بەڵام لە هەر راستییەک پتر ئازارم دەدا ـ ئایا ئەو خەڵکەی کە وەک منن، کە بە رواڵەت پێداویستی و هەوا و هەوەسی منیان هەیە، بۆ فریو دانی من نین؟ ئایا کۆمەڵێک سێبەر نین کە تەنیا بۆ گاڵتە کردن و هەڵخەڵەتاندنی من ساز بوون؟ ئایا ئەوەی کە هەستی پێدەکەم، دەیبینم و هەڵیدەسەنگێنم گشتی خەیاڵات نیە کە دەگەڵ راستی جیاوازییان زۆرە؟

من تەنیا بۆ سێبەری خۆم دەنووسم کە لە بەر چرا کەوتۆتە سەر دیوار، دەبێ خۆمی پێبناسێنم.

............................................................

لەم دونیا پەستەی پڕ لە هەژار و بێ ئەنوا، بۆ یەکەم جار پێموابوو کە





لە ژیانی من دا گزینگێکی هەتاو خۆی نواند ـ بەڵام مخابن، ئەوە گزینگ نەبوو، بەڵکە تەنیا شۆقێکی تێپەڕ، ئەستێرەیەکی باڵدار بوو کە بە سیمای ژنێک یا فریشتەیەک خۆی نواند و لە بەر رووناکی ئەو یەک دەمە، تەنیا یەک چرتە تەواوی بەدبەختیەکانی ژیانی خۆم دیت و پەیم بە مەزنایەتی و شکۆی برد و دوایە ئەم شۆقە لە گێژاوی تاریکی دا کە دەبا بزر بووباوە بزر بۆوە ـ نا، نەمتوانی ئەم شۆقە تێپەڕە بۆ خۆم راگرم.

سێ مانگ ـ نا، دوو مانگ و چوار رۆژ بوو کە شوێنیم ون کردبوو، بەڵام یادگاری چاوە جادووییەکانی یا بڵێسەی سووتێنەری چاوەکانی لە ژیانی من دا هەمیشە ماوە ـ چۆن دەتوانم ئەو لە بیر کەم کە ئەوەندە پەیوەندی بە ژیانی منەوە هەیە؟

نا، ناوی ئەو قەت نابەم، چونکە ئیتر ئەو بەو ئەندامە ئاسمانیە، شووش و تەماویی، بەو دوو چاوی درشت و واقوڕماوی کە لە پشت ئەو دا ژیانی من هێدی و بە ژان دەسووتا و گڕی دەگرت، پەیوەندی بەم دونیا پەست و دڕەوە نیە ـ نا، ناوی ئەو نابێ ئاوێتەی شتەکانی زەمینی بکەم.

دوای ئەو ئیتر بە تەواوی خۆم لە مەکۆی ئادەمەکان، لە مەکۆی گەوجەکان و خۆشبەختەکان کێشا دەرەوە و بۆ فەرامۆشی پەنام بردە بەر شەراب و تریاک ـ ژیانی من تەواوی رۆژ لە نێو چوار دیواری دیوەکەم دەگوزەرا و دەگوزەرێ ـ سەراسەری ژیانی من دە نێوان چوار دیوار دا گوزەراوە.

تەواوی رۆژ ئیشی من نەققاشی لە سەر بەرگی قەڵەمدان بوو ـ تەواوی کاتم بە نەققاشی لە سەر بەرگی قەڵەمدان و خواردنەوەی شەراب و کێشانی تریاک تێپەڕ دەبوو و پیشەی دزێوی نەققاشی سەر قەڵەمدانم هەڵبژاردبوو بۆ ئەوەی کە خۆم گێژ کەم، بۆ ئەوەی کە وەخت بکوژم.

بە هەڵکەوت ماڵەکەم لە دەرەوەی شار، لە شوێنێکی ئارام و بێدەنگ بە دوور لە هات و هەرای ژیانی خەڵک هەڵکەوتبوو ـ ئاقاری بە تەواوی ئاوەڵە و دەوروبەری وێرانەیە. تەنیا لەولای خەندەقەوە ماڵە گڵینە چەپۆک پێدادراوەکان دیارن و شار دەست پێدەکا. نازانم ئەو ماڵە کام شێت یا





کـەم سـەلیـقـەیەک لە سـەردەمـی دەقیـانووس دا سـازی کردوە. چاوم کـە دەقـووچێنم نە تـەنیـا تەواوی کون و کاژێرەکانی دێنە بەر زەینم، بەڵکە لە سـەر شـانم هـەست بـە قـورسـاییـان دەکـەم، مـاڵێک کـە تـەنیـا لـە سـەر قەڵەمدانەکانی قەدیم دەکرێ کێشابیانەتەوە.

دەبێ هـەمـــووی ئەوانـە بنـووسم تـا بزانم کـــە هـەڵەم نـەکـــردوە، دەبێ هەمووی ئەوانە بۆ سێبەری خۆم کە کەوتۆتە سەر دیوار بگێڕمەوە ـ ئەرێ، پێشـتر دڵخـۆشیەک یا دڵخـۆشکەرەوەیەکم بۆ مابۆوە. لە نێو چوار دیواری ژوورەکەم لە سەر قەڵەمدان نەققاشیم دەکرد و بەو پیشە دزێوە کاتم تێپەڕ دەکـرد، بەڵام دوای ئەوەکـە ئەو دوو چاوەم دیت، دوای ئەوەکـە ئـەوم دیت ئێتر مـانا، بایەخ و نرخی هـەر جـووڵە و بزووتنەوەیەکم لە بەر چاو کەوت ـ بەڵام شـتێکی کـە سـەیر، شـتێکی کە جـێی باوەڕ نەکردنە نازانم بۆچی مـاکەی هەمـوو نەقـقـاشـیـەکانم هەر لە سـەرەتاوە یەک شـێوە و یەک شکڵ بوە. هەمیشە دارێکی سەوڵم دەکێشاوە کە لە بنی پیرەپیاوێکی کووڕ وەک جـووکەکـانی هینـدووسـتـان عـەبا لە خـۆ پـێچـاو، هەڵتـرووشکاو، مـێـزەر لە سـەر و قـامکی شـادەی دەسـتی چەپی بە سـەرسـوڕمـاویی لە سـەر لێـو دانابـوو. ـ بەرانبـەری کـیـژێک بە جلی رەشـی درێژ داهـاتبـۆوە و گـوڵی لاولاوی دەدایە ـ چونکە لە نێـوانیـان دا جـۆگـەیەک هەڵکەوتبوو ـ ئـایامن پێشـترئەو کـۆڕەم  دیتبوو، یا لە خـەو دا پێم ئیلهام کرابوو؟ نازانم، تەنیـا دەزانم کـە هـەر چی دەمـکێـشـاوە هەمـووی ئەو کـۆڕە و ئـەو مـاکـەیە بوو، دەسـتم لـە خـۆوە ئەو وێنەی دەکـێـشـاوە و سـەیرتـر ئەوەکە بۆ ئەم نەقـشـە کـڕیـاریش دەست دەکەوت و تەنانـەت بە مـامم دا ئەو بەرگـە قـەڵەمـدانانەم دەنارده هیندووستان کە دەیفرۆشت و پارەکەی بۆ دەناردمەوە.

ئەو کـۆڕە هـەروەتر دوور و نزیک دەهاتـە بەر چاوم، چاکم لە بیـرم نیـە ـ ئێسـتـا شـتێکم وەبیـر هـاتەوە ـ کوتم: دەبێ بیرەوەریەکانی خـۆم بنووسـم، بەڵام ئەم رووداوە زۆر دواتر رووی داوە و پەیوەندی بەو باسـەوە نیە و هـەر لە بـەر ئەوەش دەسـتـم لە نەقـقـاشـی هەڵگرت ـ دوو مـانگ پێش، نا، دوو مـــانگ و چـوار رۆژ دەگـوزەرێ. سـێــزدەی نەورۆز بـوو. هەمـــوو خـــەڵک





شـالاویان بۆ دەرەوەی شار هێنابوو ـ من پەنجەرەی دیوەکەم داخسـتبـوو، هەتا بە ئەرخەیانی نەققاشی بکەم. نزیک تاوپەڕ تەواو خەریکی نەققاشی بووم، لە نەکاو دەرکە کراوە و مامم هاتە ژوور ـ یانی خۆی کوتی کە مامی منە، من قەت ئەوم نەدیبوو، چوونکە لە هەرەتی لاوەتی دا بۆ سەفەرێکی دوور و درێژ رۆیشتبوو. گۆیا کەشتیەوان بوو، پێموابوو کاری تەجارەتیی بە منە، چونکە بیسـتبـووم کـە تەجـارەتیش دەکـا ـ بە هەر حـاڵ مـامم پیرەمێردێک بوو کووڕ کە مێزەری هیندی لە سەر بەستبوو، عەبایەکی زەردی شڕی لە سەر شان بوو و سەر و رووی بە شالگەردن داپێچابوو، بەرۆکی ئاوەڵە بوو و تووکی سـینگی دەدیـترا. ریشی کـۆسـەی کـە لە ژێر شاڵ وەدەرکەوتبوو دەکرا چڵ چڵ بیژمێری، پێڵووی بە ناسۆری سوور و لێـوی کـەت بوو ـ بۆرە وێچـوونێکی دوور و سـەمـەرەی دەگەڵ من هەبوو، وەک ئەوەکـە وێنەی من کـەوتبـێتـە سـەر ئاوێنەیەکی تلّخ ـ من هەمـیشـە بیـچـمی بابم لە بەر خـۆم ئاوا دانـابوو، هەر هاتە ژووریّ چوە پەنایەک و هەڵتررووشکا ـ کوتم با شتێکی بۆ ساز کەم، چرام پێکرد، چوومە خەڵوەتی تاریکی ژوورەکەم، کەلێنەکانم پشکنی هەتا شـتێکی شایەنی بۆ بدۆزمەوە، هەرچەند دەمـزانی لە مـاڵەکـەم دا چ دەست ناکـەویّ، چونکە نە تریاکم مـابوو و نە شـەراب ـ لەپڕ چاوم بە سـەر رفـە کـەوت ـ دەتکوت ئیلـهـامم پێکرا. دیتم قـاپێک شەرابی کۆن کە بە میرات پێمبڕابوو ـ گۆیا بە بۆنەی لە دایک بوونی من ئەم شـەرابەیان دانابۆوە ـ لە سـەر رفە بوو، هیـچکات من وا بە زەین نەبووم، هەر تەواو لە بیرم چووبۆوە کە شتێکی وام دە ماڵ دا هەیە. بۆ ئەوەکە دەستم بگاتە سەر رفە چوارپایەیەک کە لەویّ بوو دە ژێر پێم نا بەلام هەر هاتم قاپەکە هەڵگرم لەپڕ لە دەلاقەوە چاوم بە دەریّ کەوت ـ دیتم لە سارای پشت وەتاغەکەم پیرەمێردێکی کووڕ، لە ژێر داری سـەوڵ دانیـشـتـبـوو و کـیـژێکی لاو، نا ـ فـریشـتـەیەکی ئاسـمـانیی لە بەرانبەری بە پێوە، داهاتبۆوە و بە دەستی راستی گوڵێکی لاولاوی کەوی رەنگی دەدایە، لە حالێک دا کە پێرەمێرد نینۆکی قامکی شادەی دەستی چەپی دەجووت.





کیژەکە دروست ڕووبەڕووی من بوو، بەڵام وادیار بوو کە چ ئاگای لە دەوروبەری خـــۆی نەبوو، دەیڕوانی بێ ئەوەی روانیــــبـــێی؛ بزەیەکی سێحراویی و بێخۆیی لە کونجی لێوی دا ویشک ببوو، وەک ئەوەکە بیری لە لای کەسـێکی نادیار بێ ـ لەوێڕا بوو کە چاوەکانی بە ســام و بە ئەفـســـوون، ئەو چاوانەی کــە لەوە دەچوون پەندێکی تاڵت دەدەنێ، چاوەکانی نیگەران، واقـوڕمـاو، بە هەڕەشــە و بەڵێنیـدەری ئەوم دیت و شۆقی ژیانی من لە سەر ئەم گۆ درەوشاوانەی پڕ لە مانا دا ئاوێتە بوو و لە بنی ئەو دا تواوە ـ ئەو ئاوێنە راکێشەرە هەموو بوونی منی هەتا ئەو رادەیە کە بیری بەشـەر لێی عاجزە بۆ لای خۆی راکێشا ـ چاوەکانی لاری تورکمەنی کە تیرێژێکی ئاسمانیی و مەستێنەری هەبوو، هاوکات دەیترساند و رایدەکێشا، وەک ئەوەکە بە چاوەکانی دیمەنێکی ترسێنەر و نائاسـایی دیتـبێ کە هەر کەسێک نەیدەتوانی بیبـینێ؛ کـوڵمی زەق، نێوچەوانی پان، برۆکانی باریک و سێبەنگی، لێوی گۆشتن و نیوەئاوەڵە، لێوگەلێک کە وێدەچوون تازە لە راموسانێکی گەرم و درێژخایەن جوێ ببـوونەوە بەڵام هێشـتـا تێر نەببـوون. پرچی لێک بـڵاوی رەش و ئاڵۆزی، دەوری سـیـمـای مـانگاسـای ئەویان گـرتبـوو و لۆیەکی بە لاجـانگیـەوە نووسـابوو ـ شلکی ئەندامەکانی و رەوتی ئاسمانیی خاوی، نیشاندەری سستی و کاتیی بوونی ئەو بوو، تەنیا کیژێکی سەماکەری بوتخانەکانی هیندی دەیتوانی رەوتی رێکوپێکی ئەوی هەبێ.

شێوەی شێواو و شادیی غەمێنەری هەمووی ئەوانە نیشانیان دەدا کە ئەو وەک خەڵکی ئاسایی نیە، جوانیی ئەو هەر ئاسایی نەبوو، ئەو وەک دیمەنێکی خەیاڵی نەشـەیی خـۆی پێنواندم... ئەو هەمـان تینی ئەوینی گـیـائادەمــەی لە من دا پێکهـێنا. بەژنی شـووش و زراوی بە خـەتێکی رێکوپێک کـە بە شـان، باسک، مـەمکەکـان، سـینگ، سـمت و بەلەکی دا دەهاتە خـوار وەک ئەوە بوو کــە لەشی ئەویان لە باوەشی جـووتەکــەی دەرهێنابێ ـ وەک گـیائادەمەی مێ بوو کـە لە هەمێزی جووتەکەی خۆی جوێیان کردبێتەوە.





جلێکی ڕەشی چینداری دەبەر کردبوو کە کیپ و چەسپی لەشی بوو، کاتێک من ڕوانیم دەتکوت دەیەوێ بە سەر جۆگەی نێوان خۆی و پیرەمێرد دا بازد بدا بەڵام نەیتوانی، ئەودەم پیرەمێرد لە پێکەنینی دا، کەنینێکی ویشک و کرێت بوو کە مچوڕکی بە لەش دا دێنا، کەنینێکی یەکجار دووڕەگە و گاڵتەجاڕانە بوو بێ ئەوەی سیمای بگۆڕدرێ، وەک دەنگ دانەوەی پێکەنینێک بوو کە لە بۆشایی هاتبێتە دەر.

من لە حاڵێک دا قاپی شەرابم بە دەستەوە بوو، هەراسان لە سەر چوارپایەکە بازدم دا ـ نازانم بۆ دەلەرزیم ـ جۆرێک لەرزی پڕ لە ترس و کەیف بوو، وەک ئەوەی کە لە خەوێکی خۆش و ترسناک ڕاپەڕیبم ـ قاپە شەرابەکەم لە سەر زەوی دانا و سەرم دە نێو دوو دەستم نا ـ چەند دەقیقە، چەند ساعەتی خایاند؟ نازانم ـ هەر وەخۆ هاتمەوە قاپە شەرابەکەم هەڵگرتەوە، وەژوور کەوتم، دیتم مامم ڕۆیشتوە و دەرکەی وەک زاری مردوو ئاوەڵە بەجێ هێشتوە ـ بەڵام زایەڵەی کەنینی ویشکی پیرەمێرد هێشتا لە گوێم دا دەزرینگاوە.

هەوا تاریک دەبوو، چرا دووکەڵی دەکرد، بەڵام هێشتا ئەو لەرزە بە کەیف و ترسناکەی کە لە خۆم دا هەستم پێکردبوو تێمدامابوو ـ ژیانی من لەو ساتەوە گۆڕا ـ بە نیگایەک بەس بوو، بۆ ئەوەی کە ئەو فریشتە ئاسمانییە، ئەو کیژە ڕووحانییە، تا ئەو ڕادە کە زەینی بەشەر لە هەست پێکردنی عاجزە، شوێنی خۆی لە سەر من دانێ.

لەو کاتە دا لە خۆ ببوومەوە؛ دەتکوت پێشتر ناوی ئەوم زانیوە. پڕشنگی چاوەکانی، ڕەنگی، بۆنی، هەڵسوکەوتی هەمووم لا ئاشنا بوون، وەک ئەوەکە ڕەوانی من لە ژیانی پێشوو، لە عالەمی میسال دا دەگەڵ ڕەوانی ئەو دراوسێ بوە، لە یەک ڕەگەز و یەک ماکە بوە و دەبێ تێکەڵاوی یەکتر بووبین. دەبوا لەم ژیانە دا نزیکی ئەو ببوایەم. قەت نەمدەویست دەستی لێبدەم، تەنیا تیشکێکی نادیار کە لە لەشی ئێمە دەهاتە دەر و ئاوێتەی یەک دەبوون بەس بوو، ئەم پێشهاتە ترسێنەرە کە بە یەکەم نیگا پێم ئاشنا بوو، ئایا دوو کەسی ئەویندار هەمیشە ئەو هەستەیان نیە کە





پێشتر یەکتریان دیوە، کە پەیوەندییەکی شاراوە دەنێوانیان دا هەبوە؟ لەم دونیا پەستە دا یا ئەوینی ئەوم دەویست و یا ئەوینی هیچکەسی دی ـ ئایا لەوانە بوو کەسێکی دیکە شوێنم لە سەر دابنێ؟ بەڵام کەنینی ویشک و کرێتی پیرەمێرد ـ ئەم کەنینە شوومە پەیوەندی نێوان ئێمەی لێکدەپچڕی.

تەواوی شەو لەو بیرە دا بووم، چەند جار ویستم بڕۆم لە دەلاقەوە بڕوانم بەڵام لە کەنینی پیرەمێرد دەترسام، ڕۆژی دواتریش لەو بیرە دا بووم. ئایا دەمتوانی لە دیتنی چاوپۆشی بکەم؟ لە ئاکام سبەینێی ئەو ڕۆژە بە هەزار ترس و لەرز تەمام گرت کە قاپی شەراب لە سەر جێگەی خۆی دانێمەوە بەڵام هەر پەردەی خەڵوەتیم لادا دیتم دیوارێکی ڕەشی تاریک، وەک ئەو تاریکییەی کە سەراسەری ژیانی منی داگرتوە لە پێش من بوو، هەر هیچ کون و کولانەیەک بۆ دەرێ نەدەدیترا ـ دەلاقەی چوارگۆشەی دیوار بە تەواوی بەستراو و وەک وی لێهاتبوو، وەک ئەوەی کە هەر لە سەرەتاوە نەبووبێ ـ چوارپایەکەم کێشا پێشێ بەڵام هەرچی دیناسا مستم لە دیوار دەکوتا و گوێم هەڵدەخست یا لە بەر چرا چاوم لێدەکرد چووکترین شوێنی دەلاقەی دیوار نەدەدیترا و مستی من کاری لە دیواری ئەستوور نەدەکرد ـ یەکدەست ببوو بە سورب.

ئایا دەمتوانی بە یەکجاری چاوپۆشی لێبکەم ؟بەڵام بە دەست خۆم نەبوو، لەوە بەدوا وەک رووحێک کە لە ئەشکەنجە دابێ، هەرچی چاوەڕوان بووم، هەرچی کێشکم گرت، هەرچی گەڕام، کەلکی نەبوو. ـ تەواوی دەوروبەری ماڵ گەڕام، نە ڕۆژێک، نە دوو ڕۆژ، بەڵکە دوو مانگ و چوار ڕۆژ وەک کەسانی خوێنگرتوو کە دەگەڕێنەوە سەر شوێنی جەنایەتەکەیان، هەموو ڕۆژێ دەمی تاوپەڕ وەک مریشکی سەربڕاو دەوری ماڵ دەگەڕام، وەها کە هەموو خیز و بەردەکانی دەوروبەرم دەناسینەوە. بەڵام هیچ ئاسەوارێکم لە داری سەوڵ، لە جۆی ئاو و لەو کەسانەی کە لەوێ دیبوومن بەدی نەکرد ـ ئەوەندەی شەوانە لە بەر تریفەی مانگ بە ئەژنۆ داکەوتم، لە بەر دارەکان، لە بەر بەردەکان، لە بەر مانگ کە لەوانەیە ئەو چاوی لە من کردبێ، دەپاڕامەوە و هەموو گیاندارەکانم بۆ یارمەتی بانگ





دەکـردن بەڵام چووکـتـرین شـوێنەوارێکم لەو نـەدیت ـ تێگەیشـتم کـە ئەو کـارانـە بێ کـەلکن، چونکە ئەو نەیدەتوانی دەگـەڵ شـتـەکانـی ئەو دەنیـایە پەیوەندی و بـەینی هـەبێ ـ بۆ وێنە ئـاوێک کـە ئەو پرچـەکانی پێـدەشـوشت دەبێ لە کـانیـاوێکی تایبـەتی نەناسـراو یا هی ئەشـکەوتێکی سـێحـراوی بووبـێ، جلی ئەو لـە تان و پۆی پەشـم و پەمـۆی ئـاسـایـی نەبوە و دەسـتـی ماددی، دەستەکانی مرۆڤ نەیدرووبوو ـ ئەو بوونەوەرێکی هەڵبژاردە بوو ـ تێگەیشتم کە ئەو گوڵە لاولاوەش گوڵێکی ئاسایی نەبوە، دڵنیا بووم ئەگەر ئاوی ئـاسـایی بە رووی داکردبا روخساری دەژاکا و ئەگەر بە ئەنگوسـتـە شـووش و باریکەکـانـی گـوڵی لاولاوی ئـاسـایی لێکردباوە، ئـەنگوسـتـی وەک پەلکی گوڵ سیس دەبوو.

هەمـووی ئەوانـە تێگەیشـتـم، ئەم کـیـژە، نا ئەم فـریشـتــەیە، بـۆ من سـەرچـاوەی سـەرسـوڕمـان و ئیلهـامێکی لە گوتەن نـەهـاتوو بوو، گـیـانـی ناسک بوو و بـۆ دەست لێـدان نەدەبوو. ئەو بوو کـە هەسـتـی پەرسـتنی دە من دا پێکهێنا. من دڵنیـام کە نیگای کـەسێکی بیانـی، کەسێکی ئـاسـایی ئەو جارِز و سیس دەکا.

لەو کـاتەوە کـە ئـەوم بزر کـرد، لەو زەمـانـەوە کـە دیوارێکی قـورس، بەرگـرێکی شـێـداری بێ درز بە قـورسـایی سـورب دە نێـوان مـن و ئەو کێشراوە، هەستم کرد کە ژیانم بۆ هەمیشە بێسوود و بزر بوە. ئەگەرچی لە لاواندنەوەی نیگا و کـەیفێکی زۆر کە لە دیتنی ئەو بـردبووم یەک لایەنە بوو و وڵامێکی بۆم نەبوو؛ چـونکە ئەو منی نەدیبوو، بەڵام من پێویسـتـیـم بەو چاوانە هەبوو و تەنیا نیگایەکی ئەو بەس بوو کە هەمـوو گیروگرفتی فـەلسـەفی و رازەکـانی خـوداییم بۆ چارەسـەر کـا ـ بە نیگایەکی ئەو ئیـتـر راز و نەهێنییەک بۆ من نەدەما.

لەوە بە دوا رادەی شـەراب و تریاکی خـۆم پـتـر کـرد، بەڵام مـخـابن لە جیات ئەوەکە ئەو دەرمـانە ناهومێدییانە بیری من سڕ و کـەسیرە بکەن، لە جیـات ئەوەکە لـە بیـر بکەم، رۆژ بە رۆژ، سـاعـەت بە سـاعـەت، دەقیـقـە بە دەقیقـە بیری ئەو، ئەندامی ئەو، سیمای ئـەو زۆر پتر لە جاران دەهاتە بەر





چاوم.

چلۆن دەمتوانی لە یادی بکەم؟ چاوەکانم کە هەڵێنابان یا وێکمنابان لە خەو و بێداریی دا ئەو لە پێش من بوو، لە دەلاقەی خەڵوەتی ژوورەکەمەوە، وەک شەوێک کە بیر و مەنتق خەڵکی داگرتبێ، لە کونی چوارگۆشەیەکەوە کە بۆ دەرێ دەکراوە، هەمیشە لە بەر چاوم بوو.

حەسانەوەم لێ حەرام ببوو، چلۆن دەمتوانی بحەسێمەوە؟ وام خوو گرتبوو کە هەموو رۆژێ جەنگەی ئێواریێ بچمە گەڕان. نازانم بۆچی دەمەویست و لە سەر ئەوە سوور بووم کە جۆگەی ئاو، داری سەوڵ و پنچکی گوڵی لاولاو بدۆزمەوە ـ هەر ئەوجۆرەی ئالوودەی تریاک ببووم، هەر ئەوجۆرەش خووم بەو گەڕانە گرتبوو، دەتکوت هانەیەک ئەو کارەی پێدەکردم. بە درێژایی رێگا هەر دە بیری ئەو دابووم، بە یادی یەکەم چاوپێکەوتنێک کە دەگەڵ ئەو هەمبوو و دەمەویست شوێنێک کە رۆژی سێزدەبەدەر ئەوم لەوێ دیبوو بدۆزمەوە. ـ ئەگەر ئەوێم دیتباوە، ئەگەر توانیبام لە ژێر ئەو دارە سەوڵە دابنیشم بێ شک لە ژیانی من دا هێمنایەتییەک پێکدەهات ـ بەڵام مخابن جگە لە چرپی و لمی داغ و ئێسکی پەراسووی ئەسپ و سەگێک کە بۆنی بە زبڵەکانەوە دەکرد شتێکی دیکە نەبوو ـ ئایا بە راستی من دەگەڵ ئەو دیدارم هەبوە؟ ـ هەرگیز، تەنیا ئەوم بە دزی و پەنامەکی لە کونێکەوە، لە دەلاقەی بەدبەختی ژوورەکەمەوە دیوە ـ وەک سەگێکی برسی کە بۆن بە زبڵ و زاڵەکانەوە دەکا و دەیپشکنێ، بەڵام هەر لە دوورەوە زەمبیل دێنن لە ترسان دەڕوا و خۆی حەشار دەدا، پاشان دەگەڕێتەوە کە کوتی خۆشی بەر زاری لە زبڵی تازە دا بدۆزێتەوە. منیش هەر ئەو حاڵەم هەبوو، بەڵام ئەم رۆچناییە بەسترابوو ـ بۆ من ئەو چەپکە گوڵێکی تەڕ و تازە بوو کە لە سەر زبڵەکان فڕێیان دابێ.

دوایین شەو کە وەک هەر شەوێک چوومە گەڕان، هەور و هەوا و بارانی بوو و تەپ و مژێکی خەست وڵاتی داگرتبوو ـ لە هەوای بارانی دا کە لە دزێوی رەنگەکان و بێحەیایی خەتەکانی ئەشیا کەم دەکاتەوە، من هەستم بە چەشنێک ئازادی و هێمنی دەکرد و وەک ئەوە بوو کە باران





بیری ڕەشی منی دەشووشتەوە ـ لەو شەوە دا ئەوەی کە نەدەبا بوویا بوو ـ من لە خۆوە دەخولامەوە بەڵام لەو ساعەتانەی تەنیایی، لەو دەقیقانە کە دروست ماوەکەیم لە بیر نیە زۆر بە بڕشتتر لە جاران سیمای حەپەساو و نادیاری ئەو، وەک ئەوەکە لە پشت هەور و دووکەڵ خۆی نواندبێ سیمای بێ بزووت و بێ حاڵەتی وەک نەققاشیەکانی سەر بەرگی قەڵەمدان لە بەر چاوم بوو.

کاتێک گەڕامەوە پێموایە لە شەو زۆر تێپەڕ ببوو و مژێکی خەست لە هەوا دا کۆ ببۆوە. وەها کە چاک بەر پێم نەدەدیت، بەڵام بە پێی عادەت، بە پێی هەستێکی تایبەتی کە لە من دا پەیدا ببوو هەر گەیشتمەوە بەر دەرگای ماڵەکەم دیتم تارماییەکی ڕەشپۆش، قەڵافەتی ژنێک لە سەر سەکۆی دەرگای ماڵەکەم دانیشتوە.

شەمچەم هەڵکرد کە جێ کلیل بدۆزمەوە بەڵام نازانم بۆ لەخۆوە چاوم بەرەو تارماییە ڕەشپۆشەکە گەڕاوە و دوو چاوی لار، دوو چاوی درشتی ڕەش کە لە سیمای لاوازی مانگاسای دابوو، ئەو چاوانەی کە چاو لە مرۆڤ دەبڕێ بێ ئەوەی کە بڕوانێ، ناسیمەوە. ئەگەر ئەوم پێشتر لەوە نەدیبا، دەمناسیەوە ـ نا، بە هەڵە نەچووبووم. ئەم تارماییە ڕەشە ئەو بوو ـ من وەک ئەو دەمەی کە مرۆڤ خەون دەبینێ، بۆ خۆی دەزانێ کە خەونە و دەیەوێ هەستێ بەڵام ناتوانێ. گێژ و مات وێستام، لە سەر جێی خۆم ویشک بووم ـ شەمچە هەتا ئاخر سووتا و ئەنگوستەکانمی سووتاند، ئەودەم لە پڕ وەخۆ هاتمەوە، کلیلم لە قفڵ دا گێڕا، دەرگا کراوە، خۆم کێشا دواوە ـ ئەو وەک کەسێک کە شارەزا بێ لە سەر سەکۆ هەستا، بە دالانی تاریک دا ڕۆیشت. دەرکەی ژوورەکەی کردمەوە و منیش بە دوای دا چوومە ژوورێ. بە شێواوی چراکەم پێکرد، دیتم ئەو ڕۆیشتوە و لە سەر تەختی من درێژ بوە. سیمای وە بەر نسێ کەوتبوو نەمدەزانی من دەبینێ یا نا، دەنگی من دەبیسێ یا نا، بەرواڵەت نە ترسی هەبوو و نە مەیلی بەرگری. وەک ئەوە بوو کە بێ ویستی خۆی هاتبوو. ـ

ئایا نەخۆش بوو، ڕێگای ون کردبوو؟ ئەو لە خۆوە وەک کەسێکی





خەوگەڕ هاتبوو ـ لەم کاتە دا ئەو حاڵەتانەی کە بە سەر من دا تێپەڕین هیچ بوونەوەرێک  ناتوانێ بە بیریشی دا بێ ـ هەستم بە ژیانێکی خۆشی ناگوتەنی کرد ـ نا، فریوم نەخواردبوو ئەمە هەمان ژن، هەمان کیژە کە بەبێ سەرسوڕمان، بەبێ دەربڕینی وشەیەک هاتە ژووری دیوەکەی من؛ هەمیشە لە لای خۆم ئاوام دانابوو کە یەکەم دیتنمان بەمجۆرە دەبێ. ئەم حاڵەتە بۆ من وەک خەوێکی قورسی بێبڕ بوو چونکە دەبێ خەوێکی قورس داتبگرێ هەتا بکرێ خەونێکی ئاوا ببینی و ئەم بێدەنگییە بۆ من حوکمی ژیانێکی ئەبەدی هەبوو، چونکە لە حاڵەتی ئەزەل و ئەبەد دا ناکرێ قسە بکەی.

بۆ من هەروەتر ئەو ژنێک بوو و شتێکی ئەوپەڕی بەشەری پێبوو. سیمای فەرامۆشییەکی گێژکەری سیمای هەموو ئینسانەکانی دیکەی بۆ دێنام ـ بە چەشنێک کە لە تەماشای ئەو لەرزیمەوە و ئەژنۆم سست بوون ـ لەو کاتە تەواوی بەسەرهاتی پڕ لە ژانی ژیانی خۆم لە پشت چاوە گەورەکانی، چاوەکانی بێ ئەندازە درشتی ئەو دا دیت، چاوەکانی تەڕ و گەش، وەک گۆی ئەڵماسێکی رەش کە لە فرمێسکیان هاویشتبێ ـ لە چاوەکانی دا ـ لە چاوە رەشەکانی دا شەوێکی ئەبەدی و تاریکییەکی زەنگ کە لێی دەگەڕام دیتمەوە و لە سیایی بە خۆف و سێحراوی ئەو دا وە مەلە کەوتم، وەک ئەوە بوو کە هێزێک لە هەناوم دەکێشنە دەرەوە، زەوی لە ژێر پێم دەهەژیا و ئەگەر کەوتبام کەیفێکی ناگوتەنیم دەکرد.

دڵم وێستا، بەری هەناسەم گرت، دەترسام هەناسەی هەڵکێشم و ئەو وەک هەور یا دووکەڵ ون بێ، بێدەنگی ئەو وەک موعجزە وابوو، وەک ئەوە بوو کە دیوارێکی بلوورینیان لە نێوان ئێمەدا کێشابێ، لەو کاتە، لەو ساعەتە و یا لەو ئەبەدیەتە دا دەخنکام ـ چاوە ماندووکانی ئەو وەک ئەمە کە شتێکی نائاسایی کە هەموو کەس ناتوانێ ببینێ، وەک ئەمە کە مەرگی دیتبێ، ئارام وێک هاتن، پێڵووکانی بەستران و من وەک خنکاوێک کە دوای پەلەقاژە وەسەر ئاو دەکەوێ لە تاوی یاو و تێ هەڵلەرزیم و بە سەردەستم ئارەقەی نێوچەوانم سڕیوە.





سیمای ئەو هەمان حاڵەتی ئارام و بێ بزووتی هەبوو بەڵام واوێدەچوو کە لاوازتر و کزتر ببوو. هەروا کە درێژ ببوو نینۆکی قامکی شادەی دەستی چەپی دەجووت ـ رەنگی سیمای مانگاسا و لە بن جلی رەش و تەنکی کە کیپی لەشی بوو خەتی بەلەکی ، باسک و دوو لای سینگی و تەواوی گیانی بە دەرەوە بوو.

بۆ ئەوەکە باشتر ببینم داهاتمەوە، چونکە چاوەکانی قووچاندبوو. بەڵام هەرچی روانیمە روخساری واوێدەچوو کە زۆر لە من دوورە ـ لە نەکاو هەستم کرد کە من بە هیچ جۆرێک لە ناخی دڵی ئاگادار نەبووم و چ پەیوەندییەک دە نێوان ئێمە دا نیە.

ویستم شتێک بڵێم بەڵام دەترسام گوێی ئەو، گوێیەکانی بە هەستی ئەو کە دەبێ بە مۆسیقایەکی دووری ئاسمانی راهاتبێ لە دەنگی من بێزار بێ.

کوتم لەوانەیە برسی یا تینوو بێ، چوومە خەڵوەتی هەتا شتێک بدۆزمەوە ـ ئەگەر چی دەمزانی لە ماڵەکەم دا چ دەست ناکەوێ ـ بەڵام دەتکوت ئیلهامم پێکراوە، لە سەر رفە قاپە قاپە شەرابێکی کۆنم هەبوو کە لە باوکم بە میرات پێم برابوو ـ چوارپایەکەم دانا ـ قاپی شەرابم هێناخوار ـ لە سەر پەنجەی پێیان چوومە پەنا تەختەکە، دیتم وەک منداڵێکی ماندوو و شەکەت خەوتوە. ئەو خەرپ خەوی لێکەوتبوو و مژۆڵە درێژەکانی وەک مەخمەر کەوتبوونە سەر یەک. زارکی قاپەکەم کردەوە و ئارام پیاڵەیەکم شەراب بە نێو ددانە لێک قفڵ بوەکانی دا، دە زاری کرد.

بۆ یەکەم جار لە ژیانم دا هەستی هێمنی لە پڕ بەدی هات. چون دیتم ئەو چاوانە بەستراون، وەک شێرپەنجەیەک کە منی ئەشکەنجە دەکرد و مۆتەیەک کە بە چنگی ئاسنینی دەروونی منی رێکدەکوشی، کەمێک ئارام بوو. سەندەڵی خۆم هێنا، لە پەنا تەختەکەم دانا و چاوم لە سیمای بڕی ـ چ روخسارێکی منداڵانە، چ حاڵەتێکی غەریب! ئایا لەوانە بوو کە ئەو ژنە، ئەو کچە، یا ئەو فریشتەی عەزاب ( چونکە نەمدەزانی چ ناوێکی لێبنێم ) ئایا لەوانە بوو کە ئەو ژیانێکی دوو جۆرەی هەبێ؟ ئەوەندە ئارام، ئەوەندە





ئەرخەیان؟

ئێستا من دەمتوانی هەست بە تینی لەشی بکەم و بۆنێکی شێدار کە لە پرچە پڕ و رەشەکانی دەهات، هەڵمژم ـ نازانم بۆچی دەستی لەرزۆکم بەرز کردەوە. چونکە دەستم لە فەرمانی من دا نەبوو و بە سەر پرچیم داهێنا ـ پرچێک کە هەمیشە بە لا جانگیەوە نووسابوو ـ دوایە قامکەکانم دە پرچی نا ـ موویەکانی سارد و شێدار بوو ـ سارد، تەواو سارد. دەتکوت چەند رۆژە کە مردوە ـ من بە هەڵە نەچوو بووم، ئەو مرد بوو. دەستم بە بەرۆکی دا بردە ژوور و لە سەر مەمک و دڵیم دانا ـ چووکترین ترپەم هەست پێنەکرد، ئاوێنەم هێنا و لە بەر کەپۆم راگرت، بەڵام چووکترین ئاسەواری ژیانی تێدا نەبوو...

ویستم بە تینی لەشی خۆم گەرمی کەمەوە، تینی بدەمێ و ساردیی مەرگی لێوەرگرم بەشکەم بەمجۆرە بتوانم رووحی خۆم لە جەندەکی ئەو بنێم ـ جلەکانم داکەند و لە سەر تەخت لە پەنای درێژ بووم ـ وەک نێرتک و مێیەی گیائادەمە بە یەکەوە نووسابووین، لەشی ئەو هەر وەک مێیەی گیائادەمە بووکە لە نێرەکەی خۆی جوێیان کردبێتەوە و هەمان ئەوینی بە تینی گیائادەمەی هەبوو ـ زاری مڵ و تاڵ، تامی قونگە هارۆی دەدا ـ تەواوی لەشی وەک تەرزە سارد ببۆوە، هەستم دەکرد خوێن لە رەگەکانم دا دەیبەستێ و ئەم سەرمایە هەتا ناخی دڵم دەچێ ـ تەواوی هەوڵی من بێ کەلک بوو، لە تەخت هاتمە خوار، جلەکانم دەبەر کردەوە. نا، درۆ نەبوو، ئەو لێرە لە دیوی من، لە تەختی من دا هاتبوو خۆی تەسلیم بە من کرد. لەش و رووحی هەر دووک دا بە من!

هەتا زیندوو بوو، هەتا ئەودەم کە چاوەکانی لە ژیان ژاوەیان دەهات، تەنیا یادگاری چاوەکانی منی ئازار دەدا، بەڵام نووکە بێ هەست و خوست، سارد و بە چاوی قووچاو هاتوە و خۆی تەسلیم بە من کرد ـ بە چاوی قووچاو!

ئەمە هەر ئەو کەسە بوو کە تەواوی ژیانی منی ژاراوی کردبوو و یا هەر ژیانی من بۆی هەبوو کە ژاراوی بێ و من جگە لە ژیانی ژاراوی





ژیانێکی دیکەم نەدەتوانی هەبا ـ ئێستا لێرە لە دیوەکەم لەش و سێبەری دا بە من ـ رووحی ناسک و کاتیی ئەو کە چ پەیوەندییەکی بە دونیای زەمینیانەوە نەبوو لە نێو جلی رەشی چینداری دا بە ئارامی هاتە دەر، لە نێو لەشێک کە ئەوی ئەشکەنجە دەکرد و بۆ دونیای سێبەرە سەرگەردانەکان دەچوو، دەتکوت سێبەری منیشی دەگەڵ خۆی برد. بەڵام لەشی بێ هەست و بێ بزووت لەوێ کەوتبوو ـ ماسوولکە نەرم و شلکەکانی ئەو، رەگ و دەمار و ئێسکەکانی چاوەڕوانی پوان بوون و خۆراکێکی بە تام بۆ کرمەکان و جرجەمشکەکان ساز کرابوو ـ من لەو دیوە هەژارانەی پڕ لە بەدبەختی و چارەڕەشی دا، لە دیوێک کە وەک گۆڕ بوو، لە نێو تاریکی شەوەزەنگێکی هەرمان دا کە منی داگرتبوو و چووبوە نێو بارستایی دیوارەکانەوە، دەبوا شەوێکی درێژی تاریکی سارد و بێبن لە پەنا مردوو تێپەڕ بکەم ـ دەگەڵ مردووی ئەو ـ

وا هاتە بەر زەینم کە تا دونیا دونیایە تا من بوومە ـ مردوویەک، مردوویەکی سارد و بێ هەست و بێ بزووت لە دیوێکی تاریک دا دەگەڵ من بوە.

لەم کاتە دا بیرم بەستبووی ژیانێکی تایبەتی و سەیر لە من دا ساز ببوو. چونکە ژیانم پەیوەندی بە هەموو بوونەوەرانێکەوە هەبوو کە لە دەوری من بوون، بە هەموو ئەو سێبەرانەی کە لە دەورەم دەلەرزانەوە و پەیوەندییەکی قورس و پتەوم دەگەڵ دونیا و بزووتنەوەی گیانداران و سروشت هەبوو و بە هەودایەکی نادیار رەوتێکی لەرزۆک دەنێوان من و هەموو ماکەکانی سروشت دا پێکهاتبوو ـ هیچ بیر و خەیاڵێک لە لام نائاسایی نەبوو ـ من دەمتوانی بە سانایی بە رازی نەقڤاشیەکانی کۆن، بە سرڕی کتێبەکانی سەختی فەلسەفە، بە گەوجیی سەرەتایی شکڵەکان و جۆرەکان پەی بەرم. چونکە لەو کاتە دا من لە خولی زەوی و ئاسمان، لە هەڵدان و رسکانی گژ و گیا و جووڵانەوەی گیانداران دا بەشداریم هەبوو، رابوردوو و داهاتوو، دوور و نزیک دەگەڵ ژیانی پڕ لە هەستی من هاوبەش و هاودەم ببوو.





لەو کاتە دا هەر کەسە بە خوویەکی پڕ هێزی ژیانی خۆی، بە هۆگریی خۆی پەنا دەبا: ئارەقخۆر دەڕوا مەستێ دەکا، نووسەر دەنووسێ، بەردتاش بەرد دەتاشێ و هەر کام گریمانە و رقی خۆیان بە راکردن لە هاندەری بە هێزی ژیانی خۆیان دەڕێژن و لەو کاتانە دایە کە هونەرمەندێکی راستەقینە دەتوانێ لە خۆیەوە شاکارێک پێکبینێ ـ بەڵام من، من کە بێ سەلیقە و بێچارە بووم، نەققاشێکی سەربەرگی قەڵەمدان دەمتوانی چ بکەم؟ بەو وێنە ویشک و زەق و بێ رووحانە کە هەموویان وەک یەک بوون دەمتوانی چ بکێشمەوە کە شاکار بێ؟ بەڵام لە تەواوی بوونی خۆم دا زەوقێکی سەرریژ و گەرمایەکی بەتینم هەست پێدەکرد، جۆرێک مەیل و تاسەی تایبەت بوو، دەمەویست ئەو چاوانەی کە بۆ هەمیشە قووچاون بیانهێنمە سەر کاغەز و بۆ خۆمی هەڵگرم. ئەو هەستە وای لێکردم تەمای خۆم بێنمە دی، یانی بە دەست خۆم نەبوو. ئەویش ئەودەم کە مرۆڤ دەگەڵ مردوویەک زیندانی کراوە ـ ئەو بیرە شادییەکی تایبەتی دە من دا پێکهێنا.

لە ئاکام دا چراکەم کە دووکەڵی دەکرد کووژاندەوە، دوو شەمدانم هێنا و لە بان سەریم هەڵکرد ـ لە بەر شۆقی لەرزۆکی شەم حاڵەتی سیمای هەندێک ئارامتر بوو و لە تاریک و روونی ژوورەکەم دا شێوەیەکی پڕ راز و رەمزی و ئاسمانیی بە خۆوە گرت ـ کاغەز و کەرەسەی کارم هەڵگرت و هاتمە پەنا تەختی ئەو ـ چونکە ئیتر ئەم تەختە هی ئەو بوو ـ دەمەویست ئەم شکڵەی کە زۆر بە هێدی و وردەوردە مەحکووم بە رزان و فەوتان بوو، ئەم شکڵەی کە بە رواڵەت بێ بزووت و بە یەک شێوە بوو بە ئەرخەیانی لە رووی بکێشمەوە، لە سەر کاغەز خەتە بنەڕەتیەکان بنەخشێنم. ـ هەر ئەو خەتانەی کە لەو سیمایە دا کاریان تێکردبووم هەڵبژێرم. ـ نەققاشی هەر چەند کورت و ساکار بێ بەڵام دەبێ شوێن دابخا و رووحێکی هەبێ، بەڵام من کە خووم بە نەققاشی چاپی سەر بەرگی قەڵەمدان گرتبوو ئێستا دەبا مێشکی خۆم وە کار خستبا و خەیاڵی خۆم یانی ئەو تارماییەی کە لە سیمای ئەو شوێنی لە سەر من داخستبوو بێنمە بەر زەینم، چاوێک لە





سـیمـای بکەم دوایی چاوم وێک نێم و ئەو خەتانەی کە لە سیـمـای ئەو هەڵمدەبژاردن بهێنمـە سەر کاغەز تاکوو بەم جۆرە بە فکری خۆم بەشکەم تریاکێک بۆ رووحی ئەشکەنجە کراوم بدۆزمەوە ـ لە ئاکام پەنام بردە بەر ژیانی بێ بزووتی خەتەکان و شکڵەکان. ـ

ئەم شێوازە دەگەڵ شێوەی نەققاشی مردوەکەی من هاورەنگییەکی تایبەتی هەبوو ـ نەققاشی لە مردوو ـ ئەسڵەن من نەققاشی مردوەکان بووم. بەڵام چاوەکان چاوەکانی قووچاوی ئەو، ئایا پێویستیم هەبوو کە دیسان ئەوان ببینمەوە، ئایا بە رادەی پێویست لە بیر و مێشکی من دا نەبوون؟

نازانم هەتا نزیک بەیانی چەند جـــار لە رووی رووخـــســـاری ئەو نەققاشیم کرد بەڵام هیچ کامیانم بە دڵ نەبوو، هەر چیم دەکێشاوە دەمدڕاند ـ لەو کارە نە ماندوو دەبووم و نە هەستم بە تێپەڕینی زەمان دەکرد.

تاریک و روون بوو، رووناکاییەکی کز لە پشت شووشەکانی پەنجەرەوە هاتبوو ژوورەکەم، من خەریکی وێنەیەک بووم کە پێم لە هەموان باشتر بوو بەڵام چاوەکـــان؟ ئەو چاوانەی بە حـــاڵی لۆمـــە بوون وەک ئەوەکـــە گوناهێکی نەبەخشراوم کردبێ، ئەو چاوانەم نەدەتوانی بێنمە سەر کاغەز ـ لە نەکاو هەموو ژیان و بیرەوەری ئەم چاوانەم لە مێشک پاک ببۆوە ـ حەولی من بێ کەلک بوو، هەر چی چاوم لە سیمای دەکرد، نەمدەتوانی حاڵەتی ئەو وەبیر بێنمـەوە ـ لەپڕ دیتم لەم کاتە دا کوڵمەکانی ئەو کەم کەمە سوور بوونەوە، رەنگێکی سووری وەک جەرگ وەک رەنگی جەرگی بەر دوکانی گۆشتفرۆش بوو، گیانی گرت وچاوەکانی لە رادە ئاوەڵە و سەیری ئەو، چاوگەلێک کە هەموو تیشکی ژیانیان تێدا کۆ ببۆوە و بە شۆقێکی ناخۆش دەدرەوشاونەوە، چاوەکانی نەخۆشی لۆمەکەری ئەو زۆر ئارام کراوە و سەیری منی کرد ـ بۆ یەکەم جار بوو کە هەستی بە بوونی من کرد، چاوی لە من کرد و دیسـان چاوەکانی وێکناوە ـ ئەم پێشـهـاتە لەوانەیە ساتێک پتری نەخایاندبێ بەڵام بۆ من بەس بوو کە حاڵەتی





چاوەکـانی وەربگرم و بیـهـێنمـە سـەر کـاغـەز ـ بە نووکی قـەڵەم مـوو ئەو حاڵەتەم کێشاوە و ئەوجار ئیتر نەققاشیەکەم نەدڕاند.

دوایە لە سـەر جـێگاکـەم هەسـتـام، ئارام چوومـە پەنای، پێـمـوابوو زینـدوە، زینـدوو بۆتـەوە، ئەوینـی من رووحـی دە جـەندەکی ناوە ـ بـەڵام لە نزیکەوە بۆنـی مـردوو، بۆنی مـردووی پواوم هەست پێکرد ـ لە سـەر لەشی کـرمی ورد تێک هـاڵابوون و دوو زەرگـەتـە لە دەوری ئەو لـە بەر رووناکی شـەم دا هەڵدەفـڕین ـ ئەو هـەر بە تـەواوی مـردبوو بەڵام بۆچی، چلۆن چاوەکانی کرانەوە؟ نازانم. ئایا بە خەیاڵ دیتبووم، ئایا بە راستی بوو.

نامەوێ کەس ئەم پرسیارەم لێبکا، بەڵام کاری سەرەکی، سیمای ئەو ـ نا، چاوەکانی بوون و هەنووکە ئەو چاوانەم هەبوون، رووحی چاوەکانیم لە سـەر کـاغـەز هـەبوو ولەشی ئـیـتـر بە کـەلکم نەدەهات، ئەو لەشـەی کـە مەحکووم بە فەوتان و خۆراکی کرمەکان و جرجەمشکان بوو! ئێستا لەوە بـەدوا ئەو لـە دەست مـن دا بوو، نـەک من لـە ژێر فـەرمـانـی ئەو دا. هـەر کـاتێک ویسـتـبـام دەمـتـوانی چاوەکـانی ببـینم ـ نەقـقـاشـیـەکـەم زۆر بە پارێزەوە برد و دە چەلەنگی خۆم نا کە لە جیات داخڵە بوو و لە خـەڵوەتی دا شاردمەوە.

شـەو لە سـەر پەنجـەی پێـیـان دەرۆیشت. گـۆیا بـە رادەی پێـویـست حەسابۆوە، دەنگ گەلێکی دوورەدەست و کز دەبیسرا، لەوانەیە مـەلێک یا باڵدارێکی رێبوار خـەونی دەدیت، لەوانەیە گیـایەکـان هەڵیـان دەدا ـ لەم کاتە دا ئەستێرە کەم سۆماکان لە پشت هەورەکان دا ون دەبوون. لە سەر رووم پشـووی نەرمی بـەیانیم هەست پێدەکرد و هەر لـەو کاتە دا قـووقـەی کەڵەباب لە دوورەوە بەرز بۆوە.

ئاخۆ دەمـتوانی چ لە مـردووی ئەو بکەم؟ مردوویەک کە لـەشی خەریکی لێک بـڵاو بوون بوو! لە پێـشـدا وام بـە مـێـشـک داهات کـە لە ژووری خـۆم چاڵی کەم، دوایە بیرم کردەوە کـە ئەو ببەمە دەرێ و لە چاڵاوێکی باوێم، لە چاڵاوێک کە گوڵی لاولاوی کەوی لە دەورووبەری رواون ـ بەڵام هەمووی ئەو کـارانە بـۆ ئەوەی کـە کـەسـێک نـەتبـینێ چـەندە بیـر، چەنـدە زەحـمـەت و





لێهاتوویی پێویست بوو! جگە لەوە نەمدەویست چاوی بیانی پێی بکەوێ، هەموو ئەم کارانەم دەبا بە تەنێ و بە دەستی خۆم جێبەجێ کردبا ـ ئەمن چش، ژیانی من دوای ئەو ئیتر بە کەلکی چ دێ؟ بەڵام ئەو، قەت، قەت، هیچکەس لە خەڵکی ئاسایی، هیچکەس جگە لە من نەدەبا چاوی بە مردووی ئەو کەوتبا ـ ئەو هاتبوو لە دیوی من، لەشی سارد و سێبەرەکەی تەسلیمی من کرد بۆ ئەوەی بە نیگای بیانی ئالوودە نەبێ ـ لە ئاکام بیرێکم بە مێشک گەیشت: ئەگەر لەشی ئەوم لەت لەت کردبا و لە چەمەدان، هەر لەو چەمەدانە کۆنەی خۆم نابا و دەگەڵ خۆم بردبامە دەرێ ـ دوور، زۆر دوور لە چاوی خەڵک ئەوم چاڵ دەکرد.

ئەوجار ئیتر شکم نەکرد، کێردێکی دەسک نێرۆیی کە لە خەڵوەتی دا هەمبوو هێنام و زۆر بە وردی لە پێشدا جلێکی رەشی تەنک کە وەک تۆڕی جاڵجاڵۆکە ئەوی لە نێو خۆی دا تەنیبوو ـ تەنیا شتێک کە لەشی داپۆشیبوو دامدڕاند ـ دەتکوت بەژنی هەڵیدابوو چونکە درێژتر لە پێشوو دەهاتە بەر چاوم، دوایە سەریم بڕی ـ پەڵە خوێنی دەڵەمەی سارد بۆوە لە گەرووی هاتە دەر، دوایە دەستەکان و لاقەکانیم بڕین و هەموو لەشیم بە ئەندامەکانیەوە بە ریز لە چەمەدان دا جێ کردەوە و جلەکەی ، هەر ئەو جلە رەشەم بە سەری دا کێشا، چەمەدانم هەڵگرت هەڵمسەنگاند، قورس بوو، قەت ئەوەندە هەستم بە ماندوویی لە خۆم دا نەکردبوو ـ نا قەت نەمدەتوانی بە تەنێ چەمەدانەکە دەگەڵ خۆم بەرم.

هەوا دیسان هەور بوو و خوناوکەیەک دەستی پێکردبوو. لە ژوورەکەم چوومە دەرێ بەشکەم کەسێک بدۆزمەوە کە چەمەدانەکەم دەگەڵ هەڵگرێ ـ لەو دەوروبەرانە چ بەدی نەدەکرا، هەندێک دوورتر کە خورد بوومەوە لە پشت مژەوە پیرەمێردێکی کووڕم دیت لە ژێر داری سەوڵ دانیشتبوو. رووی کە بە شاڵگەردنێکی پان داپۆشیبوو نەدەدیترا ـ ئارام لێی نزیک بوومەوە. هێشتا هیچم نەکوتبوو، پیرەمێرد ویشک و کرێت پێکەنی وەها کە مچوڕکم پێدا هات و کوتی:

« ـ ئەگەر باربەرت دەوێ من خۆم حازرم ها ـ کالیسکەیەکی





مەیتبەریشم هەیە ـ من هەموو رۆژێ مردوەکان دەبەمە شاعەبدولعەزیم و دەیاننێژم، من تابووتیش ساز دەکەم، بۆ ئەندازەی هەر کەسێک تابووتم هەیە وەها کە بە قەرا خۆی بێ، من خۆم حازرم، هەر ئێستا!... »

قاقا پێکەنی وەها کە شان و پیلی دەلەرزین. من دەستم بۆ لای ماڵ راداشت بەڵام ئەو مەودای قسە کردنی پێنەدام و کوتی:

« ـ پێویست ناکا، من ماڵەکەت دەزانم، هەر ئێستا ها.»

لە سەر جێگاکەی هەستا. من گەرامەوە ماڵ، چوومە ژووری و چەمەدانی مردووم بە کێشەکێش هەتا بەر دەرگە هێنا. دیتم کالیسکەیەکی مەیتبەری شڕ و کۆن لە بەر دەرگایە کە دوو ئەسپی رەشی لاوازی لێ بەسترابوو ـ پیرەمێردی کووڕ لە سەرێ دانیشتبوو و قەمچییەکی درێژی بە دەستەوە بوو، بەڵام ئاوڕی نەداوە کە بمبینێ ـ چەمەدانم بە زەحمەت لە نێو کالیسکە نا کە لە ژووری دا شوێنێکی تایبەتی بۆ تابووت هەبوو. خۆشم چوومە سەر لە سەر جێی تابووت درێژ بووم و سەرم لە سەر لێواری دانا هەتا بتوانم دەورووبەرم ببینم ـ دوایە چەمەدانم کێشا سەر سینگم و بە هەر دووک دەستم توند رامگرت.

قەمچی شەقەی هات، ئەسپەکان بە هانکەهانک وەڕێ کەوتن، لە تفنکیان هاڵاوی هەناسەیان وەک ئەستوونی دووکەڵ لە هەوای بارانی دا دەهاتە بەر چاو و درێژ و نەرم غاریان دەدا ـ دەستە لاوازەکانیان وەک دزێک کە بە پێی قانوون قامکەکانیان بڕیوەتەوە و لە رۆنی قاڵیان ناوە ئارام بەرز دەبوونەوە و بێدەنگ لە سەر زەوی دادەندران ـ زەنگی زەنگوڵەی ملیان لە هەوای شێدار دا بە ئاهەنگێکی تایبەتی دەزرینگاوە ـ چەشنێک هێمنایەتی بێ هۆ و ناگوتەنی سەرتاپێی منی داگرتبوو، جۆرێک کە بە جووڵەی کالیسکەی مەیتبەر گوێم نەدەبزووت ـ تەنیا هەستم بە قورسایی چەمەدان لە سەر سینگم دەکرد ـ مردووی ئەو، مەیتی ئەو، وەک ئەمە بوو کە هەمیشە ئەم قورساییەم لە سەر سینگ بوە. مژێکی خەست دەورووبەری جادەی داگرتبوو. کالیسکە بە هەشتاو و راحەتییەکی تایبەتی لە کێو و دەشت و رووبار تێدەپەڕی. دەورووبەرم دیمەنێکی نوێ و





بێــهـاوتـای لێ دیار بـوو کـە نە لـە خـەو و نـە لە بێـداری دا نەمــدیتـبــوو: کێوگەلی دابڕدابڕ، دارگەلی سـەیر و سەمـەرەی چەپۆک پێدادراو و تووک لێکراو لـە دوو لای جـادەوە دیار بوون کـە بە نێوانیـان دا مـاڵەکـانی بۆری سێ سـووچ و مـوکـەعـەب و مـەنشـوور بە پەنجـەرەی کورت و تـاریکی بێ شووشـەوە دەدیتـران ـ ئەم پەنجەرانە وەک چاوی دەخێڵـەوە چووی کەسێک دەچوون کە یاو و ورێنەی هەبێ. نازانم دیوارەکان چیان پێبوو کە سـەرما و سـۆڵیــان هەتا دڵی ئینســان دەگـواســتـەوە. وەک ئەمـە بـوو کـە قـەت گیانداریکی زیندوو نەیدەتوانی لەو ماڵانە دا بژی، لە وانەیە ئەم مـاڵانە بۆ سێبەری گیاندارانی ئاسمانی ساز کرابوون.

دەتکوت کالیسکەچی منی بە جادەی تـایبـەتی یا بە لاڕێ دا دەبرد، لە هەندێک جێ تەنیـا کـۆلکەداری بڕاو و دارە خـوار و خـێـچــەکـان دەوری جــادەیان گــرتبــوو و لە پشت وان مــاڵە نەوی و بـەرزەکــان بە شـکڵــە هەندەسـییـەکانی قـووچ (مـەخرووتی)، قـووچی کـووڕ بە پەنجـەرە باریک و خوارەکانیەوە دەدیتران کە گوڵە لاولاوی کەوی ڕەنگیان لێهاتبوە دەر کە بـە دار و دیـوار دا هـەڵدەڕووسـکـان. ئـەم دیمەنـە لـەپڕ لـە پشت مــــژێکی خـەست دا ون بوو ـ هەورە قـورسە ئـاوسەکـان ترۆپکی کێوەکانیان وەخۆ گـرتبـوو و خـوناوەی باران وەک تۆز و خـۆڵی ئاوارە و هـەڵوەدا لە هەوا دا بڵاو ببوون ـ دوای ئەمە کە گەلێک ڕۆیشتین نزیک کێوێکی بەرزی بێ ئاو و گیـا کالیسکەی مەیتبەر ڕایگرت و من چەمـەدانم لە سـەر سینگم خزاند و هەستام.

پشـت کـێـو شـوێنێکی چۆل، ئارام و خـۆش بوو، جـێـیــەک کـە قـەت نەمدیبوو و نەمدەناسی بەڵام ئاشنا هاتە بەر چاوم دەتکوت لە خەیاڵی من بە دەر نەبوو ـ سـەر زەوی بـە پنچکی لاولاوی شـینی بێ بۆن داپۆشـرابوو، وا دەهـاتە بـەر چاو کـە هەتا ئێـسـتــا کـەس پێی لـەم شـوێنە نـەناوە ـ من چەمـەدانم لـە سـەر زەوی دانا، پیـرەمـێـردی کـالیـسکـەچی ئاوڕی داوە و کوتی:

ــ ئێرە نزیک شـاعەبدولعەزیمە، جێیەکی لەمـە باشترت وەگیر ناکەوێ،





پەپوو لێی دەخوێنێ ها!...

من دەستم دە گیرفانم نا هەتا کرێی کالیسکەچی بدەم، دوو قڕان و یەک عەبباسی پتر دە گیرفانم دا نەبوو. کالیسکەچی ویشک و کرێت پێکەنی وکوتی:

« ــ شایەنی نیە، دوایە وەری دەگرم. ماڵەکەت دەزانم، ئیتر کارت بە من نیە ها؟ ئەوەندەی بزانە کە لە قەبر هەڵکەندن دا ناشارەزا نیم ها؟ شەرمی پێ ناوێ بڕۆین هەر لێرە نزیک چۆم لە کن داری سەوڵ چاڵێکی بە قەرا چەمەدانەکەت بۆ هەڵدەکەنم و دەڕۆم. »

پیرەمێرد وەها گورج لە سەر جێگەی خۆی بازدی دا کە من نەمدەتوانی بیریشی لێبکەمەوە. من چەمەدانەکەم هەڵگرت و دوو بە دوو چووینە کن کۆتەرەدارێک کە لە پەنای ویشکەچۆمێک بوو ئەو کوتی:

ــ ئێرە باشە؟

بێ ئەوەی چاوەڕوانی وڵامم بێ بە بێڵچە و پاچێک کە پێی بوو دەستی بە هەڵکەندن کرد. من چەمەدانەکەم لە سەر زەوی دانا و لە سەر جێی خۆم مات وەستابووم. پیرەمێرد بە پشتی چەماو و بە دەستوبردی کەسێکی کۆنەکار خەریک بوو. لە هەڵکەندن دا شتێکی وەک گۆزەی دیتەوە، ئەوی لە دەسرۆکەیەکی چڵکن پێچاوە، هەستاوە و کوتی:

ــ « ئەمەش چاڵ ها! دروست بە قەرا چەمەدانەکەیە، پڕ بە خۆیەتی ها! »

من دەستم دە گیرفانم نا کە حەقدەستەکەی بدەمێ. دوو قڕان و یەک عەبباسیم پتر پێنەبوو، پیرەمێرد ویشک و کرێت پێکەنی و کوتی:

« ــ نایەوێ، شایەنی نیە. من ماڵەکەت دەزانم ـ ئەوجار لە جیات حەقدەستەکەم من گۆزەیەکم دیتەوە، گوڵدانێکی راغە، هی شاری کۆنی رەیە ها! »

دوایە بە قەڵافەتی کووڕ و چەماوی پێدەکەنی! وەها کە شانی دەلەرزاوە. گۆزەکەی کە لە دەسرۆکەیەکی چڵکنەوە پێچابوو لە بن هەنگڵ نا و بۆ لای کالیسکە چوو و گورج لە سەر جێی خۆی دانیشت. قەمچی





شەقەی هات، ئەسپەکان بە هانکەهانک وەڕێ کەوتن، زەنگی زەنگوڵەی ملیان لە هەوای شێدار دا بە ئاهەنگێکی تایبەتی دەزرینگاوە و، وردە وردە لە پشت کۆگای مژ لە بەر چاوم ون بوون.

هەر کە بە تەنیا مامەوە هەناسەیەکی راحەتم هەڵکێشا، وەک ئەوە بوو کە بارێکی قورس لە سەر سینگم هەڵگیرا و ئۆخژنێک هەموو گیانی داگرتم ـ دەوروبەری خۆم چاو لێکرد: ئێرە شوێنێکی چووک بوو کە دە نێوان گرد و کێوی کەوی رەنگ دا گیری خواردبوو. لە سەر زنجیرە کێوێک ماڵ و خانووبەرەی کۆن بە خشتی ئەستوور و چۆمێکی ویشک لەو نزیکانە دەدیترا ـ من لە قووڵایی دڵەوە خۆشحاڵ بووم و لە بەر خۆم بیرم کردەوە کە ئەو چاوە درشتانە کاتێک لە خەوی زەمینی هەستنەوە شوێنێکی شایەنی بۆ شکڵ و نموودی دەدیتەوە جگە لەوە دەبا کە دوور لە خەڵکی دیکە، بە دوور لە مردووی هی دی بێ هەر ئەو جۆرەی کە لە ژیانی دا دوور لە ژیانی خەڵکی دی بوو.

چەمەدانەکەم بە ئەسپایی هەڵگرت و دە نێو چاڵم نا ـ چاڵەکە دروست بە قەرا چەمەدانەکە بوو ـ بەڵام بۆ دوایین جار ویستم تەنیا جارێکی دی چاو لە چەمەدانەکە بکەمەوە. دەوروبەرم چاو لێکرد کەس بە دیارەوە نەبوو، کلیلم لە گیرفانم دەرهێنا و چەمەدانەکەم کردەوە ـ بەڵام کاتێک سووچی جلی رەشی ئەوم لادا لە نێوان خوێنی دەڵەمە و کرمگەلێک کە تێک گلابوون دوو چاوی درشتی رەشم دیت کە بێ حاڵەت زەق منیان دەڕوانی و ژیانی من لە بن ئەم چاوانە دا نوقم ببوو. دەستبەجێ چەمەدانەکەم بەستەوە و خۆڵم بە سەر داکرد و دوایە بە پێ شێلام، چووم پەلە لاولاوی کەوی بێ بۆنم هێنا و لە سەر خاکەکەی چەقاندم، دوایە گاشەبەرد و خیزم هێنا و لە سەریم بڵاو کردەوە هەتا شوێنی قەبر نەمێنێ بە چەشنێک کە کەس نەتوانێ لێکی بکاتەوە. وەها رێکوپێک ئەم کارەم کرد کە خۆشم نەمتوانی قەبر و زەوی لێک بکەمەوە.

کارەکەم کە تەواو بوو چاوێکم لە خۆم کرد، دیتم جلەکەم خۆڵاوی، دڕاو و پەڵەخوێنی رەشی پێوە نووساوە، دوو زەرگەتە لە دەورم دەفڕین و





کرمگەلێکی چووکم پێوە نووسابوون کە تێک دەهالان ـ ویستم پەڵەخوێنی سەر ئاتەگی جلەکەم بسڕمەوە بەڵام هەرچی سەردەستەکم بە تف تەڕ دەکرد و پێمدا دەهێنا پەڵەخوێن خراپتر بڵاو دەبۆوە و خەستتر دەبوو، وەها کە هەموو لەشی داگرتم و هەستم بە سەرمای لیچقی خوێن لە سەر لەشم کرد.

نزیک تاوپەڕ بوو، خوناوەی دەکرد، من لە خۆوە شوێن کالیسکەی مەیتبەرم هەڵگرت و وەڕێ کەوتم. هەر کە هەوا تاریک بوو جێ شوێنی کالیسکەی مەیتبەرم ون کرد، بێ ئامانج، بێ هیچ بیرێک و لە خۆوە لە تاریکی زەنگ و خەست دا ئارام ڕێگام دەبڕی و نەمدەزانی دەگەمە کوێ چونکە دوای ئەو، دوای ئەمە کە ئەو چاوە درشتانەم لە نێو خوێنی دەڵمە دا دیت، لە شەوێکی تاریک دا، لە شەوێکی بێبن دا کە سەراسەری ژیانی منی داگرتبوو ڕێگام دەبڕی، چونکە دوو چاوێک کە وەک چرای ئەو بوون بۆ هەمیشە کووژا بوونەوە و ئاوا بۆم وەک یەک بوو کە بگەمە جێ و شوێنێک یا هەر نەگەمێ.

بێدەنگییەکی تەواو دەستەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو، وام بە مێشک داهات کە هەموو بە جێیان هێشتووم، پەنام بردە بەر بوونەوەرانی بێگیان. پەیوەندییەک دە نێوان من و ڕەوتی سروشت، دە نێوان من و تاریکییەکی بێبن کە لە رووحی من دا داگەڕابوو، پێکهاتبوو ـ ئەم بێدەنگییە جۆرە زمانێکە کە ئێمە تێیناگەین. لە خۆشیان سەرم دەگێژەوە دەهات، ڕشامەوە و پێیەکانم سست بوون. هەستم بە ماندوویەکی نەبڕاوە لە خۆ دا دەکرد، چووم لە قەبرستانی پەنا جادە لە سەر بەردی قەبرێک دانیشتم، سەرم دە نێو دوو دەستم نا و لە حاڵی خۆم سەرم سوڕما بوو ـ لەپڕ دەنگی کەنینێکی ویشک و کرێت وەخۆی هێنامەوە، رووم وەرگێڕاوە دیتم قەڵافەتێک کە سەر و رووی بە شاڵ داپێچابوو لە پەنام دانیشتبوو و شتێکی دە دەسرە پێچراوی دە بن هەنگڵ نابوو، رووی دە من کرد و کوتی:

« ــ بێ شک دەتەویست بچی بۆ شار، ڕێگات ون کردوە ها؟ لەوانەیە





به خۆت بڵێی لەو شەوە دا لە قەبرستان چ دەکەم ـ بەڵام مەترسێ، سەر و کاری من دەگەڵ مردوانە، پیشەم قەبر هەڵکەندنە، کارێکی خراپ نیە ها؟ من هەمــوو کـون و کـاژێری ئێـرە دەزانم ـ بۆ وێنـە ئەمـڕۆ چووم قــەبرێک هەڵبکەنم ئەم گوڵدانە لە ژێر گڵ هــاتە دەرێ، دەزانی گوڵدانـی راغە، هی شـاری کـۆنی « رەی » ە ها؟ شـایەنی نیـە، من ئەم گۆزەیـە دەدەم بە تۆ بە یادگاری لە لات بێ. »

من دەسـتم دە گـیـرفـانم نـا دوو قـڕان و یـەک عـەبـبـاسـیم دەرهێنا، پیرەمێرد بە کەنینێکی ویشک و کرێتەوە کوتی:

« ـ نـابێ، شـایـەنی نیـە، من تۆ دەنـاسم. مـاڵەکـەت دەزانم ـ هـەر لەو پەنایەی کـالیسکەیەکی مـەیتبـەرم پێیە وەرە تۆ بگەیەنمەوە مـاڵێ ها ـ هەر دوو هەنگاوە. »

گـۆزەکـەی دە کـۆشـم هـاویشت و هەسـتـا ـ لە بەر پێکەنـین شـانەکـانی دەلەرزانەوە، من گۆزەکەم هەڵگرت و وە دوای تارمـایی چەماوی پیرەمێرد کـەوتم. لە سـەر پێچی جادە کالیسکەیـەکی مەیتبـەری شڕ و کۆن بە دوو ئەسـپی رەشی لاواز وێسـتـا بوو ـ پیـرەمـێـرد گـورج وە سـەر کـەوت و دانیشت، منیش چوومـە نێو کـالیسکە لە سـەر جـێیـەکی تایبـەتی کە بۆ تابووت سـاز کرابوو درێژ بووم و سـەرم لە سـەر لێواری بڵـیندی دانا هەتا دەوروبەرم باشتر ببینم، گۆزەم لە سەر سینگم دانا و بە دەست رامگرت.

قەمچی شەقەی لێهات، ئەسپەکان بە هانکەهـانک وەڕێ کەوتن، درێژ و نەرم غـاریـان دەدا، پێیـان ئـارام و بێدەنگ لە سـەر زەوی دادەنا، زەنگی زەنگوڵەی ملیـان لە هەوای شـێدار دا بـە ئاهەنگێکی تایبـەتی دەزرینگاوە ـ لە پشـت هەور ئەسـتێـرەکـان وەک گلێنەی چاوگـەلێکی گـەش کـە لە نێـو خوێنی دەڵەمەی رەش هاتبنە دەر چاویان لە سـەر زەوی دەکرد ـ ئۆخژنێک هەمـوو گیـانـی داگرتم، تەنیـا گـوڵدان وەک قـورسـایی مـەیتی مـردوو سـەر سـینگمی رێک دەکــوشی ـ دارە تێک چڕژاوەکــان بە لقــە خــوار و خێچـەکانیانەوە وەک ئـەوە دەچوون کە لە تاریکایی دا لە ترسی ئەمـە کە نەکـا بخـزێن و بکەونە زەوی، دەسـتی یەکـتریان گرتبوو. خـانوو سـەیر و





سەمەرەکان بە شکڵەکانی دابڕی هەندەسی بە پەنجەرەگەلی بۆش و رەش لە پەنا جادە ریزیان بەستبوو، بەڵام دیواری ئەم ماڵانە وەک کرمی گوڵ ئەستێرە شۆقێکی کز و ناخۆشیان لێدەبۆوە، دارەکان بە ترسەوە دەستە دەستــە، ریز بە ریز، تێدەپەڕین و بە دوای یەک دا هەڵدەهاتن بەڵام وا دەهاتنە بەر چاو کە لاسکی لاولاوەکان لە پێیان دەهاڵان و دەکەوتن. بۆنی مردوو، بۆنی گۆشتی رزیو هەموو گیانی داگرتبووم دەتکوت بۆنی مردوو بۆ هەمیشە چووبوە نێو گیانی منەوە و من هەموو تەمەنم لە تابووتێکی رەش دا خەوتووم و پیرەپیاوێکی کووڕ کە روویم نەدەدیت منی بە نێو مژ و سێبەرە تێپەڕەکان دا دەگێڕا.

کالیسکەی مەیتبەر وێستا، من گۆزەم هەڵگرت و لە کالیسکە دابەزیم. لە بەر دەرگای ماڵەکەم بووم، بە پەلە وەژوور کەوتم. گۆزەکەم لە سەر مێز دانا چووم چەلەنگەکەم، هەر ئەو چەلەنگەی کە جیات داخڵە بوو و لە خەڵوەتی ژوورەکەم دا شاردبوومەوە، هەڵگرت و هاتمەوە بەر دەرکە کە لە جیات مز چەلەنگەکە بدەم بە پیرەمێردی کالیسکەچی، بەڵام ئەو ون ببوو و ئاسەوارێک لە ئەو و کالیسکەکەی نەمابوو ـ دیسان ناهومێد گەڕامەوە ژوورەکەم، چراکەم هەڵکرد، گۆزەم لە نێو دەسرە دەرهێنا، خۆڵی سەریم بە سەردەستم سڕێوە، گۆزە رووکێشێکی بەنەوشی روونی قەدیمی هەبوو کە وەک رەنگی زەرگەتەی وردکراوەی لێهاتبوو و لایەکی بە شکڵی لەوزی پەڕاوێزێکی لە لاولاوی کەوی رەنگ هەبوو و لە نێو ئەو دا ...

لە نێو پەڕاوێزی لەوزی دا سیمای ئەو... روخساری ژنێک کێشرا بۆوە کە چاوەکانی رەشی درشت، چاوگەلێکی لە رادە بەدەر درشت، چاوگەلێکی لۆمەکەری هەبوو، وەک ئەمە کە گوناهگەلێکی نەبەخشراوەم کردبێ کە خۆم نەمزانیبێ. چاوگەلێکی جادوویی کە هاوکات نیگەران و واقورماو، هەڕەشەکەر و بەڵێنیدەری هەبوو. ئەم چاوانە بە سام و راکێشەر بوون و شۆقێکی نائاسایی مەستێنەر لە بنی ئەوان دا دەدرەوشانەوە، کولمەکانی زەق، نێوچەوانی پان، برۆکانی باریک و سێبەنگی، لێوەکانی گۆشتن و نیوە ئاوەڵە و پرچێکی ئاڵۆزی هەبوو کە





لۆیەکی بە لاجانگیەوە نووسا بوو.

وێنەیەک کە دوێشــەو لە رووی ئەو کێشـابوومـەوە لە نێـو چەلەنگەکـە دەرمــهێنا، لە بەرانبـەر یـەکم نان، دەگـەڵ نەقـقـاشـی گـۆزەکـە تۆزقـاڵێک جیاوازیان نەبوو، دەتکوت وێنەی یەکترن ـ هەر دووکیان یەک و هەر کاری یەک نەقـقـاشـی بەدبەخـتـی ســەر قـەڵەمــدان سـاز بوو ـ لەوانـەیە رووحـی نەققاشـی سـەر گۆزەکە لە کاتی کێشانەوە دا هاتبوە نێو لەشی منەوە و دەسـتـی من بە ویسـتی ئەو گەڕابووبێ. نەدەکرا ئەوان لێک بکەیەوە تەنیا نەقـقـاشـی من لە سـەر کـاغـەز بوو، لە حـاڵێک دا نـەققـاشـی سـەر گـۆزە رووکێشێکی روونی کۆنی هەبوو کە رووحێکی بە رەمز، رووحێکی غەریبی نـائـاســــایـی بـەم وێنـە دابـوو و پریشـکـی رووحـــێکی دڕ لـە بن چـاوی دەدرەوشـاوە ـ نا، جێی باوەڕ نەبوو، هەمـان چاوگەلی درشـتـی بێ سـەرنج، هەمـان قـیـافـەی مـەند و لە هەمـان کـات دا ئـازاد ـ کـەس نـاتوانێ بزانێ چ هەسـتـێکم تێـدا پێکـهات. دەمـەویسـت لە دەست خـۆم راکەم ـ ئـایا وەها رێکەوتێک دەگـونجـا؟ تەواوی چەرمـەسـەریەکـانی ژیانم هـاتنەوە بەر چاو ـ ئایا تەنیا چاوەکـانی کەسێک لە ژیانم دا بۆم بەس نەبوو! ئێسـتا دووکەس هەر بەم چـاوانەوە، چاوگـەلێک کـە هی ئەو بوون و چـاویان لە من دەکـرد! نا، بێ شـک نەدەگـونجـا ـ چاوێک کـە خـۆی لەوێ نزێک کـێـو لە کن داری سـەوڵ، لە پەنا چۆمی ویشک ناشـتراوە. لە بن گوڵەکانی لاولاوی کەوی، لە نێـو خـوێنی خـەست، لە نـێـو کرم و خـەزۆک و گـیـاندارانێک کە لە دەورەی جـێـژنیـان گرتوە و ریشـەی گـیـایەکـان بەم زوانە دەچوونە نێـو گلێنەی کە شیرەی بمژن ئێستا بە ژیانێکی پڕهێز و لێوڕێژەوە دەڕوانێتە من!

من هـەتا ئەم رادەیە خـۆم بەدبەخت و تووک لـێکراو شک نەدەبرد، بەڵام لە بەر هـەسـتی جەنایەتێک کە لـە من دا شاراوە بوو، هـاوکات خـۆشـیـیـەکی بێ هۆ، خۆشییەکی غەریبم تێدا بەدی هات ـ چون تێگەیشتم کە کەسێکی هـاودەردی کۆنم هـەبوە ـ ئـایا ئەم نەققـاشـە کۆنە، نەققاشـێک کە سـەر ئەو گـۆزەی ســەدان لەوانـەیە  هـەزاران ســاڵ لەمــەوبەر نـەقـقـاشـی کـردبوو هـاودەردی من نـەبوو؟ ئـایا هـەر ئەم دونـیـایـەی منی تێـپـەڕ نەکـردوە؟ هەتا





×××

له دونیایەکی نوێ کە وەئاگا هاتبوومەوە شوێن و چلۆنایەتی وێ بە تەواوی بۆ من ئاشنا و نزیک بوو، بە چەشنێک کە پتر لە ژیان و شوێنی پێشووی خۆم دەگەڵی نزیکایەتیم هەبوو ـ دەتکوت رەنگدانەوەی ژیانی راستەقینەی من بوو ـ دونیایەکی دیکە، بەڵام ئەوەندە لێم نزیک و پەیوەندی بە منەوە هەبوو کە پێموابوو گەراومەتەوە شوێنی بنەڕەتی خۆم ـ لە دونیایەکی کۆن بەڵام هاوکات نزیکتر و سروشتیتر لە دایک ببووم.

هێشتا بوولێڵ بوو. پیسۆزێک لە سەر تاقەی ژوورەکەم دایسا، نوێنیش لە سووچێکی دیوەکە راخرابوو، بەڵام من بەخەبەر بووم، هەستم دەکرد کە لەشم داغە و پەڵە خوێنەکان بە عەبا و شاڵگەردنمەوە نووسا بوون، دەستەکانم خوێناوی بوون. بەڵام سەرەڕای یاو و سەرەگێژە جۆرێک دڵەکوتە و نائارامییەکی تایبەت لە من دا پێکهاتبوو کە بە هێزتر لە بیری سڕینەوەی پەڵەی خوێن بوو، بەهێزتر لەوە بوو کە داروغە بێ و من دەردەست کا ـ هەروەتر لە مێژ بوو کە چاوەڕێ بووم وەگیر داروغە کەوم. بەڵام تەمام گرتبوو کە بەر لە دەردەست بوونم پیاڵەیەک شەرابی ژەهراوی





که له سـەر رفه بوو یەکپشوو بخۆمـەوه ـ ئەمه پێداویسـتی نووسین بوو که بۆم ببـوو بـه ئەرکـێکی زۆریـی، دەمــەویست ئـەم دێوەی کــه لە مــێــژ بوو ئەندەرروونی منی ئەشکەنجه دەکرد دەرکێشمه دەرەوە، دەمەویست دڵپڕیی خۆم بێنمه سەر کاغەز ـ له ئاکام دوای هەندێک رامان پیسۆزکەم کێشا پێش خۆم وئاوام دەست پێکرد: ــ





×××

من هەمیشە پێمابوو کە بێدەنگی باشترین شتە، پێمابوو کە باشترە مرۆڤ وەک شاهۆ لە کن دەریا باڵ و پەڕی پان بکاتەوە و تەنیا هەڵنیشێ ـ بەڵام ئێستا ئیتر بە دەست خۆم نەبوو چونکە ئەوەی کە نەدەبا بووبا، بوو ـ کێ دەزانێ، لەوانەیە هەنووکە یا ساعەتێکی دیکە تاقمێک گەزمەی مەست بۆ دەردەست کردنم بێن ـ من چ پێمخۆش نیە کە جەندەکی خۆم رزگار بکەم، جگە لەوە جێی حاشاش نەماوە؛ گریمان پەڵە خوێنەکانیش بسڕمەوە بەڵام بەر لەوەی کە وە چنگ وان بکەوم پیاڵەیەک لەو قاپە شەرابە، لە شەرابی بە میرات براوی خۆم، کە لە سەر رفەکەم داناوە دەخۆمەوە.

ئێستا دەمەوێ سەراسەری ژیانی خۆم وەک هێشوو ترێ لە دەستم دا رێک کوشم و شیلەی ئەو، نا، شەرابی ئەو، دڵۆپ دڵۆپ وەک ئاوێکی پاک لە گەرووی ویشکی سێبەرەکەم بکەم. بەڵام دەمەوێ بەر لەوەی کە بڕۆم ئەو ئێشانەی کە وردە وردە وەک خۆرە یا ناسۆر منیان لە سووچی ئەم دیوە خواردوە بێنمە سەر کاغەز ـ . چونکە بەم جۆرە باشتر دەتوانم بیر





و مێـشکم ڕێکوپێک بکەم ـ ئایا مـەبەسـتم نووسـینی وەسـیـەتنامـەیە؟ هەرگیز، چونکە نە ماڵم هەیە کە دێو بیخوا و نە دینم هەیە کە شەیتان بیبا، ئەمجار چ شتێکی سەر رووی زەوی دەتوانێ چووکترین بایەخی بۆ من هەبێ. ــ ئەوەی کە ژیان بوو لە کیسم داوە، هێشتم و ویستم کە لە کیسم بچێ و دوای ئەوەکە من ڕۆیشتم، بە جەهەننەم، کەسێک دەیەوێ کوتە کاغەزەکانم بخوێنێتەوە، دەیەوێ هەر قەت نەیخوێنێتەوە ـ من تەنیا لە بەر پێویستی بە نووسین کە نووکە بۆم گرینگ بوە دەنووسم ـ من پێویستمە، پتر لە جاران پێویستیم بەوە هەیە کە بیرەکانی خۆم بە بوونەوەری خەیاڵی خۆم ، بە سێبەری خۆم بلکێنم ـ ئەم سێبەرە شوومەی کە لە بەر شۆقی پیسۆز لە سەر دیوار چەماوەتەوە وەک ئەوەیە کە هەرچی دەینووسم بە وردی دەیخوێنێتەوە و هەڵیدەلووشێ ـ ئەم سێبەرە بێ شک لە من باشتر تێدەگا! تەنیا دەگەڵ سێبەری خۆم باش دەتوانم بدوێم، ئەوەکە بە زۆر من وە قسە دێنێ، تەنیا ئەو دەتوانێ من بناسێ، ئەو بێ شک تێدەگا... دەمەوێ شیلە، نا، شەرابی تاڵی ژیانی خۆم دڵۆپ دڵۆپ لە گەرووی ویشکی سێبەرەکەم بکەم و پێی بڵێم: « ئەمە ژیانی منە! »

هەر کەس دوێنێ منی دیوە، لاوێکی تێشکاو و لاوازی دیتوە بەڵام ئیمرۆ پیرەمێردێکی کوورِ دەبینێ کە مووی سپی، چاوی گل و لێوی کەتی هەیە. من دەترسێم کە لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە بڕوانمە دەرێ، لە ئاوێنە دا چاو لە خۆم بکەم. چونکە لە هەموو جێیەک نسێ دووپاتکراوەکانی خۆم دەبینم ـ بەڵام بۆ ئەوەی کە ژیانی خۆم بۆ سێبەری چەماوی خۆم باس بکەم دەبێ حەکایەتێک بگێڕمەوە ـ ئاخ، چەندە حەکایەتگەلی سەردەمی منداڵی، لە مەرِ ئەوین، نزیکی ژن و پیاو، شایی و مەرگ دا هەن و هیچکام ڕاست نین ـ من لە چیرۆک و قسەی نەستەق ماندوو بووم.

من تێدەکۆشم کە ئەم هێشوویە ڕێک بکوشم بەڵام لەو دا بچووکترین شوێنەوارێک لە ڕاستەقینە دەبێ یا نا ـ ئەمە ئیتر نازانم ـ من نازانم لە کوێم و ئەم پەڵە ئاسمانەی بان سەرم، یا ئەم چەند بستە زەوییەی کە لە سەری دانیشتووم هی نەیشابوور یا بەلخ یا بەنارەسە ـ بە هەر حاڵ من





له هیچ شتێک دڵنیا نیم.

من ئەوەندی شتی دژ بە یەک و قسەی جۆراوجۆرم بیستوە و ئەوەندە سۆمای چاوم بە سەر شتی جۆر بە جۆر دا سواوە ـ ئەم توێژە ناسک و سەختەی کە رووح لە پشت ئەو دا شاردراوەتەوە، ئێستا باوەڕ بە هیچ شتێک ناکەم ـ هەر ئێستاکەش شکم لە قورسایی و راوەستانی شتەکان، لە راستەقینەی روون و ئاشکرا هەیە. نازانم ئەگەر ئەنگوستم لە جۆنی بەردینی قونچکی حەوشەکەمان بدەم و لێی بپرسم: ئایا لە سەر جێی خۆت وەستاوی و پتەوی؟ ئەگەر وڵامی ئا بداتەوە قسەکەی باوەڕ بکەم یا نا.

ئایا من بوونەوەرێکی جیاواز و تایبەتیم؟ نازانم ـ بەڵام ئێستا کە روانیمە ئاوێنە خۆم نەناسیوە. نا، ئەو "من "ی پێشوو مردوە، پواوە بەڵام چ بەرگر و لەمپەرێک دە نێوان ئێمە دا نیە. دەبێ حەکایەتەکەی خۆم بگێڕمەوە بەڵام نازانم دەبێ لە کوێوە دەست پێبکەم ـ سەراسەری ژیان چیرۆک و حەکایەتە. دەبێ هێشووی ترێ رێک بکوشم شیلەی ئەو کەوچک کەوچک لە گەرووی ویشکی ئەم سێبەرە پیرە بکەم.

لە کوێوە دەست پێبکەم؟ چوونکە هەموو ئەم بیرانەی کە ئێستا لە کەللەم هەڵدەقوڵێن هی ئەم کاتەن، ساعەت و دەقیقە و رێکەوتی نیە ـ رووداوێکی دوێنێ لەوانەیە بۆ من کۆنتر و بێ کەلکتر لە رووداوێکی هەزار ساڵ لەمەوبەر بێ.

لەوانەیە لە بەر ئەمە کە هەموو پەیوەندیەکانی من دەگەڵ دونیای زیندووکان پچڕاوە، یادگارەکانی رابوردوو لە بەر چاوم ریز دەبن ـ رابوردوو، داهاتوو، ساعەت، رۆژ، مانگ و ساڵ بۆ من وەک یەکن. قۆناغەکانی جۆراوجۆری منداڵی و پیری بۆ من جگە لە قسەی پووچ شتێکی دیکە نیە، تەنیا بۆ خەڵکی ئاسایی، بۆ سپڵەکان ـ سپڵەکان پڕ بە زار ـ لەم وشەیە دەگەڕام، بۆ سپڵەکان کە ژیانی ئەوان جەنگە و کاتێکی دیاریکراوی هەیە، وەک وەرزەکانی ساڵ و لە ناوچەیەکی خۆش ئاو و هەوای ژیان هەڵکەوتبێ وایە. بەڵام ژیانی من هەمووی یەک وەرز و یەک





ڕەوتی هەبوە وەک ئەوەکە لە ناوچەیەکی سارد و سڕ و لە تاریکی هەرمان دا تێپەڕ بووبێ، لە حالێک دا دە نێو گیانم دا هەمیشە گرێک دایسێ و من وەک شەم دەتوێنێتەوە.

لە نێوان چوار دیوارێک کە ژووری من پێکدێنێ و شووورەیەکی لە دەوری ژین و بیری من کێشاوە، ژیانی من وەک شەم تک تک دەتوێتەوە، نا، هەڵە دەکەم ـ وەک کۆڵکەدارێکی تەڕە کە لە سووچێکی ئاورگ کەوتوە و بە ئاگری ئێزنگەکانی دیکە چزاوە و بۆتە بزووت، بەڵام نە سووتاوە و نە تەڕ و تازە ماوە، تەنیا بە چڕەدووکەڵی ئەوانی دیکە خنکاوە. دیوەکەم وەک هەموو دیوێک بە خشت و بەرد لە سەر وێرانەی هەزاران ماڵی کۆن ساز کراوە، دیواری سپی کراوە و پەڕاوێزی هەیە ـ دروست وەک قەبرە ـ چووکترین حاڵەت و کون و کەلێنی دیوەکەم بۆ من بەس بوو هەتا ساعەتگەلێکی درێژ بیرم بە خۆیەوە خەریک بکا، وەک جاڵجاڵۆکەی سووچی دیوار. چونکە لەو کاتەوە کە لە جێ دا کەوتووم کەمتر بە کارەکانم رادەگەن ـ گوڵمیخێک کە لە سەر دیوار داکوتراوە جێ لەلۆی من و خێزانم بوە، کەمێک خوارتر لە گوڵمیخ لە گێچی دیوار کوتێک کەوتوە و بۆنی شتەکان و بوونەوەرانێکی لێوە دێ کە پێشتر لەم دیوە بوون، وەها کە هەتا ئێستا هیچ هەوا و بایەک نەیتوانیوە ئەم بۆنە لاسار، تەوەزەل و خەستانە لێک بڵاوکاتەوە: بۆنی ئارەقەی لەش، بۆنی نەخۆشیە کۆنەکان، بۆ زار، بۆ پێ، بۆنی توندی میز، رۆنی بۆبا، حەسیری رزیو، هێلکە و رۆنی سووتاو، بۆنی رۆن و پیواز، بۆنی دێمکراوە، بۆ گەمار و بۆنی مارزای منداڵ، بۆنی دیوی کوڕێک کە تازە شەیتان پێی پێکەنیوە، ئەو هەڵمانەی کە لەکووچەوە هاتوون و بۆنە مردووەکان یا ئەو بۆنانەی لە حاڵی گیانەڵڵا دان، کە هێشتا هەمووی ئەوان زیندوون و نیشانی تایبەتی خۆیان راگرتوە. گەلێک بۆنی دیکەش هەن کە رەگەز و سەرچاوەیان دیار نیە بەڵام شوێنی خۆیان هێشتۆتەوە.

دیوەکە خەڵوەتییەکی تاریک و دوو دەربیجەی بەرەو دەرێ، بەرەو دونیای سپڵەکان هەیە. یەکێک لەوان روو بە حەساری خۆمان دەکرێتەوە





و ئەوی دی بەرەو کووچەیە ـ و لەوێوە من پەیوەندیم بە شاری **رەی**یەوە هەیە ـ شارێک کە ناوی بووکی دونیایان لێناوە و هەزاران کووچە و کۆڵان و خانووی چەپۆک پێدادراو و فێرگە و کاروانسەرای هەیە ـ شارێک کە بە گەورەترین شاری دونیا دێتە ژمار، لە پشت دیوی من هەناسە هەڵدەکێشێ و دەژی. لێرە لە سووچی دیوەکەم کاتێک کە چاوەکانم وێک دەنێم سێبەرە ون و تێکەڵەکانی شار: ئەوەی کە شوێنی لە سەر من داناوە بە کۆشکەکان، مزگەوتەکان و باغەکانی هەموو دێنە بەر چاوم.

ئەم دوو دەربیجە من بە دونیای دەرەوە، بە دونیای سپڵەکانەوە پەیوەند دەدەن. بەڵام لە دیوەکەم ئاوێنەیەک بە دیوارەوەیە کە سیمای خۆمی تێدا دەبینم و لە ژیانی تەنگەبەری من دا ئاوێنە گرینگتر لە دونیای سپڵەکانە کە چ پەیوەندیەکی بە منەوە نیە.

لە تەواوی دیمەنی شار دوکانی گۆشتفرۆشییەکی چووکە لە بەر دەربیجەی دیوەکەمە کە رۆژێ دوو مەڕان دەفرۆشێ ـ هەر جارەی کە لە دەربیجەوە چاو لە دەرێ دەکەم کابرای گۆشتفرۆش دەبینم، هەموو رۆژێ بەیانی زوو دوو بارگینی رەشی لاواز ـ ئەو بارگینانەی کە کۆخەی ویشکی قووڵ دەکەن و دەستە ویشک هەڵگەڕاوەکانیان بە سم کۆتایی هاتوە، دەڵێی بە پێی یاسایەکی دڕندانە دەستەکانیان بڕیونەوە و لە رۆنی قاڵیان ناون ، لە دوو لایان کەلاکی مەڕ هەڵواسراوە و دەیهێننە بەر دوکان. پیاوی گۆشتفرۆش دەستی چەوری بە ردێنی خەنەلێدراوی دا دێنێ، لە پێشدا بە چاوێکی کڕیارانە مەڕەکان هەڵدەسەنگێنێ، پاشان دوو دانەیان هەڵدەبژێرێ، دووگەکەیان بە دەست دەسەنگێنێ، دوایە دەیانبا و لە چنگاڵی دوکانەکەی هەڵیاندەواسێ ـ بارگینەکان بە هانکەهانک وەڕێ دەکەون. ئەودەم گۆشتفرۆش دەستی لاواندنەوە بە سەر ئەو کەلاکە خوێناویانە، بە سەری بڕاو، چاوی دەرپەڕاو و پێڵووی خوێناوی کە لە کەللەسەری بۆریانەوە دەرپەڕیوە دادێنێ، دەستیان تێوەر دەدا، دوایە کێردێکی دەسک نێرۆیی هەڵدەگرێ و کەلاکەکانیان شارەزایانە کوت کوت دەکا و بە بزەوە گۆشتی نەرمە بە کڕیارەکان دەفرۆشێ. تەواوی ئەم





کـارانەی بە چ کـەیفـێکەوە دەکـرد! من دڵنیـام جـۆرێک خـۆشی و کـەیفی دەکـرد ـ ئەو سـەگـە زەرد و مل ئەسـتـوورەی کـە گـەرەکـەکـەمـانی پاوان کردبوو و هەمیشە بە ملی کەچ و چاوی بێگوناهی نیگای بە حەسرەتی لە دەستی گۆشـتـفرۆش دەکرد، ئەو سـەگەش هەمـوو ئەوانەی دەزانی ـ ئەو سەگەش دەیزانی کە گۆشتفرۆش کەیفی بە پیشەی خۆی دێ!

هەندێک دوورتر لە ژێر تاقـێک، پیـرەمـێـردێکی سـەیر دانیـشـتـوە کـە خـوانـچـەیەک لـە بەرامـبـەری پان کـراوەتـەوە. لە سـەر خـوانـەکـەی داسـخـاڵەیـەک، دوو ناڵ، چەند جـۆر مـوورووی رەنگین، کـێـردێک، تـەڵە مـشکێک، گـازێکی ژەنگاوی، کـەوچکێک، شـانەیەکی دەنک شکاو، بێـڵـچـەیەک و گۆزەیەکی رووکـێشـداری دانابوو کـە دەسرەیەکی چڵکنی پێدادابوو. ساعەتگەل، رۆژگەل، مانگگەلێک من لە پشت دەربیجەوە چاوم لێکردوە، هەمیشـە بە شـاڵگەردنێکی چڵکن، عەبای شـووشتـەریی، بەرۆک ئاوەڵە کە مووی سپی سینگی لێهاتبوە دەر بە پێڵووی سـوورهەڵگەڕاو کە نەخـۆشـیـیـەکی لاسـار و بێحـەیا دەیخـوارد و بە ودمـێک کە لـە باسکی بەسـتبوو، بە یەک جۆر دانیشتوە. تەنیا شـەوانی هەینی بە ددانە زەرد و کەوتوەکانی قورئانی دەخوێندەوە ـ گۆیا لەم رێیەوە بژیوی خۆی وە دەست دەخـست، چون من هیـچکات نـەمـدیت کـەسـێک شـتـێکی لێـبکڕێ ـ وا وێدەچێ لەو خەونە ناخۆشـانەی کە دیومن زۆرتر سیمـای ئەو پیاوەی تێدا بوە. لـە پشت ئەم سـەرە خـڕ و تاشـراوەی کـە مـێـزەری ئامـاڵ زەردی لێـهاڵاندوە، لە پشت نێوچـەوانی کورتی ئەو چ بیـرێکی لاسار و گـەوجـانە وەک گیـابژار رواوە؟ گۆیا خوانچەی بەر پیرەمێرد و شڕ و شـاڵاتی سەری دەگـەڵ ژیانی ئەو پەیوەندییـەکی تایبـەتییـان هەیە. چەند جـار تەمـام گرت بڕۆم و قسەی دەگەڵ بکەم و یا شتێکی لێبکڕم بەڵام نەموێرا.

دایەنەکـەم پێیکوتم کـە ئەم پیـاوە لە جـەوانی دا گۆزەگـەر بوە و تـەنیا هەر ئەم گۆزەی بۆ خۆی راگرتوە و ئێستا بە وردەواڵەفرۆشی نانی خۆی پەیدا دەکا.

ئەمـانە پەیوەندی من دەگـەڵ دونیای دەرەوە بوون، بـەڵام لە دونیای نێو





خۆ: تەنیا دایەنەکەم و ژنێکی سەڵیتەم بۆ مابوونەوە. بەڵام نەنە دایەنی ئەویشــە، دایەنی هەردووکـمـانە ـ چونکە من و ژنەکـەم نە تەنیـا خـزم و کـەسی نزیکی یەک بـووین، نەنەش هەر دوومـانی پێکـەوە شـیـر داوە. هەر دایکی ئەو دایکـی منـیش بـوە ـ چونکـە مـن دایک و بـاوکـم هـەر نەدیـوە و دایکی ئەو هـەر ئەو ژنە بالابەرزەی کـە پرچی بۆز بـوو منی بە خـێو کـرد. دایکی ئەو بوو کە من وەک دایکی خۆم خـۆشم دەویست و هەر لە بەر ئەم هۆگریە بوو کە کچەکەیم هێنا.

لە دایک و بـاوکم چەند جـۆرە حـەکـایەتم بیـسـتـوە، تـەنیـا یەکـێک لەو چیرۆکانە کە نەنە بۆی گێرامەوە، لە لای خۆم پێموایە کە دەبێ راست بێ ـ نەنە پێیکوتم کە: باوک و مـامم دوو برای ئاواڵ دوانە بوون، هەردووکیان یەک جۆر، یەک شـوبار و یەک خوویان هەبوو و تەنانەت دەنگیشیـان وەک یەک بـوە وەها کـــە لێک کــردنـەوەیان کــارێکی ســانـا نـەبـوە. جگە لەوە پەیوەندییـەکی مـەعنەوی و هـەستێکی هاودەردیش دە نێوانیـان دا هەبوە، وەها کە ئەگەر یەکێک لەوان نەخۆش کەوتوە ئەوی دیش نەخۆش دەکەوت ـ بە قـسـەی خـەڵک وەک سـێـوێکی لەت کـراو بـوون ـ لە ئاکـام ـ هەر دوو پیــشـــەی تەجــارەت هەڵدەبژێرن و لە تـەمــەنی بیــست ســاڵەیی دەچنە هینـدووسـتـان و جنسـەکـانـی رەی وەک پارچەی جـۆربەجـۆری: مـونیـرە، پارچەی گـوڵدار، پارچەی پەمـەیی، عـەبا، شـاڵ، دەرزی، قـاپ و قـاچاغی گـڵێنە، گڵـەسـەر و بـەرگی قـەڵەمدان دەبەنـە هینـدووسـتان و دەیفرۆشن. باوکم لە شاری بەنارەس بوە و مـاممی بۆ شارەکانی دیکەی هیندووستان بۆ کاروباری بازرگانی ناردوە ـ دوای ماوەیەک باوکم گیرۆدەی کیژۆڵێکی بوگام داسی، سەماکەری مەعبەدی لینگەم دەبێ. ئیشی ئەم کـچە سەمای ئاییـنی لە بەرامبەر بوتی گەورەی لینگەم و خزمەتی بوتخانە بوە ـ کچێکی خــوێنگەرمی زەیتــوونی بـە مـەمکی لیـمـۆیی، چاوی درشـتـی لار، برۆی سێبەنگی کە خاڵێکی سووری لە نێوان داناوە.

ئێستا دەتوانم بیـهێنمە بەر زەینی خۆم کە بوگام داسی، یانی دایکم بە سـاری هەوریشـمی زێڕچنی رەنگینی، بەرۆک ئاوەڵە، لەچکەی دیبـا،





پرچی پڕی ڕەشی کە وەک شەوی ئەزەلی تاریک و لە پشت سەری خڕی کردبۆوە، پاوانەی پێ و بازنەی دەستی، خەزێمێکی زێڕ کە لە لووتی دابوە، چاوە درشتە ڕەش و خومار و لارەکانی، ددانی سپی بە کەشم و نەشمێکی ئارام و بە ئاهەنگ، بە هەوای سێتار و تەپڵ و تەمبوور و سەنج و کەرەنا سەمای کردوە ـ ئاهەنگێکی نەرم و یەکدەست کە پیاوە رووتەڵەکانی مێزەر لە سەر لێیان داوە ـ ئاهەنگێکی پڕ مانا کە هەموو رازەکانی جادووگەری و خورافات و هەوا و هەوەس و ئێشەکانی خەڵکی هیند لەو دا کورت و کۆ ببۆوە و بە لەنجە و لاری ڕێکوپێک و ئیشارەی هەوەس بزوێن ـ سەمای پیرۆزی ـ بوگام داسی وەک پەلکی گوڵ کراوەتەوە، لەرەیەکی بە شان و باسکەکانی داوە، داهاتۆتەوە و دیسان خۆی خڕ کردۆتەوە، ئەم ڕەوتانە کە مانای تایبەتیان هەبوە و بە بێ زمان قسەیان کردوە، توانیویانە چ شوێنێک لە سەر باوکم دابخەن ـ بە تایبەت بۆنی توند و تیژی ئارەقەی ئەو کە تێکەڵ بە عەتری موگرا و ڕۆنی سەندەل بوە، هەوەسی بوونی ئەم دیمەنەی پتر کردوە ـ عەترێک کە بۆنی شیلەی دارەکانی دوورەدەستی هەیە و هەستی دوور و خنکاو دەبزوێنێ ـ بۆنی مجری دەرمان، بۆنی ئەو دەرمانانەی کە لە دیوی منداڵان رایدەگرن و لە هیندەوە دێ ـ ڕۆنگەلی نەناسیاوی وڵاتێک کە پڕ لە داب و نەریتی کۆنە لە وانەیە بۆنی دێمکراوەی منی دابێ. هەمووی ئەوانە یادگارەکانی دوور و کوژراوی باوکمیان زیندوو کردۆتەوە ـ باوکم وەها گیرۆدەی بوگام داسی دەبێ کە دەچێتە سەر ئایینی کچی سەماکەر ـ ئایینی لینگەم، بەڵام دوای ماوەیەک کە کچ زگی پڕ دەبێ لە خزمەتی مەعبەد دەری دەکەن.

من تازە لە دایک ببووم کە مامم لە سەفەری خۆی دەگەڕێتەوە بۆ بەنارەس بەڵام دەڵێی سەلیقە و ئەوینی ئەویش دەگەڵ هی باوکم یەک بوە، یەک دڵ نا سەد دڵ گیرۆدەی دایکی من دەبێ و لە ئاکام ئەو فریو دەدا، چونکە ئەو وێکچوونە رواڵەتی و دەروونییەی کە دەگەڵ باوکم هەیبوە ئەم کارەی بۆ هاسان دەکا. هەر کە مەسەلەکە روو دەکرێ دایکم دەڵێ کە





هەردووکیان بە جێ دێڵێ مەگەر بە مەرجێک کە باوکم و مامم ئازمایشی ماری کوبرا بدەن و هەرکام لەوان زیندوو بمێنێتەوە هی ئەو دەبێ.

ئازمایشەکە ئاوا بوە کە باوکم و مامم دەبوا لە دیوێکی تاریکی وەک رەشچاڵ دەباڵ ماری کوبرا باوێن و هەر کام لەوان کە مار پێوەی بدا دیارە دەقیژێنێ و ئەودەم خاوەن مار دەرگای دیوەکە دەکاتەوە و ئەوی دیکە رزگار دەکا و بوگام داسی هی ئەو دەبێ.

بەر لەوەی کە ئەوان لە رەشچاڵ باوێن باوکم لە بوگام داسی داوا دەکا کە جارێکی دی لە بەر چاوی سەما بکا، سەمای پیرۆزی مەعبەد بکا، ئەویش بە قسەی دەکا و بە ئاهەنگی نەی ماراسا لە بەر رووناکی مەشخەڵ بە لەنجەی پڕ مانای رێکوپێک و خزی، سەما دەکا و وەک ماری کوبرا خۆی بادەدا ـ دوایە باوک و مامم لە دیوی تایبەتی لەباڵ ماری کوبرا داوێن ـ لە جیات قیژە و هاوار، ناڵەیەکی تێکەڵ دەگەڵ قاقایەکی کرێت بەرز دەبێتەوە ـ هاوارێکی شێتانە ـ دەرگا کە دەکەنەوە مامم دێتە دەر ـ بەڵام سیمای پیر و تێشکاو و تووکی سەری لە بەر ترس و خۆف، دەنگی خوشە و فیتووی ماری تووڕە کە چاوی خڕ و دڕ و ددانی بە ژەهری هەبوە و لەشی بریتی بوە لە ملێکی درێژ کە گەیشتۆتە بەرهەڵستێکی وەک کەوچک و سەرێکی چووک، لە ترسان مامم بە سەری سپی دێتە دەرێ ـ بە پێی شەرت و مەرج بوگام داسی دەبێتە هی مامم ـ شتێکی دڵتەزێن، روون نیە کەسێک کە دوای تاقی کردنەوە زیندوو ماوەتەوە باوکم یا مامم بوە.

چونکە لە ئاکامی ئەم تاقی کردنەوەیە دا مێشکی تێکدەچێ و ژیانی پێشووی خۆی بە تەواوی لە بیر دەکا و منداڵەکە ناناسێتەوە، لە بەر ئەمە پێیانوابوە کە مامم بوە ـ ئایا هەمووی ئەم ئەفسانەیە پەیوەندی بە ژیانی منەوە نیە، یا دەنگدانەوەی ئەم کەنینە کرێتە و خۆفی ئەم ئازمایشە شوێنی لە سەر من دانەناوە و پەیوەندی بە منەوە نیە؟

لەوە بە دوا من جگە لە نانخۆرێکی زیدە و بێگانەیەک شتێکی دیکە نەبووم ـ لە ئاکام مامم یا باوکم بۆ کاری بازرگانی خۆی دەگەڵ بوگام





داسی دەگەڕێتەوە شاری ڕەی و من دەداتە دەست خوشکی کە پووری منە.

دایەنم کوتی کە کاتی ماڵاوایی دایکم قاپێک شەرابی ئاڵ کە ژەهری ددانی کوبرا، ماری هیندیی تێدا ئاوێتە کرابوو بۆ من دەیداتە دەست پوورم. بوگام داسییەک چ شتێکی باشتر لەمە دەتوانێ بە یادگار بۆ منداڵەکەی بە جێ بێڵێ؟ شەرابی ئاڵ، ئیکسیری مەرگ کە ئاسوودەیی هەمیشەیی دەبەخشێ ـ لەوانەیە ئەویش ژیانی خۆی وەک هێشوو ترێ ڕێک کوشیوە و شەرابەکەی داوە بە من ـ لە هەمان ژار کە باوکمی کوشت ـ ئێستا دەزانم چ دیارییەکی بە نرخی داومێ!

ئایا دایکم زیندوە؟ لەوانەیە ئێستا کە من خەریکی نووسینم ئەو لە مەیدانی شارێکی دوورەدەستی هیند، لە بەر شۆقی مەشخەڵ وەک مار خۆی بادەدا و سەمایە دەکا ـ وەک ئەوەی کە ماری کوبرا پێوەی دابێ، و ژن و منداڵ و پیاوانی قۆشمە و رووت لە دەوری کۆ بوونەتەوە، لە حاڵێک دا باوک یا مامم بە سەری سپی، کووڕ، لە پەنا مەیدان دانیشتوە و چاو لەو دەکا و وەبیر ڕەشچاڵ، دەنگی فیتوو و خوشەی ماری تووڕە کەوتۆتەوە کە سەری خۆی هەڵدێنێ چاوەکانی دەبریسکێنەوە، ملی وەک ئەسکوێ لێدێ و خەتێک کە وەک چاویلکەیە لە پشت ملی بە ڕەنگێکی ئاماڵ بۆری ڕەش وەدیار دەکەوێ.

بە هەر حاڵ، من ساوایەکی شیرەخۆرە بووم کە لە باوەشی ئەم نەنەیەیان نام و نەنەی کچی پوورم، هەر ئەو ژنە سەڵیتەی منیشی شیر داوە . من لە ژێر دەستی پوورم، ئەو ژنە بالابەرزەی کە پرچی بۆزی لە سەر نێوچەوانی بوو، هەر لەو ماڵە دەگەڵ کچەکەی، هەر ئەو سەڵیتەیە گەورە بووم.

ــ لەو کاتەوە خۆم ناسی، پوورم لە جیات دایکم دانا و ئەوم خۆش ویست. ئەوەندە ئەوم خۆش دەویست کە کچەکەی، هەر ئەم خوشکە شیرییەی خۆم دوایە چونکە وەک وی دەچوو هێنام.

یانی ناچار بووم بیهێنم؛ تەنیا جارێک ئەم کچە خۆی بە دەستەوە دام،





هیچکات له بیری ناکەم، ئەویش له بان سەری دایکی مردووی بوو ـ زۆر له شەو تێپەڕیبوو، من بۆ دوایین ماڵاوایی هەر که هەموو ماڵ خەوتن به کراس و دەرپێوە هەستام، چوومە ژووری مردوو ـ دیتم دوو شەمی کافووری له بان سەری دایسان. قورئانێکیش له سەر زگی داندرابوو بۆ ئەوەی که شەیتان نەچێتە نێو جەندەکیەوە ـ پارچەی بان سەریم که لادا پوورم بەو قیافە راکێشەر و به نموودەوە دیت. دەتکوت هەموو هۆگرییەکانی دونیای خاکی له سیمای ئەو دا فەوتا بوون. حاڵەتێک که ناچاری کردم سەری بۆ دانوێنم و هاوکات مەرگم پێ به رووداوێکی ئاسایی و سرووشتی هاتە بەر چاو ـ بزەیەکی تەوساوی له سووچی لێوی دا ویشک ببوو. ویستم دەستی ماچ کەم و له ژوورەکه وەدەر کەوم، بەڵام که ئاوڕم داوە به سەرسوڕماوییەوە دیتم هەر ئەو سەڵیتەیە که ئێستا ژنی منە هاتە ژوور و له ئاست دایکی مردووی، به چ تاو و تینێک خۆی به منەوە نا، منی بۆ لای خۆی کێشا و چ ماچگەلێکی تەڕی کردم! من له شەرمان دەمەویست بتوێمەوە، بەڵام نەمدەزانی چ بکەم، مردوو به ددانە قفڵ کراوەکانی وەک ئەوە بوو که گاڵتەمان پێبکا ـ وام هاتە بەر چاو که بزەی ئارامی مردوو گۆڕا بوو ـ من به دەست خۆم نەبوو، له باوەشم کرد و رامووسی، بەڵام هەر لەو دەمە دا پەردەی دیوی تەنیشتمان لا درا و مێردی پوورم، باوکی ئەو سەڵیتەیە کووڕ و شاڵگەردن له مل هاتە ژوورێ.

کەنینێکی ویشک و کرێت و به بێزی هات که مچوڕکی به لەش دا دێنا، وەها که شان و پیلی دەلەرزاوە، بەڵام چاوی له ئێمە نەکرد. من له شەرمان دەمەویست به زەوی دا رۆچم و ئەگەر توانیبام زللەیەکی توندم له رووی مردوو دەدا که گاڵتەجاڕانە چاوی لێدەکردین. چ سەرشۆرییەک! به شێواوی له ژوور هاتمە دەرەوە ـ له بەر ئەو سەڵیتەیە ـ لەوانەیە ئەو نەخشەی پێکهێنابوو که من ناچار بم بهێنم.

سەرەڕای ئەمە که خوشک و برای شیری بووین، له بەر ئەوەکە ئابڕوویان نەچێ، ناچار بووم که بیکەمە ژنی خۆم. چونکه ئەم کچە بنی نەبوو، ئەمەشم نەدەزانی ـ من هەر نەمتوانی بەمە بزانم ـ تەنیا پێیان





گەیاندبووم ـ هەر شەوی زەماوەند کاتێک لە ژوور دا تەنیا ماینەوە من هەر چی لە بەری پاڕامەوە و داوام لێکرد، گوێی نەدایە و رووت نەبۆوە. دەیکوت: « بێ نوێژم. » هەر نەیهێشت بۆ لای بچم. چرای کووژاندەوە و چوو لەو لای دیوەکە نوست. وەک مێژووکە دەلەرزی، دەتکوت ئەویان لە رەشچاڵ لەباڵ ئەژدیهایەک هاویشتوە ـ کەس باوەڕ ناکا یانی جێی باوەڕ کردنیش نیە، ئەو نەیهێشت کە من ماچێکی لە کولّمی بکەم. شەوی دووهەمیش هەر چوومەوە سەر جێی شەوی یەکەم و لە سەر زەوی خەوتم و شەوەکانی دواییش هەر بەم جۆرە، نەمدەوێرا ـ ماوەیەکی زۆر بوو کە من لەو لای ژوور لە سەر زەوی دەخەوتم ـ کێ باوەڕ دەکا؟ دوومانگ، نا دوو مانگ و چوار رۆژ دوور لە وی لە سەر زەوی دەخەوتم و نەمدەوێرا لێی نزیک بمەوە.

ئەو پێشتر دەسرە پڕماناکەی ساز کردبوو، خوێنی کۆتری تێدابوو، نازانم. لەوانەیە هەر ئەو دەسرەیە بوو کە لە شەوی یەکەم ژوانی خۆیەوە رایگرتبوو بۆ ئەوەی کە پتر گاڵتەم پێبکا ـ ئەودەم هەموو پیرۆزباییان لێدەکردم، چاویان لە یەکتر دادەگرت و لەوانەیە لە دڵیشیان دا کوتبایان «کابرا دوێشەو قەڵای گرتوە؟ » و من بە رووی مبارەکی خۆم نەدێنا ـ پێم پێدەکەنین، بە کەرێتی من دەکەنین. مەرجم دەگەڵ خۆم کرد کە رۆژێک هەموو ئەوانە بنووسم.

دوای ئەمە کە زانیم کەڵەگای تاق و جووتی هەیە و لەوانەبوو لە بەر ئەوەکە مەلا چەند وشەی عەرەبی خوێندبۆوە و ئەوی لە ژێر دەست من نابوو خۆشی لە من نەدەهات، لەوانەیە دەیەویست ئازاد بێ ـ لە ئاکام شەوێک تەمام گرت کە بە زۆر بچمە زگی ـ تەماکەم بردە سەر. بەڵام دوای کێشەیەکی زۆر ئەو هەستا و رۆیشت و من خۆم بەوە رازی کرد کە ئەو شەوە لە جێ و بانەکەی دا کە گەرمای لەشی تێگەڕابوو و بۆنی ئەوی لێوە دەهات بخەوم و جینگڵ بدەم. تەنیا خەوێکی خۆش کە کردم هەر ئەو شەوە بوو ـ لەو شەوە بە دوا دیوەکەی لە من جویێ کردەوە.

شەوانە کاتێک دەهاتمەوە ماڵێ، ئەو هێشتا نەهاتبۆوە، نەمدەزانی کە





هاتۆتەوە یا نا ـ هەر نەمـــدەویست کـــە بزانم ـ چون من مـــەحکووم بە تەنیایی، مەحکووم بە مەرگ کرابووم. ویستم بە هەر لەونێک بوە دەگەڵ کەڵەگاکانی ئاشنا بم ـ ئەمە ئیدی کەس باوەڕم پێناکا ـ کە دەمبیست حـــەز لە کـەســێک دەکـا، خـۆم دەگـرت، دەچووم بە هەزار خـەفـەت و سەرشۆڕیی دەگەڵ ئەو کەسە ئاشنا دەبووم، کلکەسووتەم لە بەر دەکرد و نازیم دەکێشا و بۆم دێناوە، ئەویش چ کەڵەگاگەلێک: ورگفرۆش، فەقێ، جەرگفرۆش، سەرۆک داروغە، مفتی، چەرچی، فەیلەسووف کە ناو و نازناویان توفیری دەکرد، بەڵام هەموویان شاگردی سەروپێفرۆش بوون، هەموانی پێ لە من باشتر بوو ـ بە چ پەستی و سەرشۆڕییەک خۆم چووک و سووک دەکرد کەس باوەڕ ناکا. دەترسام ژنەکەم لە کیسم بچێ. دەمەویست شێوەی هەڵسوکەوت، ئاکار و دڵڕفێنی لە کەڵەگاکانی ژنەکەم فێر بم بەڵام گەوادێکی بەدبەخت بووم کە هەموو گەوجەکان پێم پێدەکەنین ـ هەر بە راستی چلۆن دەمتوانی ئاکار و خووی سپڵەکان فێر بم؟ ئێستادەزانم کە ئەوانی خۆش دەویست چونکە بێ شەرم، گێل و بۆگەن بوون. هەر ئەوینی ئەو تێکەڵاوی پیسایی و مەرگ بوو ـ ئایا بە راستی من دەمەویست دەگەڵی بخەوم، ئایا سیمای رواڵەتی ئەو منی گیرۆدەی خۆی کردبوو یا بێزاریی ئەو لە من، یا ئاکار و کرداری بوو و یا هۆگریی و ئەوینێک کە لە منداڵییەوە بە دایکیم هەبوو یا هەمووی ئەوانە دەستیان دابوو دەست یەک؟ نا، نازانم. تەنیا شتێک دەزانم: ئەو ژنە، ئەو سەڵیتەیە، ئەو جادوویە، نازانم چ ژارێکی لە رووحی من، لە بوونی من کردبوو کە نە تەنیا ئەوم دەویست، بەڵکەم تەواوی زەڕڕەکانی لەشم، زەڕڕەکانی لەشی ئەوی دەویست. هاواری دەکرد کە دەیەوێ و ئارەزوویەکی زۆرم دەکرد کە دەگەڵ ئەو لە دوڕگەیەکی ونبوو دا بم کە مرۆڤی تێدا نەبێ، ئارەزووم وا بوو بوولەرزەیەک یا تۆفانێک و یا برووسکێکی ئاسمانی هەموو ئەو سپڵانەی کە لە پشت دیواری ژوورەکەم هەناسەیان هەڵدەکێشا، تێدەکۆشان و کەیفیان دەکرد؛ هەموویانی تەقاندبا و تەنیا من و ئەو مابایەنەوە. ـ ئایا ئەودەمیش هەر گیاندارێکی دیکە، مارێکی هیندیی، یا





حەزیایەکی پێ لە من باشتر نەدەبوو، بە ئاواتەوە بووم کە شەوێکی دەگەڵ بم و پێکەوە لە ئامێزی یەکدی دا مردباین ـ پێموایە کە ئەمە ئاکامێکی بەرزی بوون و ژینی من دەبێ.

دەتکوت ئەم سەڵیتەیە لە ئازار دانی من سەرخۆش دەبوو، وەکوو بڵێی ئەو دەردەی کە منی دەخوارد بەس نەبوو ـ لە ئاکام لە کاروبار کەوتم و گردەنشین بووم ـ وەک مردووی زیندوو. هیچکەس بە رازی ئێمەی نەدەزانی، دایەنی پیرم کە ببوو بە هاودەمی مەرگی بەرەبەرەم، لۆمەی دەکردم ـ هەر لە بەر ئەو سەڵیتەیە لە پشت سەر، لە دەوروبەری خۆمم دەبیستەوە کە بە سرتە بە یەکتریان دەکوت: « ئەو ژنە بەستەزمانە چلۆن تاقەتی ئەم مێردە شێتە دێنێ؟ » حەق بەوان بوو، هەتا چ رادەیەک من پەست ببووم کە جێی باوەڕ نەبوو.

رۆژ بە رۆژ لە کەمیم دا، خۆم کە لە ئاوێنە دا چاو لێدەکرد روومەتم سوور و رەنگی گۆشتی بەر دوکانی گۆشتفرۆشی گرتبوو ـ لەشم داغ و چاوەکانم حاڵەتی خومار و غەمباریان بە خۆوە گرتبوو ـ بەو حاڵەتە نوێیەی خۆم کەیفم دەکرد و لە چاوەکانم دا تۆزی مەرگم دیتبوو ـ دیتبووم کە دەبێ بڕۆم.

لە ئاکام لە دوای حەکیمیان نارد ـ حەکیمی سپلەکان، حەکیمی ماڵمان کە بە قسەی خۆی ئێمەی گەورە کردبوو. بە مێزەری ئاماڵ زەرد و سێ بست ردێنەوە وەژوور کەوت. ئەو پێی شانازی بوو کە دەرمانی ئاو دە گون گەڕانی بە باپیرم داوە، شیوەران و نەباتی دە گەرووی من کردوە و فلووسی لە نێوکی پوورم بەستوە. بەڵێ، هەر هات لە بان سەرم دانیشت و نەبزی گرتم، زمانی چاو لێکردم، دەستووری دا شیری ماکەر و ئاوی جۆ بخۆمەوە و رۆژێ دوو جار بخووری کۆندۆر و زەرنیخ بکەم ـ چەند نوسخەی دوور و درێژیشی  دا بە دایەنەکەم کە بریتی بوو لە دێمکراوە و رۆنی سەیر و سەمەرەی وەک: زووفا، زەیتوون، روبی سوس، کافوور، پەرسیاوەش، رۆنی بەیبوون، رۆنی قاز، تۆوی کەتان، تۆوی سنەوبەر و شتی قۆڕی دیکە.





حاڵم خرابتر بوو؛ تەنیا دایەنەکەم، دایەنی ئەویش بوو، بە روخساری چرچ و پرچی بۆزی لە سووچی ژوور، لە بان سەری من دادەنیشت، ئاوی ساردی لە نێوچەوانم دەدا و دێمکراوەی بۆ دێنام. باسی خوو و خدەی منداڵی من و ئەو سەڵیتەی دەکرد. ـ بۆ وێنە پێیکوتم: ژنەکەم لە سەر لانکەوە عادەتی بوە نینۆکی دەستی چەپی جووتوە، ئەوەندەی جووتوە کە بریندار بوە و جارجارەش حەکایەتی بۆ دەگێڕامەوە ـ پێمـوابوو ئەم چیرۆکانە تەمەنی من بەرەو دواوە دەبەنەوە و حاڵەتێکی منداڵانەم تێدا پێکدێنن. چونکە سەر بە یادگارەکانی ئەو سەردەمە بوون ـ وەختایەک کە زۆر چکۆڵە بووم لە دیوێک کـــە من و ژنەکـــەم لە لەلۆ دا لە پەنا یەک خەوتبووین ـ لە لەلۆیەکی گەورەی دوو کەسی دا. دروست لە بیرمە ئەو چیرۆکانەی دەگێڕاوە. ئێستا هەندێک لە بەشەکانی ئەم چیرۆکانە کە پێشتر باوەڕم پێنەدەکردن بۆم بوونەتە شتێکی سروشتی.

چونکە نەخۆشی دونیایەکی تازەی لە من دا پێکهێنا، دونیایەکی نەناسیاو، ون و پڕ لە وێنەگەل و رەنگگەل و ویستگەلێک کە لە ساغی دا ناکرێ پێیبگەی و رووداوەکانی ئەم مەتەڵانەم بە کەیف و خۆشییەکەوە کە لە کوتن نایە لە خۆم دا هەست پێدەکرد ـ هەستم دەکرد کە بوومەوە منداڵ و هەر ئێستا کە خەریکی نووسینم، لەم هەستانە دا بەشداریم هەیە، هەموو ئەو هەستانە هی ئێستان و هی رابوردوو نین.

گۆیا هەڵسوکەوت، بیر، ئاوات و خووی پێشینیان کە بەو مەتەڵانەوە گەیشتۆتە پشت و بەرەکانی دوایی، یەکێک لە پێداویستیەکانی ژیانی من بوون. هەزاران ساڵە کە هەر ئەم قسانەیان کوتۆتەوە. هەر ئەم گانانەیان کردوە، هەر ئەم گیر و گرفتە ساکارانەیان هەبوە ـ ئایا سەراسەری ژیان چیرۆکێکی دزێو، مەتەڵێکی باوەڕنەکراو و گەوجانە نیە؟ ئایا من ئەفسانە و چیرۆکی خۆم نانووسمەوە؟ چیرۆک تەنیا رێگایەکی دەرباز بوونە لە ئاواتە جوانەمەرگ و خنکاوەکان، ئاواتگەلێک کە پێی نەگەیشتوون. ئاواتگەلێک کە هەر مەتەڵسازێک بە پێی رووحیەی تەنگەبەر و بە میرات بردراوی خۆی پێکیهێناوە.





بریا توانیبام وەک سەردەمێک کە منداڵ و نەزان بووم ئارام بخەوم ـ خەوێکی راحەت و بێ ترس ـ کە وەخەبەر دەهاتم رووومەتم سوور وە رەنگی گۆشتی بەر دوکانی گۆشتفرۆشی لێهاتبوو ـ لەشم داغ بوو و دەکۆخیم ـ چ کۆخەگەلێکی توندی پڕ مەترسی! ئەو کۆخانەی کە روون نەبوو لە کام چاڵی ونبووی لەشم دەهاتنە دەر، وەک کۆخەی ئەو بارگینانەی کە بەیانی زوو کەلاکی مەڕیان بۆ گۆشتفرۆش دێنا.

دروست لە بیرمە هەوا بە تەواوی تاریک ببوو، چەند دەقیقەیەک لە حاڵی بێهۆشی دا بووم. بەر لەوەی خەوم لێبکەوێ دەگەڵ خۆم قسەم دەکرد ـ لەودەمە دا هەستم دەکرد، دڵنیا بووم کە ببوومەوە منداڵ و لە لەلۆ دا خەوتبووم. هەستم کرد کە کەسێک لە نزیکمە، دەمێک بوو کە هەموو ماڵ خەوتبوون. نزیک کازیوە بوو و نەخۆش دەزانن کە لەم کاتە دا وەک ئەمەیە کە ژیان لە سەر سنووری دونیا هەڵدەکێشرێ ـ دڵم توند دەیکوتا، بەڵام ترسێکم نەبوو، چاوەکانم کرابوونەوە، بەڵام کەسێکم نەدەدیت، چونکە تاریکی زۆر خەست و چڕ بوو. تاوێک تێپەڕی بیرێکی ناخۆشم کردەوە بە خۆم کوت: « لەوانەیە ئەو بێ! » هەر لەو کاتە دا هەستم کرد کە دەستێکی فێنک لە سەر نێوچەوانی داغم داندرا.

لەرزیمەوە؛ دوو سێ کەڕەتم لە خۆ پرسی: « ئایا ئەوە دەستی عیزراییل نەبوە؟ » و دە خەو چوومەوە ـ بەیانی کە هەستام دایەنەکەم کوتی: کچەکەم (مەبەست ژنەکەم، ئەو سەڵیتەیە بوو) هاتبوە بان سەری من و سەرمی لە سەر کۆشی داناوە ، وەک منداڵ منی راژاندوە ـ گۆیا هەستی پێڕاگەیشتن و ئەرکی دایکانەی تێدا بزووتوە، بریا هەر ئەودەم مردبام ـ لەوانەیە ئەو منداڵەی کە لە زگی دابوە مردوە، ئاخۆ منداڵەکەی بوە؟ من نەمدەزانی.

لەم دیوە دا کە هەر دەم بۆ من تەنگتر و تاریکتر لە گۆڕی لێدەهات، هەمیشە چاولەرێی ژنەکەم بووم بەڵام قەت نەدەهات. ئایا لە بەر ئەو نەبوو کە تووشی ئەم رۆژە هاتبووم؟ گاڵتە نیە، سێ ساڵ، نا، دوو ساڵ و چوار مانگ بوو، بەڵام رۆژ و مانگ چن؟ بۆ من مانای نیە، بۆ کەسێک کە لە گۆڕ





دایه زەمان مانای خۆی ون دەکا ـ ئەم دیوە گۆڕی ژیان و بیرەکانم بوو ـ هەموو هەلات هەلات، دەنگەکان و هەموو خۆنواندنی ژیانی خەڵکی دی، ژیانی سپڵەکان کە هەموویان بە لەش و رووح وەک یەک ساز کراون، بۆ من سەیر و بێ مانا ببوو ـ لەو کاتەوە لە جێ دا کەوتووم، لە دونیایەکی غەریب و سەمەرە دا وە ئاگا هاتبوومەوە کە پێویستییەکم بە دونیای سپڵەکان نەبوو. دونیایەک کە دە خۆم دابوو، دونیایەکی پڕ لە راز و رەمز و وەک ئەوە بوو کە ناچار بووم سەر بە هەموو کەلێن و کولێنی داگرم.

شەو کاتێک بوونی من لە سەر سنووری دوو دونیا دا شەپۆلی دەداوە، هەندێک بەر لە دەقیقەیەک کە لە خەوێکی قورس و بۆش دا وەمەلە بکەوم خەونم دەدیت ـ بە چاو تروکاندنێک من ژیانێکی دیکە جگە لە ژیانی خۆم تێپەڕ دەکرد ـ لە هەوایەکی دیکە دا هەناسەم هەڵدەکێشا و دوور بووم. وەک ئەوەکە دەمەویست لە خۆم هەڵێم و چارەنووسم بگۆڕم ـ چاوم کە وێکدەنا دونیای راستەقینەی خۆم خۆی پێ نیشان دەدام ـ ئەم وێنانە ژیانی تایبەتی خۆیان هەبوو بە ئازادی ون و دیسان وەدیار دەکەوتنەوە. گۆیا ویستی من لەوان دا کارگەر نەبوو. بەڵام ئەم مەبەستە رونیش نیە، دیمەنێک کە دەهاتە بەر چاوم خەوێکی ئاسایی نەبوو، چونکە هێشتا خەوم لێنەکەوتبوو. من بە بێدەنگی و هێمنی، ئەم وێنانەم لە یەک جیا دەکردنەوە و دەگەڵ یەکم هەڵدەسەنگاندن. وا دەهاتە بەر زەینم کە هەتا ئێستا خۆم نەناسیوە و دونیا ئەم جۆرەی کە پێموابوو مانا و هێزی خۆی لە دەست دابوو و لە جیاتی تاریکی شەو دەستەلاتی بە دەستەوە گرتبوو ـ چونکە فێریان نەکردبووم کە چاو لە شەو بکەم و شەوم خۆش بوێ.

من نازانم لەو کاتە دا ئایا باسکم لە ژێر فەرمانی من دا بوو یا نا ـ پێموابوو ئەگەر دەستم لە ژێر فەرمانی خۆی نابا بە هانەیەکی نادیار و نەناسراو خۆبەخۆ وەکار دەکەوت، بێ ئەوەی کە بتوانم لە جووڵانەوەی ئەو دا دەورێکم هەبێ. ئەگەر دایەنم ئاگاداری هەموو لەشمی نەکردبا و بۆ خۆم هۆشم لێی نەبا، دەیتوانی کارگەلی وا بکا کە هیچ چاوەڕوانی نەبووم ـ ئەم هەستە درەنگانێک لە من دا پەیدا ببوو کە بە زیندەسەری





دەڕزێم. نە تەنیا لەشم، بەڵکە رووحیشم هەمیشە دەگەڵ دڵم دووبەرەکایەتی هەبوو و دەگەڵ یەک نەدەسازان ـ هەمیشە جۆرێک فەوتان و پوانێکی غەریبم دەگوزەراند ـ جاری وا بیرم لە شتگەلێک دەکردەوە کە بۆ خۆشم نەمدەتوانی باوەڕ بکەم. هەندێک جار هەستی بەزەییم تێدا پێکدەهات. لە حاڵێک دا ئەقڵم لۆمەی دەکردم. زۆر کەڕەت کە دەگەڵ کەسێک قسەم دەکرد، یا کە کارێکم دەکرد، خۆم لە قسە و باسی جۆراوجۆر هەڵدەقوتاند ، لە حاڵێک دا هۆشم لە جێگایەکی دیکە بوو، لە بیرێکی دیکە دا بووم و لە دڵم دا لۆمەی خۆم دەکرد ـ کۆگایەکی لە حاڵی رزان و پوان دا بووم. گۆیا هەمیشە ئاوا بوە و ئاوا دەبم تێکەڵاوێکی نارێکوپێکی سەیر...

شتێکی کە سەختە هەستم دەکرد لە هەموو ئەو خەڵکەی کە دەمدیت و لە نێویان دا دەژیام دوورم بەڵام وێچوونێکی ون و دوور و هاوکات نزیک، منی بەوان دەبەستەوە ـ هەر ئەو پێداوێستیە هاوبەشانەی ژیان بوون کە لە سەرسوڕمانی منیان کەم دەکردەوە ـ وێچوونێک کە پتر لە هەموویان ئازاری دەدام ئەوە بوو کە سپڵەکانیش وەک من لەو سەڵیتەیە، لە خێزانم خۆشیان دەهات و ئەویش پتر مەیلی بەوان هەبوو ـ شکم نیە کە کەمایەسییەک لە ژیانی یەکێک لە ئێمە دا هەبوە.

ناویم ناوە سەڵیتە، چونکە هیچ ناوێکی دیکەی وا چاک لێنایەتەوە ـ نامەوێ بڵێم: « خێزانم » چونکە بارودۆخی ژن و مێردایەتی دە نێوانمان دا نیە و درۆم دەگەڵ خۆم دەکرد. ـ من هەمیشە هەر لە رۆژی یەکەمەوە ناوم نا سەڵیتە ـ بەڵام ئەم ناوە هێزێکی راکێشەری تایبەتی هەبوو ـ ئەگەر ئەوم هێنا لە بەر ئەمە بوو کە لە پێشدا ئەو بۆ لام هات. ئەویش لە بەر فڕ و فێڵی بوو. نا، هیچ منی خۆش نەدەویست ـ چلۆن دەکرا ئەو کەسێکی خۆش بوێ؟ ژنێکی حەکەدار کە پیاوێکی بۆ هەوەس، یەکی بۆ ژوان و یەکی بۆ ئازاردان پێویست بوو ـ پێموانیە بەم سێیەش رازی با . بەڵام منی بێ شک بۆ ئازاردان هەڵبژاردبوو و لە راستیش دا، باشتر لەوەش نەیدەتوانی هەڵبژێرێ ـ بەڵام من ئەوم هێنا چونکە وەک دایکی





دەچوو ـ چونکە وێچوونێکی ون و دووری دەگەڵ خۆم هەبوو، ئێستا نە تەنیا ئەوم خۆش دەویست بەڵکەم تەواوی زەڕڕەکانی لەشم ئەویان دەویست. بە تایبەت نێو گەڵم، چون نامەوێ هەستی راستی لە ژێر پەردەی خەیاڵی ئەوین و هۆگریی و خودایی دا بشارمەوە ـ چونکە وشە شاراوەکانی ئەدەبی چێژی زاری من نین. پێمەوابوو کە جۆرێک ترووسکانەوە یا خەرمانە، وەک خەرمانەیەک کە لە بان سەری پێغەمبەران دەیکێشنەوە لە نێوگەڵم دا شەپۆلان دەدا و لەوانەیە خەرمانەی نەخۆش و داماوی من داوای خەرمانەی نێوگەڵی ئەوی دەکرد و بە تەواوی هێزەوە بۆ لای خۆی رادەکێشا.

حاڵم کە باشتر بوو، تەمام گرت بڕۆم خۆ ون کەم، وەک سەگێکی گەڕۆڵ کە دەزانێ دەبێ بمرێ. وەک ئەو مەلانەی کە کاتی مردنیان خۆ دەشارنەوە. ـ بەیانی زوو هەستام، دووکولیچەم لە سەر رفە هەڵگرت و وەها کە کەس تێنەگا لە ماڵێ هەڵاتم، لە چارەڕەشییەک کە تووشم ببوو رام کرد ـ بێ ئامانجێکی دیاریکراو بە نێو کۆڵانەکان دا، بێکار بە نێو سپڵەکان دا کە هەمووی ئەوان قیافەی بە تەماحیان هەبوو و بە دوای پارە و هەوەس دا هەڵدەهاتن تێپەڕیم ـ من پێویستییەکم بە دیتنی ئەوان نەبوو چونکە یەکێک لەوان نوێنەری ئەوانی دیکەش بوو: هەمووی ئەوان زارێک بوون کە گلۆڵەیەک ریخۆڵەی پێوە هەڵواسرابوو و دەگەیشتە سیرەتیان.

لەپڕ هەستم کرد گورجتر و سووکتر بووم. ماسولکەکانی پێم بە توندی و گورج و گۆڵییەکی تایبەتی کە شکم نەدەبرد وەڕێ کەوتبوون. هەستم دەکرد کە لە هەموو بەندەکانی ژیان رزگاریم بوە، شانم هەڵتەکاند، ئەمە خوویەکی تایبەتی من بوو، هەر لە سەردەمی منداڵی هەرکات لە ژێر باری ئەرک و زەحمەتێک رزگار دەبووم ئەم کارەم دەکرد.

هەتاو هەڵدەکشا و دەیسووتاند. رێم دە کۆڵانە چۆلەکان کەوت، لە سەر رێم خانوو رەنگ بۆرەکان بە شکڵی هەندەسی سەیر و سەمەرە: مەکەعەب، مەنشوور، قووچ بە دەربیچەی کورت و تاریکەکانیانەوە





دەدیتران. ئەو دەربیجانەی بێ دەر و بەر، بێ خێو و کاتی وەبەر چاو دەهاتن ـ دەتکوت هیچکات گیاندارێک نەیتوانیوە لەم ماڵانە دا ژیابێ.

هەتاو وەک تیغێکی زێڕین، لێوار سێبەری دیواری دەتاشی و هەڵیدەگرت. کۆڵانەکان دە نێوان دیوارە کۆنە سپی کراوەکان دا درێژ دەبوونەوە. هەموو جێ ئارام و کپ بوو وەک ئەمە کە تەواوی بەشدارانی یاسای پیرۆزی هێمنایەتی هەوای داغ، یاسای بێدەنگیان لە بەر چاو گرتبوو. وادیار بوو لە هەموو جێیەک رازگەلێک حەشار درابوون، وەها کە سییەکانم نەیاندەوێرا هەناسەی هەڵکێشن.

لەپڕ دیتم لە دەروازە چوومە دەر ـ تینی هەتاو بە هەزاران زاری هەڵمژیەوە، ئارەقەی لەشی منیان هەڵدەمشت. چرپیەکانی سارا لە ژێر هەتاوی تاوێنەر دا وەک زەردەچێوەیان لێهاتبوو. هەتاو وەک چاوی بە یاو، تیشکی سووتێنەری خۆی لە بنەبانی ئاسمان پێشکەشی دیمەنی بێدەنگ و بێگیان دەکرد. بەڵام خاک و گیایەکانی ئێرە بۆنێکی تایبەتیان هەبوو، بۆنیان ئەوەندە بە هێز بوو کە پێیان وەبیر ساتەکانی منداڵی خۆم کەوتمەوە ـ نە تەنیا بزۆزی و وشەکانی ئەودەمیان وەبیر هێنامەوە، بەڵکەم بۆماوەیەک ئەو سەردەمەم هەست پێکرد، دەتکوت دوێنێ رووی دابوو. جۆرێک سەرەگێژەی خۆشم گرت، وەک ئەوەکە دیسان لە دونیایەکی ونبوو دا لە دایک ببوومەوە. ئەم هەستە تایبەتییەکی مەستێنەری هەبوو و وەک کۆنەشەرابی شیرین لە رەگ و دەمارەکانم دا هەتا ناخی گیانم شوێنی دادەنا ـ لە سارا دڕکەکان، بەردەکان، کۆتەرەدارەکان و پنچکە کورتەکانی جاترەم دەناسینەوە ـ بۆنی خۆمانەی شیناوەردەکانم دەناسییەوە ـ وەبیر رۆژە دوورەدەستەکانی خۆم کەوتمەوە بەڵام هەموو ئەم یادگارانە بە چەشنێکی سێحراوی لە من دوور ببوونەوە و ئەم یادگارانە بە یەکەوە ژیانێکی سەربەخۆیان هەبوو. لە حاڵێک دا من پتر لە شاهیدێکی دوور و بێچارە نەبووم و هەستم دەکرد کە دە نێوان من و ئەوان دا گێژاوێکی قووڵ ساز ببوو. هەستم دەکرد کە ئیمڕۆ دڵم بەتاڵە و پنچکەکان عەتری جادوویی ئەودەمیان بزر کردبوو، دارە سەوڵەکان پتر لە یەکتر





کشـابوونەوە، تەپۆڵکەکـان ویشکتـر ببـوون ـ ئەو بوونەوەرەی کـە ئەودەم بووم ئیتر نەمابوو و ئەگەر هێنابام و قسـەم دەگەڵ کردبا نەیدەبیست و تێم نەدەگەیشت. سیمای کەسێکی هەبوو کە پێشتر لەوە ناسیاوی بووم بەڵام لە من و هی من نەبوو.

دونیا لە بەر چاوم وەک ماڵێکی بەتاڵ و بەغەمی لێهات و لە سینگم دا دڵەکورکەیەک دەخولاوە وەک ئەوەکە هەر ئێستا ناچار بووم بە پێخواسی سـەر لە هەمـوو دیوەکـانی ئەو مـاڵە بدەم ـ بە ژوورەکـانی دەباڵ یەکی دا دەرۆیشتم، بەڵام کاتێک لە دوایین دیـو دەگەیشتمە بەر « ئەو سەڵیتەیە »، دەرکەکانی پشت سەرم خۆبەخۆ دادەخران و تەنیا سێبەری لەرزۆکی ئەو دیوارانەی کە قـونیچکیان نەمابوو وەک کەنیز و غولامی رەش لە دەورم چاوەدێریان دەکردم.

کە گەیشتمە نزیک چۆمی سـوورێن لە پێشەوەم کێوێکی رووتەن دیاری دا. باڵای ویشک و پتـەوی کـێو منی وەبیر دایەنم خستـەوە، نازانم چ پەیوەندییەکیـان بە یەکـەوە هەبوو. بە پەنا کـێو دا تێپەڕیم، گەیشتمە گۆڕاییەکی چووک و بژوێن کە کێو دەورەی گرتبوو. سەر زەوی بە پنچکی لاولاوی کەوی داپۆشـرابوو و لە سـەر کـێو قەڵایەکی بەرز کە بە خـشتی قورس داندرابوو دەدیترا.

لەو دەمە دا هەستم بە ماندوویی کرد، چوومە پەنا چۆمی سوورێن لە ژێر نسێی دارە سەوڵێکی پیر لە سەر لمەکان دانیشتم. جێیەکی چۆل و هۆل بوو. وا دەهاتە بەر چاو کـە هەتا ئێستـا کەس پێی دێرە نەناوە. لە نەکاو وەخۆ هاتمەوە دیتم لە پشت دارە سەوڵەکان کیژۆڵەیەک هاتە دەر و چوە لای قەلا. جلێکی رەشی دەبەر دابوو کە بە تان وپۆیەکی زۆر ناسک و سـووک گۆیا بە هەوریشم چندرابوو. نینۆکی دەستی چەپی دەجووت و بە ئازادی و بێ سـەرنج دان دەخزا و دەرۆیشت. دەتکوت کە من ئەوم دیوە و دەیناسم بەڵام لەو مەودا دوورە و لە بەر تیشکی تاو نەمتوانی بیبینم کە چلۆن لەپڕ ون بوو.

لە سـەر جێی خۆم ویشک هەڵاتبووم، بێ ئەوەی کە بتوانم چووکترین





جـووڵـەی بکەم بـەڵام ئەوجــار بـە هـەردووک چاوی خــۆم ئەوم دیت کــە بە بەرامـبــەرم دا تێـپـەڕی و ون بوو. ئایا ئەو بوونەوەرێکی راسـتـەقـینە یا خەیاڵێک بوو؟ ئایا خەونم دیتبوو یا لە بێداری دا بوو، هەرچی حەولم دەدا کە وەبیرم بێتەوە کەلکی نەبوو ـ هەستم بە برووسکێکی تایبەتی لە سەر تیـغــەرەی پـشــتم کـرد، وا هاتە بەر چاوم کــە لەو ســاعــەتە دا هەمــوو سێبەرەکانی قەڵای سەر کێو گیانیان گرتبوو و ئەو کیژۆڵەیەش یەکێک لە دانیشتوانی پێشووی شاری کۆنی رەی بوە.

دیمـەنێک کـــە لە پـێـــشـم بوو لە پڕ ئاشنا هـاتە بەر چاوم. رۆژێکی سێزدەبەدەرم بە منداڵی وەبیر هاتەوە کە هاتبووینە ئێرە، دایکی خێزانم و ئەو سەڵیتەیەش بوون. ئێمە ئەو رۆژەی چەندە لە پشت ئەم دارەسەولانە رەپێی یەکمان نا و کایەمان کرد، دوایە تاقمێک منداڵی دیکە رەگەڵمان کەوتن کە چاکم وەبیر نایەن. قەرەقەرێنمان دەکرد. جارێک کە من وەدوای ئەو سەڵیتەیە کەوتم نزیک هەمان چۆمی سوورێن بوو، پێی خزی و لە چۆم کـەوت. ئەویان دەرهێناوە، بردیانە پشت دارێکی سـەوڵ و جلیـان گـۆڕی منیش وەدوایان کـەوتم، چارشـێـویان لە بـەر گـرت. بەڵام من بە دزی لە پشت دارەوە تەواوی لەشیم دیت. ئەو بزەی دەهاتێ و ئەنگوستی شادەی دەستی چەپی دەجووت. دوایە چارشێوشانێکی سپییان پێدادا و جلە رەشـە هەوریشمیـەکەی ئەو کە بە تان و پۆی ناسک چندرابوو لە بەر تاو هەڵیان خست.

لە ئاکام لە ژێر دارە سـەوڵی پیر لە سەر لەکان درێژ بووم. خورەی ئاو وەک سرتەسرت و قسەی تێکەڵ پێکەڵ کە لە عالەمی خەو دا دەریدەبڕن، دەهاتە گوێم. دەسـتـەکانم بێ ویستی خۆم لە لمی گـەرم و شێدار نا، لمی گەرم و شێدارم لە مستم دا رێک دەکوشی، وەک گۆشتی سفتی کیژێک بوو کە لە ئاو کەوتبێ و جلەکانیان گۆڕی بێ.

نازانم چەندە گـوزەرا، کـاتێک لە ســەر جـێی خـۆم هەسـتـام بێ هیچ ویسـتـێک وەڕێ کـەوتم. هەمـوو جێ ئارام و بێدەنگ بوو. من دەڕۆیشـتم بەڵام دەوروبەری خـۆم نەدەدیت. هێـزێک کــە بـە ویســتی من نەبوو منی





ناچار بە ڕۆیشتن دەکرد، هەموو هۆشم دابوە هەنگاوەکانی خۆم . من بەڕێ دا نەدەڕۆیشتم، بەڵام وەک ئەو کچە ڕەشپۆشە لە سەر پێیان دەخزیم و تێدەپەڕیم ـ هەر وەخۆ هاتمەوە دیتم لە شار و لە بەر ماڵی باوکی خێزانمم، نازانم بۆ ڕێم دە ماڵی باوکی خێزانم کەوتبوو ـ برا چکۆڵەکەی خێزانم، لە سەر سەکۆ دانیشتبوو ـ دەگەڵ خوشکەکەی وەک سێویێک بوون کە لەت کرابێن. چاوی لاری تورکمەنی، کوڵمی زەق، ڕەشتاڵە، لووتی هەوەسی، سیمای کز و پڕی هەبوو. هەروا کە دانیشتبوو، ئەنگوستی شادەی دەستی چەپی لە زار نابوو. من بێ ئەوەی بە خۆم بێ چوومە پێش لە گیرفانم کولیچەیەکم دەرهێنا و دامێ و کوتم: « ئەوانە شاگیان بۆی ناردووی. » چونکە لە جیات دایکی خۆی بە خێزانمی دەکوت شاگیان ـ ئەو بە چاوە تورکمەنییەکانی خۆی بە سەیری ڕوانیە کولیچەکان کە بە شکەوە بە دەستەوەی گرتبوو. من لە سەر سەکۆی ماڵ دانیشتم ئەوم لە سەر کۆشم دانا و بە خۆمەوە نا. لەشی گەرم و بەلەکی وەک بەلەکی خێزانم بوو و هەمان ڕەوتی سڕی ئەوی هەبوو. لێوەکانی ئەو وەک لێوەکانی باوکی بوون. بەڵام ئەوەی کە لە لای باوکی لێی بێزار بووم بە پێچەوانە لەو دا بۆ من ڕاکێشەر بوو ـ وەک ئەمە کە لێوە نیوە ئاوەڵەکانی ئەو تازە لە ڕامووسانێکی گەرمی درێژخایەن جوێ ببوونەوە ـ سەر زاری نیوە ئاوەڵەیم ماچ کرد کە وەک لێوەکانی خێزانم بوو ـ لێوەکانی تامی قونگە هارۆیان دەدا، تاڵ و مڵ بوو. لەوانەیە لێوەکانی ئەو سەڵیتەش هەر ئەم تامەی هەبوو.

لەو دەمە دا دیتم باوکی ـ ئەو پیرەمێردە کوورەی کە شاڵگەردنی بەستبوو، لە دەرگای ماڵ هاتە دەر. بێ ئەوەی چاوم لێبکا تێپەڕی. بڕبڕ پێدەکەنی، کەنینێکی بە خۆف بوو کە مچوڕکی بە لەش دا دێنا و شانی لە بەر پێکەنین دەلەرزاوە. لە شەرمان دەمەویست بتوێمەوە ـ نزیک تاوپەڕ بوو، هەستام وەک ئەوەکە دەمەویست لە خۆم ڕاکەم، لە خۆوە بەرەو ماڵ بوومەوە. هیچ کەس و هیچ شتێکم نەدەدیت، پێموابوو کە بە نێو شارێکی نەناسراو دا دەڕۆم. ماڵە سەیر و سەمەرەکان بە شکڵە هەندەسییەکانی،





دابڕ دابڕ، بە دەربیجەی بەتاڵی ڕەشەوە لە دەورم بوون. وەک ئەوە بوو کە قەت گیاندارێک ناتوانێ تێیان دا بژی بەڵام دیوارە سپییەکانیان بە کزی دەدرەوشانەوە و ئەمەی کە سەیر بوو، شتێک کە نەمدەتوانی باوەڕ بکەم لە ئاست هەر کام لەو دیوارانە کە ڕادەوەستام، لە بەر تریفەی مانگ سێبەرم گەورە و خەست دەکەوتە بان دیوار بەڵام بێ سەر بوو ـ سێبەرەکەم سەری نەبوو ـ بیستبووم کە ئەگەر سێبەری کەسێک سەری نەبێ هەتا سەری ساڵ دەمرێ.

پەشۆکاو وەماڵ کەوتم و پەنام بردە ژوورەکەم ـ لەودەمە دا خوێن لە کەپۆم هات و دوای ئەوەکە خوێنێکی زۆرم لە بەر ڕۆیی بێهۆش کەوتمە سەر جێگاکەم، دایەنەکەم خەریک بوو پێمڕادەگەیشت.

بەر لەوەی کە بخەوم لە ئاوێنە دا ڕوانیمە ڕوخسارم، دیتم سیمام تێشکاوە، سڕیو و بێ رووح بوە. ئەوەندە کاڵ ببۆوە کە خۆم نەدەناسیەوە ـ چوومە نێو جێگاکەم و لێفەم بە سەر خۆم دا کێشا، وەرگەڕامەوە، ڕووم لە دیوار کرد. لاقەکەنم کۆ کردەوە، چاوەکانم وێکنان و درێژەم بە خەیاڵەکانی خۆم دا. ئەو هەودایانەی کە چارەنووسی تاریک، بە غەم، بە ترس و پڕ لە خۆشی منیان پێکدەهێنا ـ لەو جێیەی ژیان دەگەڵ مەرگ ئاوێتە دەبێ و وێنەگەلی وەرگەڕاو پێکدێنێ، ویستە کوژراوە کۆنەکان، ویستە ونبوو و خنکاوەکان دیسان زیندوو دەبنەوە و هاواری تۆڵە بەرز دەکەنەوە ـ لەو کاتە دا لە سروشت و دنیای ڕواڵەتی هەڵدەکەندرام و حازر بووم کە لە ڕەوتی ئەزەلی دا ون بم و بفەوتێم ـ چەند جار لە بەر خۆمەوە بە ورتە گوتم: « مەرگ، مەرگ... لە کوێی؟ » ئەمە سوکنایی دامێ و چاوەکانم وێک هاتن.

چاوەکانم کە وێکنران، دیتم لە مەیدانی مەحەممەدیە بووم. دارێکی بەرزیان چەقاندبوو و پیرەمێردی وردەواڵەفرۆشی بەرامبەر ژوورەکەمیان لە سێدارە دابوو ـ چەند داروغەی مەست لە ژێر سێدارە شەرابیان دەخواردەوە ـ دایکی خێزانم سوورهەڵگەڕاو، بە سیمایەک کە لە کاتی تووڕەیی خێزانم، کە ئێستا دەیبینم لێوی دەلەرزێ و چاوەکانی خڕ و زەق





دەبنەوە. پیلی منی رادەکێشا، بە نێو خەڵک دا دەیبردم و بە میرغەزەب کە جلی سووری دەبەر کردبوو نیشانی دەدام و دەیکوت: « ئەوەش لە دار دەن!... » من راچەنیم ـ وەک سۆبە دایسام، لەشم شەلاڵی ئارەقە بوو و تینیکی سووتێنەر لە سەر روومەتم بڵێسەی دەدا ـ بۆ ئەوەی خۆ لە دەست ئەم مۆتەیە رزگار کەم، هەستام و ئاوم خواردەوە و هەندێکم بە سەر و رووم داکرد. درێژ بوومەوە، بەڵام خەوم لێنەدەکەوتەوە.

لە تاریک و روونی وەتاغ دا روانیبوومە گۆزەی سەر رفە. پێموابوو هەتا ئەودەمەی کە گۆزە لە سەر رفەیە خەوم لێناکەوێ ـ جۆرێک ترسی بێ جێم تێدا بەدی هاتبوو کە گۆزە دەکەوێ، هەستام کە جێی گۆزەکە خۆش کەم بەڵام لە بەر هانەیەکی نەناسراو کە خۆم نەمزانی بە قەست دەستم وە گۆزە کەوت، گۆزە کەوت و شکا، لە ئاکام پێڵووکانم وێکنان، بەڵام بە خەیالم داهات کە دایەنم هەستاوەتەوە و چاو لە من دەکا ـ لە بن لێفە مستەکانم ئامادە کرد، بەڵام چ رووداوێکی ئەوتۆ رووی نەدا. لە حاڵەتی بێهۆشی جیرەی دەرگای کووچەم بیست، خشەی پێی دایەنم بیست کە پێڵاوەکانی لە عەرز دەخشاند و چوو نان و پەنیری کڕی.

دوایە دەنگی دوورەدەستی فرۆشیارێک هات کە دەیکوت: « سەفرابەرە گاتوو؟ » نا، ژیان وەکوو پێشوو مەلوول دەستی پێکردبۆوە. رووناکایی پتر دەبوو، چاوەکانم کە کردەوە پەڵە شۆقێک کە لە رەنگدانەوەی هەتاوی سەر ئاوی حەوز لە دەربیجەی وەتاغەکەم کەوتبوو سەر میچ، دەلەراوە.

پێموابوو خەونی دوێشەو ئەوەندە دوور و سڕاوە بوو وەک ئەوەکە چەند ساڵ پێش کاتێک منداڵ بووم دیتوومە، دایەنەکەم بەرچایی منی هێنا، وەک ئەوە بوو کە سیمای دایەنەکەم کەوتۆتە سەر ئاوێنەیەکی چرژاو، ئەوەندە لاواز و درێژ هاتە بەر چاوم، شکڵێکی زۆر سەیر و سەمەرەی لێ دەر کەوتبوو. دەتکوت کە شتێکی قورس سیمای بۆ خوارەوە کێشا بوو.

نەنە سەرەرای ئەوەکە دەیزانی دووکەڵی قەنە بۆ من خراپە دیسان هەر لە ژوورەکەم قەنەی دەکێشا. هەتا قەنەی نەکێشابا کەیفی ساز نەدەبوو. دایەنەکەم ئەوەندە باسی نێو خۆیان، باسی بووک و کوڕەکەی بۆ





کردبووم، منیشی کردبوو بە شەریکی کەیفە هەوەسبارەکانی خۆی ـ چەند گەوجانەیە، هەندێک جار لە خۆڕا بیرم لە کەس و کاری دایەنەکەم دەکردەوە، بەڵام نازانم بۆ هەر چەشنە ژیان و خۆشی خەڵکی دی دڵی لە ژێڵـــڵا دێنام ـ لە حـــاڵێک دا دەمـــزانی کـــە ژیانی من تەواو بوە و بە شێوەیەکی پڕ لە ژان ئارام دەکووژاوە. چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەبوو کە سەرنج بدەمە ژیانی گەوجەکان و سپڵەکان، کە ساغ بوون، باشیان دەخوارد، چاک دەخەوتن و باش گانیان دەکرد و هیچکات نەختوولەیەک هەستیان بە ئێشەکانی من نەکردبوو و باڵەکانی مەرگ هەموو ساتێک لە سەر و روویان نەخشا بوو؟

نەنە وەک منداڵان دەگەڵم دەجووڵاوە. دەیەویست هەموو جێیەکی من ببینێ. من هێشتا شەرمم لە ژنەکەم دەکرد. وەژوور کە دەکەوت سەر لەگەنەکەم کە بەڵغەمم تێکردبوو، دادەپۆشی ـ سەر و ردێنم دادەهێنا، ئارەقچنەکەم رێکوپێک دەکرد. بەڵام لە کن دایەنم چ شەرمم نەدەکرد ـ بۆچی ئەو ژنە کە چ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبوو هێندە خۆی لە ژیانی من هەڵقوتاندبوو؟ وەبیرم دێ هەر لەو ژوورە زستانان لە سەر ئەنباراو کورسیمان دادەنا. من و دایەنەکەم و ئەو سەڵیتەیە لە دەوری کورسی دەخەوتین. تاریک و روون کە چاوم دەکردەوە نەقشی سەر پەردەی گوڵچن کە لە بەر دەرکە هەڵواسرابوو لە بەرامبەر چاوم گیانی دەگرت. چ پەردەیەکی سەیر و ترسناک بوو؟ لە سەری پیرەمێردێکی کووڕ وەک جووکەکانی هیندیی مێزەر لە سەر، لە ژێر دارێکی سەوڵ دانیشتبوو و سازێکی وەک سێتاری بە دەستەوە بوو و کچێکی جەوانی جوان وەک بوگام داسی ـ سەماکەری بوتخانەکانی هیند دەستەکانی لێک هاڵاندبوو و واوێدەچوو کە ناچار کراوە لە بەرامبەر ئەم پیرەمێردە سەما بکا ـ پێمـوابوو کە ئەم پیرەمێردەشیان لە رەشچاڵ دەباڵ ماری کوبرا هاویشتبوو کە وای لێهاتبوو و سەر و ریشی سپی ببوو. لەو پەردە زێڕچنانەی هیندیی بوو کـــە لەوانەیە باوکم یا مـــامم لە دوور وڵاتەوە ناردبووبیانەتەوە ـ کە لە وێنەکە زۆرتر خورد دەبوومەوە دەترسام.





دایەنەکەم خەواڵوو هەڵدەستاند، بە زاری بۆگەنیو و پرچی زووری رەشی کە لە سەر و رووی هەڵدەسووم منی بە خۆوە دەنا ـ بەیانی کە چاوم کراوە ئەوم هەر ئاوا هاتە بەر چاو. تەنیا خەتەکانی رووی قووڵتر و چرتر ببوون.

زۆر جار بۆ لە بیر کردن، بۆ راکردن لە خۆم، سەردەمی منداڵیم وەبیر خۆم دێناوە. بۆ ئەوەی کە هەست بە حاڵی بەر لە نەخۆشییم نەکەم ـ هەست بکەم کە ساغم ـ هێشتا هەستم دەکرد کە منداڵم و بۆ مەرگم، بۆ فەوتانم، زاتێکی دووهەم بوو کە بەزەیی پێمدادەهات، بە حاڵی منداڵێک کە دەمرێ ـ لە کاتی پڕ لە سامی ژیانی خۆم دا هەر کە سیمای ئارامی دایەنم دەدیت، سیمای بزرکاو، چاوەکانی دە قووڵەوەچووی بێ بزووت و لێڵ، پەرە ناسکەکانی تفنک و نێوچەوانی رەقەڵە و پانی ئەوم کە دەدیت، یادگارەکانی ئەودەمم وە بیر دەهاتەوە ـ دەتکوت شەپۆلگەلێکی نەناسیاوی لێوە دەهات کە منی ئارام دەکردەوە ـ خاڵێکی گۆشتنی لە سەر لا جانگی بوو کە مووی لێ هاتبوە دەر ـ پێشتر کە چاوم لێدەکرد ئاوا لێی ورد نەدەبوومەوە.

ئەگەرچی نەنە بە رواڵەت گۆڕابوو بەڵام بیری هەر وەک خۆی مابۆوە، تەنیا هۆگرییەکی پتری بە ژیان نیشان دەدا و لە مەرگ دەترسا، وەک ئەو مێشانەی کە سەرەتای پاییز پەنایان بۆ ژوورەوە دێنا. بەڵام ژیانی من هەر رۆژ و هەر سات دەگۆڕدرا. وا دەهاتە بەر زەینم کە مەودای زەمان و گۆڕانێک کە لەوانە بوو مرۆڤ لە چەندین ساڵ بە سەری دا بێ، بۆ من تێپەڕینی ئەم رەوتە هەزار قات پتر و توندتر ببوو. لە حاڵێک دا لایەنی خۆشی ئەو بە پێچەوانە بەرەو سفر دادەکشا و لەوانەبوو لە سفریش تێپەڕیبا ـ کەسانێک هەن کە لە بیستساڵیەوە دەست دەکەن بە گیان دان لە حاڵێک دا زۆربەی خەڵک تەنیا لە کاتی مەرگیان دا زۆر ئارام و هێدی وەک پیسۆزێک کە رۆنی تەواو بووبێ دەکووژێنەوە.

نیوەڕۆ کە دایەنم چێشتی هێنا، لە بن قاپی ئاشەکەم دا، هاوارم کرد؛ بە هەموو هێزەوە هاوارم کرد، تەواوی خەڵکی نێو ماڵ هاتن لە بەر ژوورەکەم کۆ بوونەوە. ئەو سەڵیتەیەش هات و زوو رۆیی. چاوم لە زگی





کرد، هاتبوە سەر. نا، هێشتا نەزابوو. چوون حەکیمیان هێنا ـ لە نێو دڵم دا کەیفم دەکرد کە لانی کەم ئەم گەوجانەم تووشی زەحمەت کردوە.

حەکیم بە سێ بست ردێنەوە هات و دەستووری دا کە من تریاک بکێشم. چ دەرمانێکی بە نرخ بۆ ژیانی پڕ لە ژانی من بوو! کاتێک تریاکم دەکێشا؛ بیرەکانم مەزن، ناسک، بە ئەفسوون دەبوون و دەفڕین ـ لە شوێنێکی دیکە جگە لە دونیای ئاسایی دەگەڕام و پیاسەم دەکرد.

خەیاڵەکان و بیرەکانم لە بەندی قورسایی و سەنگی شتەکانی زەمینی ئازاد دەبوون و بۆ لای ئاسمانێکی ئارام و بێدەنگ دەفڕین ـ وەک ئەمە کە منیان لە سەر باڵی چەکچەکیـیەکی زێڕین دانابێ و لە دونیای بۆش و درەوشان کە تووشی هیچ لەمپەر و بەرگرێک نەدەبووم دەگەڕام. ئەوەندە ئەم هەستە قووڵ و کەیف بزوێن بوو کە لە مەرگیش کەیفی پتربوو.

لە سەر مەقەڵی کە هەستام، چوومە بەر دەربیجەی روو بە حەسارەکەمان. دیتم دایەنەکەم لە بەر هەتاو دانیشتبوو، سەوزی پاک دەکرد. بیستم کە بە بووکەکەی کوت: « هەموومان بووراوینەوە؛ بریا خودا بیکووژێ و راحەتی کا! » گۆیا حەکیم بەوانی کوتبوو کە من چاک نابمەوە.

ــ بەڵام من هیچ پێم سەیر نەبوو. چەندە ئەو خەڵکە گەوجن! هەر کە سەعاتێک دوایە دێمکراوەی هێنا، چاوەکانی لە بەر گریانی زۆر سوور ببوونەوە و هەڵمسابوون ـ بەڵام لە ئاست من بە زۆر بزەی هاتێ ـ لە ئاست من دەوریان دەگێڕا، هەموو لە ئاست من دەوریان دەگێڕا، ئەویش چەندە ناشارەزایانە! پێیانوابوو من خۆم نازانم. بەڵام بۆچی ئەو ژنە منی خۆش دەویست؟ بۆچی خۆی بە هاوبەشی ئێشەکانی من دادەنا؟ رۆژێک پارەیان دابوویە و مەمکە چرچە رەشەکانی وەک دۆڵچە دە گوویم ئاخنیبوون ـ بریا خۆرکە لە مەمکەکانی دابا ـ ئێستا کە مەمکەکانیم دەدیت، بێزم هەڵدەستا کە ئەودەم بە تاسەوە شیرەی ژیانی ئەوم دەمژی و گەرمای لەشمان دەچوە نێو یەکەوە. ئەو دەستی لە تەواوی لەشم وەردەدا و لە بەر ئەوەش بوو کە ئێستاش بە تێڕادیوییەکی تایبەتی کە لەوانەیە





ژنێکی بێ شـوو هـەیبـێ، دەگـەڵ من دەجـووڵاوە ـ وەک سـەردەمی مـنداڵی سـەیری منی دەکرد، چونکە سـەردەمـایەک لە سـەر چاڵێک رایداشـتبـووم. کێ دەزانێ لە وانـەیـە منی رەخـۆی خـسـتبـێ ـ وەک دەسـتـە خـوشـکێک کـە ژنان بۆ خۆیانی هەڵدەبژێرن. ئێستاش بە چ وریایی و تێروانینێک هەڵگێڕ وەرگێڕ و بە قسـەی خۆی « تەڕ و ویشکی » دەکردم! ـ ئەگەر ژنەکەم، ئەو سـەڵیـتـەیە بە من راگـەیشـتـبـا، من قـەت نـەنەم بۆ لای خـۆم رێ نەدەدا، چونکە لای خـۆم وام دادەنا کە جـەغزی بیر و هەسـتی جـوانی ژنەکەم پتـر لە دایەنەکەم بوو و یا ئەوەکە تەنیا هەوەس ئەم شەرم و حەیایەی لە من دا پێکهێنابوو. لە بەر ئەوە لە لای دایەنەکەم کەمتر شەرمم دەکرد و تەنیا ئەو بوو کـە بە من رادەگـەیشـت. ـ لەوانەیە دایەنم لـە سـەر ئـەم بڕوایە بوو کـە چارەنووس وابوە، ئەسـتێرەکەی ئەوە بوە. جگە لـەوە ئەو بە نەخـۆشی من هەلی بۆ دەرەخـسـا و هـەمـوو دەردی دڵی نێـو مـاڵ، خـۆشـی، شـەر و کێشـەکان و رووحی ساویلکە و لە بنەوەبڕ و خـوازەڵۆکی بۆ من لێکدەداوە و دڵپرییـەک کە لە بووکـەکەی هـەیبوو و دەتکوت هـەوێیـەتی و خۆشـەویستی و هـەوەسـی کـورەکـەی لەو دزیبـوو، بە چ رقـێکەوە دەیگێـڕاوە! دەبێ بووکەکەی جوان بێ، من لە دەربیجەی روو بە حەسار ئەوم دیتوە، چاوەی قاوەیی، پرچی کاڵ و کەپۆیەکی چووکی باریکی هەیە.

دایەنم هەندێک جار باسی مـوعجـزەی پێـغـەمـبـەرانی بۆ دەکـردم، بە خەیاڵی خۆی دەیەویست بەم جۆرە دڵخـۆشیم داتەوە. بەڵام من ئێرەییم بە بیری تەسک و گـەوجی ئەو دەبرد. وا هـەبوو قسـەی بۆ دێنـامـەوە، بۆ وێنە چەند رۆژ لەمـەوبەر بـە منی کوت کە کچـەکەم ( یانی ئەو سـەڵیتـەیە ) بە سـلامـەتییـەوە کـراسـی قیـامـەت بۆ منداڵـەکەی دەدروێ، بۆ منداڵی خـۆی. دوایە، وەک ئـەوەی کـە ئەویش دەیزانـی دڵخـۆشی دەدامــەوە. جـارجـارە دەچێ لە دەرک و جیران دەوا و دەرمانم بۆ دێنێ، دەچێتە لای جادووگەر و فـاڵگر، کـتـێب دەگـرێتـەوە و سـەبارەت بە مـن مـشـووریان لێـدەخـوازێ. چوارشـەنبـەی ئاخـری سـاڵ چووبوە شـەمـۆلە و قـاپێکی هێناوە کـە پیـواز، برینـج و رۆنی بۆگـەنیـوی تێـدابوو ـ کـوتی سـواڵی ئەوانـەم بە نیــەتی





سلامەتی تۆ کردوە و هەموو ئەو گەند و گەلاشانەی بە دزی دەرخواردی من دەدا. بەین بەینەش دێمکراوەکانی حەکیمی دە ورگم دەکرد، هەر ئەو دێمکراوە بێ تامانەی کە بۆی نووسیبووم: زووفا، روبی سۆس، کافوور، پەرسیاوەش، بەیبوون، رۆنی قاز، تۆوی کەتان، تۆوی سنەوبەر، نیشاستە، شیوەران و هەزار جۆرە سندانی دیکە...

چەند رۆژ لەمەوبەر کتێبێکی دوعای بۆ هێنابوومەوە کە بستێک تۆزی لە سەر بوو. نە تەنیا دوعا بەڵکەم هیچ چەشنە کتێب و نووسراوە و بیر و باوەڕی سپڵەکان بە کەلکی من نەدەهات. چ پێویستێکم بە درۆ و دەلەسەی ئەوان هەبوو، ئایا من خۆم ئاکامی زنجیرەیەک لە بەرەکانی رابوردوو نەبووم و ئەزموونی بە میراتیبراویان دە من دا نەمابوو؟ ئایا رابوردوو لە خودی من دا نەبوو؟ بەڵام هیچکات نە مزگەوت و نە دەنگی بانگ و نە دەسنوێژ و کخە و تف رۆکردن و داهاتنەوە و هەستانەوە لە بەرامبەر توانای مەزن و خاوەن دەستەڵاتی تەواو کە دەبێ بە زمانی عەرەبی قسەی دەگەڵ بکردرێ کاری تێنەکردووم. ئەگەرچی پێشتر لەمە، کاتێک کە سلامەت بووم چەند کەڕەت بە زۆر چوومە مزگەوت و حەولم دەدا کە دڵم دەگەڵ خەڵکی دیکە یەکڕەنگ و یەکدەنگ بکەم، بەڵام چاوم لە سەر کاشیە شینەکان و نەقش و نیگاری دیواری مزگەوت دەگەڕا کە منی بەرەو خەونی خۆش دەبرد و دەستبەجێ رێی خۆ دزینەوەم دەدیتەوە ـ لە کاتی دوعا کردن دا چاوەکانی خۆم دەبەست و بەری دەستم لە بەر چاوم رادەگرت ـ لەو شەوە دا کە بۆ خۆم ساز دەکرد وەک وشەگەلێک کە بەبێ بیر کردنەوە لە خەو دا دووپاتی دەکەنەوە، من دوعام دەخوێندەوە. بەڵام دەربڕینی ئەم وشانە لە قووڵایی دڵەوە نەبوو. چونکە من پتر پێم خۆش بوو دەگەڵ کەسێکی دۆست یا ئاشنا قسە بکەم هەتا دەگەڵ خودا، دەگەڵ توانای مەزن! چون خودا لە سەری من زیاد بوو.

کاتێک کە لە سەر نوێنێکی گەرم و شێدار خەوتبووم تەواوی ئەم مەسەلانە بە قەرا سەرە دەرزییەک بایەخیان بۆ من نەبوو و لەو کاتە دا نەمدەویست بزانم بە راستی خودایەک هەیە یا ئەوەکە تەنیا وێنەی





دەستەڵاتدارانی سەر زەویە کە بۆ پتەو کردنی دەستەڵاتی خودایی خۆیان و رووتاندنەوەی رەعیەتەکانی خۆیان سازیان کردوە ـ تەنیا دەمەویست بزانم شەو دەگەیەنمە سبەی یا نا ـ هەستم دەکرد لە ئاست مەرگ دا، مەزهەب و ئیمان و بڕوا چەندە سست و منداڵانە و تا رادەیەک جۆرە رابواردنێک بوو بۆ کەسانی ساغ و خۆشبەخت ـ لە ئاست راستەقینەی بە سامی مەرگ و ئەو حاڵەتە دڵتەزێنەی کە دەمگوزەراند، ئەوەی لە سەر سزا و پاداشتی رووح و رۆژی هەستانەوە بە منیان سەلماندبوو فریوێکی بێ تام بوو و ئەو دوعایانەی کە فێری منیان کردبوو، لە بەرامبەر ترسی مەرگ دا چ کارێکیان پێنەدەکرا.

نا، ترسی مەرگ بەرۆکی منی بەر نەدەدا ـ کەسانێک کە ژانیان نەچێشتوە لەو قسانە ناگەن ـ ئەوەندە هەست بە ژیان لە من دا زیاد ببوو کە چووکترین خۆشییەک قەرەبووی ساعەتگەلێکی درێژی خنکان و پەشۆکاویی دەکردەوە.

دەمدیت کە ژان و رەنج هەیە بەڵام بێ بەری لە هەر مانایەک بوو ـ من لە نێو سپڵەکان دا رەگەزێکی ون و نەناسراو بووم، وەها کە لە بیریان کردبوو پێشتر لەمە من بەشێک لە دونیای ئەوان بووم. شتێک کە بە سام بوو ئەوە بوو کە هەستم دەکرد نە زیندووی زیندووم و نە مردووی مردوو، تەنیا مردوویەکی بە جووڵە بووم کە نە پەیوەندیم بە دونیای زیندۆکانەوە هەبوو و نە لە فەرامۆشی و حەسانەوەی مەرگ کەلکم وەردەگرت.

..............................................................

سەری شەوێ کە لە سەر مەقەڵی ترپاک هەستام، لە دەربیچەوە روانیمە دەرێ، دارێکی رەش و دەرگای دوکانی گۆشتفرۆش کە گاڵە درابوو، دیار بوو ـ سێبەرە تاریکەکان، تێکەڵ یەک ببوون. هەستم دەکرد کە هەموو شت پووچ و کاتییە. ئاسمانی رەش و قیراوی وەک کۆنە دەوارێکی شڕ بوو کە بە ئەستێرەگەلێکی بێ ژمار دابێژدابێژ کرابێ. لەودەمە دا دەنگی بانگ بەرز بۆوە. بانگێکی ناوەخت بوو. گۆیا ژنێک، لەوانەیە ئەو سەڵیتەیە خەریکی زان بوو، وەختی هاتبوو. نووزەی سەگێک





لە نێوان بانگی بەیانی دا دەبیسرا. بیرم کردەوە: « ئەگەر راستە کە هەر کەس ئەستێرەیەکی لە ئاسمان دا هەیە، ئەستێرەی من دەبێ دوور، تاریک و بێ مانا بێ ـ لەوانەیە من هەر ئەستێرەم نەبووبێ! »

لەو ئانە دا دەنگی دەستەیەک گەزمەی مەست لە کووچە بەرز بۆوە کە تێدەپەڕین و قسەی پیسیان بە یەک دەکوت. دوایە تێگڕا دەستیان بە گۆرانی کوتن کرد:

« وەرە بڕۆین و مەی بخۆین،
شەرابی ملْکی رەی بخۆین،
ئێستا نەخۆین ئەی کەی بخۆین؟ »

هەراسان خۆم کێشاوە دواوە، گۆرانیەکەیان بە چەشنێکی تایبەت لە هەوا دا دەنگی دەداوە، وردە وردە دەنگیان دوور بۆوە و بڕاوە. نا، ئەوان کاریان بە من نەبوو، ئەوان نەیاندەزانی... دیسان بێدەنگی و تاریکی هەموو جێی داگرتەوە ـ من پیسۆزی ژوورەکەم هەڵنەکرد، پێم خۆش بوو لە تاریکایی دا دانیشم ـ تاریکی، ئەو مادە خەست و خزە کە دەپژێتە هەموو جێ و نێو هەموو شتێکەوە. من خووم پێگرتبوو ـ لە تاریکی دابوو کە بیرە ونبووکانم، ترسە لە بیرکراوەکانم، بیری بە سامی سەیر کە نازانم لە کام سووچی مێشکم دا حەشار درابوون، هەموو سەرلەنوێ دەبووژانەوە، وەڕێ دەکەوتن و زارەخوارکێیان لێدەکردم ـ قونیچکی ژوور، پشت پەردە، پەنا دەرکە، پڕ بوون لەو بیرانە و لەو تارمایی بێ نموود و بە هەڕەشانەیان.

لەوێ لە پەنا پەردە تارماییەکی بە سام دانیشتبوو. جووڵەی نەدەکرد، نە مات بوو و نە خۆشحاڵ. هەر جارەی کە دەگەڕامەوە دەیڕوانیە نێو گلێنەی چاوم ـ سیمای بۆم ناسیاو بوو، دەتکوت هەر لە منداڵییەوە ئەو سیمایەم دیتوە ـ ڕۆژێکی سێزدەبەدەر بوو، لە پەنا چۆمی سوورێن دەگەڵ منداڵەکان قەرەقەرێنمان دەکرد، ئەو سیمایەم دیت کە دەگەڵ سیما ئاساییەکانی دیکە کە بەژنێکی کورتەڵەی نالەبار و بێ مەترسی هەبوو، لێم پەیدا ببوو ـ سیمای هەر وەک پیاوە گۆشتفرۆشەکەی بەر دەربیچەی





دیوەکەم بوو. پێموایە ئەم کەسە لە ژیانی من دا دەستی هەبوە و ئەوم زۆر دیبوو ـ دەتکوت ئەم سێبەرە دەگەڵ من دوانە بوو و لە جەغزی تەنگەبەری ژیانی من دا هەڵکەوتبوو...

هەر کە هەستام پیسۆزەکە هەڵکەم تارماییەکەش خۆبەخۆ ون و بزر بوو. چوومە پێش ئاوێنە لە خۆم خورد بوومەوە، وێنەیەک کە کەوتە سەری لام بێگانە بوو ـ سەیر و بە سام بوو. وێنەی من لە خۆم بە هێزتر ببوو و من وەک وێنەی سەر ئاوێنەم لێهاتبوو ـ پێموابوو نەمدەتوانی دەگەڵ وێنەی خۆم تەنیا لە ژوورێک دا بمێنمەوە. دەترسام ئەگەر راکەم ئەو وە دوام بکەوێ، وەک دوو پشیلە کە بۆ شەڕ تووشی یەک دەبن. بەڵام دەستم هەڵێنا، بەر چاوم گرت هەتا لە چاڵی دەستم دا شەوی هەرمان ساز کەم. زۆر جار حاڵەتی ترس، کەیف و مەستییەکی تایبەتی بۆ من هەبوو وەها کە سەرم دەگێژەوە دەهات و ئەژنۆکانم سست دەبوون و دەمەویست بڕشێمەوە ـ لەپڕ دیتم لە سەر پێیەکانم راوەستابووم ـ ئەوەم پێ سەیر بوو، موعجزە بوو ـ چلۆن من دەمتوانی لە سەر پێیەکانم راوەستابم؟ پێموابوو ئەگەر یەکێک لە پێیەکانم جووڵاندباوە هاوسەنگیم تێکدەچوو، جۆرێک سەرەگێژەم لێ پەیدا ببوو ـ زەوی و بوونەوەرانی لە رادەبەدەر لێم دوور ببوونەوە. وەها کە بە نەهێنی ئاواتی بوولەرزە یا برووسکەیەکی ئاسمانیم دەخواست بۆ ئەوەی کە بتوانم دیسان لە دونیایەکی ئارام و روون دا لە دایک ببمەوە.

کاتێک ویستم بچمەوە نێو جێگاکەم چەند کەڕەت بە ورتە کوتم: «مەرگ... مەرگ... » لێوەکانم بەسرابوون، بەڵام لە دەنگی خۆم ترسام ـ هەر بوێریی جارانم نەمابوو، وەک ئەو مێشانەم لێهاتبوو کە سەرەتای پایز شاڵاو بۆ ژوور دێن، مێشگەلێکی کەسیرە و بێگیان کە لە وزەی باڵی خۆیان دەترسن. ماوەیەک بێ جووڵە لە سووچێکی دیوار مات دەبن، هەر کە دەزانن زیندوون بەبێ ترس خۆ بە دەرک و دیوار دادەدەن و بە مردوویی لە دەورووبەری وەتاغ دەکەون.

پێڵووکانی چاوم کە وێک دەهاتن، دونیایەکی سڕاوە لە بەرامبەرم





پەیدا دەبوو، دونیایەک کە هەمووی خۆم سازم کردبوو و دەگەڵ بیر و روانگەم دەیخوێندەوە. بە هەر حاڵ زۆر راستەقینەتر و سروشتیتر لە دونیای بێداریم بوو. وەک ئەوەکە هیچ بەرگر و بەندێک لە بەرامبەر بیر و روانگەم دا نەبوو، کات و شوێن مانایان نەدەما ـ ئەم هەستەی هەوەسی کوژراو کە خەو سەرچاوەی لەوەوە بوو، سەرچاوەی لە نیازەکانی شاراوەی منەوە بوو شکڵ و رووداوەکانی سەرسورهێنەر بەڵام ئاسایی دێنا بەر زەینی من و دوای ئەوەکە لە خەو هەڵدەستام، لە هەمان کات دا هێشتا لە بوونی خۆم شکم هەبوو، لە زەمان و شوێنی خۆم بێخەبەر بووم ـ دەتکوت ئەو خەونانەی کە دەمدیتن هەموویان بۆ خۆم سازم کردبوون و لێکدانەوەی دروستی ئەوانم پێشتر دەزانی.

گەلێک لە شەو تێپەڕ ببوو کە خەوم لێکەوت. لە نەکاو دیتم لە کووچەکانی شارێکی نەناسیاو کە خانووی سەیر و سەمەرەی بە شکڵەکانی هەندەسی، مەنشوور، مەخرووتی، موکەعەب، کە دەربیچەی کورت و تاریکیان هەبوو و بە دەرک و دیواریان دا لاولاو هەڵچوو بوو، بە ئازادی دەگەڕام و بە راحەتی پشووم دەدا. بەڵام خەڵکی ئەو شارە بە مەرگێکی نائاسایی مردبوون. هەموو لە سەر جێی خۆیان ویشک هەڵاتبوون، دوو دڵۆپ خوێن لە زاریانەوە هەتا سەر جلەکانیان هاتبوە خوار. دەستم لە هەر کەس دەدا، سەری هەڵدەکەندرا و دەکەوت.

گەیشتمە بەر دوکانی گۆشتفرۆشییەک دیتم پیاوێک وەک پیرەمێردی وردەواڵەفرۆشی بەر ماڵەکەمان شاڵگەردنی بەستوە و کێردێکی بە دەستەوە بوو و بە چاوە سوورهەڵگەڕاوەکانی وەک ئەوەکە پێڵووکانیان بڕیبێ زەق چاوی تێبڕیبووم، ویستم کێردەکەی لە دەست بستێنم، سەری هەڵکەندرا و کەوتە زەوی، من لە ترسان هەڵاتم، بە کووچەکان دا هەڵدەهاتم هەر کەسم دەدیت لە سەر جێی خۆی ویشک ببوو ـ دەترسام ئاوڕ دەمەوە، کە گەیشتمە بەر ماڵی باوکی خێزانم، ژن براکەم، برا چکۆڵەی ئەو سەڵیتەیە لە سەر سەکۆ دانیشتبوو، دەستم لە گیرفانم نا و دووکولیچەم دەرهێنا، ویستم بیدەمە دەستی بەڵام هەر دەستم وێیکەوت





سەری هەڵکەندرا کەوتە زەوی. من قیژاندم و وە خەبەر هاتم.

هێشتا تاریک و روون بوو، دڵم گیرا بوو، وامدەزانی میچ قورساییم لە سەر دەکا، دیوارەکان زۆر ئەستوور ببوون و سینگم دەیەویست بتەقێ. سۆمای چاوم نەمابوو. ماوەیەک بە ترسەوە لە کاریتەکان زەق بوومەوە، ئەوانم دەبژارد و سەرلەنوێ دەمبژاردنەوە. هەر کە چاوم وێکنا تەقەی دەرکە هات، نەنە هاتبوو گەسک لە ژوورەکەم بدا، بەرچایی منی لە وتاغی باڵەخانە دانابوو، من چوومە باڵەخانە لە بەر پەنجەرەی شووشەبەند دانیشتم، لە سەرەوە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆشی بەر ژوورەکەم دیار نەبوو، تەنیا لە لای چەپ، پیاوی گۆشتفرۆشم دەدیت، بەڵام ئاکاری ئەو لە دەربیجەی ژوورەکەمەوە بە سام، سەنگین و وریایانە بوو، لەم سەرەوە پەست و بێچارە دیاری دەدا، وەک ئەوەکە ئەو پیاوە نابێ پیشەی گۆشتفرۆشی بووبێ و ئەدای دەرهێناوە ـ بارگینە رەش و لاوازەکانیان کە لە هەر لایانەوە دوو کەلاکی مەڕ هەڵواسرابوو و ویشک و قووڵ دەکۆخین، هێنان. پیاوی گۆشتفرۆش دەستی چەوری بە سمێڵ داهێنا، کڕیارانە تێیانیڕوانی و دوو دانە لەوانی بە زەحمەت هەڵگرت و بە چنگاڵی دوکانەکەیەوە هەڵواسی ـ دەستی بە سەر مەڕەکان دا دەهێنا، لەوانەیە شەوێش کە دەست لە بەدەنی ژنەکەی دەدا مەڕەکانی وەبیر دەهاتنەوە و فکری وەی دەکردەوە کە ئەگەر ژنەکەی کوشتباوە چەندەی پارە وەگیر دەکەوت.

گەسک لێدان کە تەواو بوو گەڕامەوە دیوەکەم. تەمایەکم گرت ـ تەمایەکی ترسناک، چووم لە خەڵوەتی ژوورەکەم کێردێکی دەسک نێرۆیی کە هەمبوو لە مجریم دەرهێنا، بە داوێنی عەباکەم تیغەکەیم خاوێن کردەوە و لە بن باڵنجەکەم نا ـ ئەو تەمایەم لە زۆوە گرتبوو ـ بەڵام نازانم چم لەو پیاوە گۆشتفرۆشە دا دیتبوو کاتێک رانی مەڕی کوت کوت دەکرد، دەیکێشا، دوایە بە شانازیەوە تێیدەڕوانی کە منیش لە خۆڕا هەستم کرد دەمەوێ لاسای بکەمەوە. پێویستم بوو کە ئەو کەیفە بکەم ـ لە دەربیجەی دیوەکەمەوە دە نێو هەورەکان دا کونێکی شینی قووڵ دیار بوو، وام دانا





بۆ ئەوەی کە بتوانم بگەمە ئەوێ دەبێ لە پەیژەیەکی زۆر درێژ وەسەرکەوم. لێواری ئاسمان بە هەوری زەردی خەستی مەرگاوی داپۆشرابوو، وەها کە لە سەر تەواوی شار قورساییان دەکرد. ـ

هەوایەکی بە سام و پڕ لە کەیف بوو، نازانم بۆچی من بۆ لای زەوی دادەهاتمەوە، هەمیشە لەو هەوایە دا وەبیر مەرگ دەکەوتمەوە. بەڵام ئێستا کە مەرگ بە چڕ و نێوچاوانی خوێناوی و دەستە رەقەڵەکانی ئەوکی گرتبووم، هەرئێستا بەس تەمام گرت ـ بەڵام تەمام گرتبوو کە ئەو سەڵیتەش دەگەڵ خۆم بەرم هەتا دوای من نەڵێ: « خودا عافووی کا، راحەت بوو! »

لەو دەمە دا بە بەر دەربیچەی وەتاغەکەم دا تابووتێکیان دەبرد کە سەرەکەیان بە رەش داپۆشیبوو و لە بان تابووت شەمیان هەڵکردبوو: دەنگی « لا الە الا اللە » سەرنجی راکێشام ـ هەموو دوکاندارەکان و رێبوارەکان لە رێی خۆیان دەگەڕانەوە و حەوت هەنگاو بە دوای تابووت دا دەڕۆیشتن. تەنانەت پیاوی گۆشتفرۆشیش هات و بۆ خێر حەوت هەنگاو بە دوای تابووت دا رۆیشت و گەڕاوە سەر دوکانەکەی. بەڵام پیرەمێردی خوانچەدار لە سەر جێی خۆی نەبزووت ـ هەموو خەڵک چ قیافەیەکیان بە خۆوە گرتبوو! لەوانەیە وەبیر فەلسەفەی مەرگ و دونیای دیکە کەوتبوونەوە ـ دایەنم کە دێمکراوەی بۆ هێنام دیتم نێوچەوانی تێکناوە، دەنکەکانی تەسبێحێکی درێژی کە بە دەستیەوە بوو دەیهاویشت و زیکری دەکرد ـ دوایە نوێژی لە پشت دەرکی دیوەکەی من دابەست و بڵیند بڵیند دەیکوت « اللهم، الللهم . . . »

دەتکوت من کاربەدەستی لێبوردنی مردووکان بووم! ـ بەڵام تەواوی ئەو گاڵتەجاڕییانە لە من دا چ شوێنێکیان دانەدەخست. بە پێچەوانە کەیفخۆش دەبووم کە سپڵەکانیش ئەگەرچی کاتی و بە درۆ بەڵام لانی کەم چەند چرتەیەک دونیای منیان تێپەڕ دەکرد ـ ئایا وەتاغی منیش تابووتێک نەبوو، نوێنەکەم ساردتر و تاریکتر لە گۆڕ نەبوو؟ نوێنێک کە هەمیشە راخرابوو و بۆ خەوتن بانگی دەکردم! چەند جار وام بە مێشک دا هات کە





لە تابووت دام ـ شەوانە دیوەکەم پێ چووک دەبۆوە و ڕێکی دەکوشیم. ئایا لە گۆڕ دا هەر ئەو هەستەی ناکەن؟ ئایا کەسێک لە هەستی دوای مەرگ خەبەری هەیە؟

ئەگەرچی خوێن لە لەش دا دەوەستێ و دوای شەو و ڕۆژێک هەندێک لە ئەندامەکان دەست بە رزان دەکەن بەڵام هەتا ماوەیەک دوای مەرگ تووکی سەر و نینۆک دێنەوە ـ ئاخۆ هەست و بیریش دوای ڕاوەستانی دڵ دەفەوتێن و یا هەتا ماوەیەک لە پاشماوەی خوێنێک کە لە هەندێک ڕەگی چووکی دان درێژە بە ژیانێکی شاراوە دەدەن؟ هەستی مەرگ خۆی جێی ترسە چ بگا بەوەی کە هەست بکەن مردوون! پیرگەلێک هەن کە بە بزەوە دەمرن، وەک ئەوەکە خەو بیانباتەوە یا وەک پیسۆزێک کە دەکووژێتەوە. بەڵام لاوێکی بە خۆوە کە لەپڕ دەمرێ و هەموو هێزی ئەندامەکانی لەشی هەتا ماوەیەک بەربەرەکانی و دژایەتی مەرگ دەکەن چ هەستێکی دەبێ؟

زۆر جار بیرم لە مەرگ و رزانی زەرڕەکانی لەشم کردبۆوە، وەها کە ئەم بیرە منی نەدەترساند ـ بە پێچەوانە ئاواتی بە ڕاستیم بوو کە تەرت و تونا بم، لە تەنیا شتێک کە دەترسام ئەوە بوو کە زەرڕەکانی لەشم، بچێتە نێو زەرڕەکانی لەشی سپڵەکانەوە. ئەو بیرەم لە بەر گران بوو ـ هەندێک جار پێمخۆش بوو دوای مەرگ دەستێکی درێژ و بە هەستم هەبا هەتا توانیبام هەموو زەرڕەکانی لەشی خۆم بە وردی کۆ کردباوە و بە دوو دەستان پاراستبام تا زەرڕەکانی لەشی من کە هی منن نەچنە نێو لەشی سپڵەکانەوە.

هەندێک جار بیرم دەکردەوە ئەوەی کە من دەمدیت، ئەو کەسانەی کە خەریکی ئاویلکەدانن ئەوانیش دەیبینن. دڵەکوتە و ترس و تاسە و ویستی ژیان لە من دا دامرکابوو، لە فڕێدانی بیر و بڕوایەک کە دە مێشکم ئاخندرابوو هێمنایەتییەکی تایبەتم هەست پێدەکرد. تەنیا شتێک کە دڵی دەدامەوە هیوای فەوتانی دوای مەرگ بوو ـ بیری دەست پێکردنەوەی ژیان دەیترساندم و ماندووی دەکردم ـ من هێشتا خووم بەو دونیایەی کە تێی دا دەژیام نەگرتبوو، دونیای دی بە چ کەلکم دێ؟ هەستم دەکرد ئەو





دونیایە بۆ من نەبوو، بۆ تاقمێک مرۆڤی بێحەیا، رووهەڵمالاو، سواڵکەر، زانستفرۆشی چێودار و چاو و دڵ برسی بوو ـ بۆ کەسانێک کە بە قەرا حاڵی دونیا ئافرابوون و لە زۆردارانی زەوی و ئاسمان وەک سەگی برسی بەر دوکانی گۆشتفرش بۆ کوتە گۆشتێک کلکەسووتەیان دەکرد، سواڵیان دەکرد و کیسەیان دەکێشا ـ بیری دەست پێکردنەوەی ژیان منی دەترساند و ماندووی دەکردم ـ نا، من پێویستییەکم بە دیتنی ئەو هەموو دونیا بە بێزە و ئەو هەموە چرونێوچاوانە تاڵە نەبوو ـ مەگەر خودا هێندە نەدی و بدی بوو کە دونیاکانی خۆی لە کن من هەڵکێشێ؟ بەلاّم من ناتوانم بە درۆ پێی هەڵبلێم و ئەگەر دەبوا ژیانێکی نوێم هەبا، ئاواتم ئەوە بوو کە بیر و هەستم سڕ و کول بووبا. بێ زەحمەت هەناسەم هەڵکێشابا و بێ ئەوەی هەستم بە ماندوو بوون کردبا، توانیبام لە ژێر سێبەرەکانی مەعبەدێکی لینگەم ژیانم تێپەڕ کردبا ـ گەڕابام وەها کە خۆر لە چاوی نەدابام. قسەی خەڵک و دەنگی ژیان گوێی ئازار دەدام.

.........................................................

هەرچی پتر دەچوومە نێو خۆمەوە، وەک ئەو گیاندارانەی کە زستانانە لە کونێک دا خۆ دەشارنەوە، دەنگی خەڵکم بە گوێ دەبیست و دەنگی خۆم لە گەرووم دا دەبیست ـ تەنیاییەک کە لە پشت سەرم خۆی حەشاردابوو وەک شەوە ئەزەلیەکان خەست و زەنگ بوو، شەوانێک کە تاریکییەکی چەسپ، خەست و ئاهۆداری هەیە و چاوەڕوانن بە سەر سەری شارە چۆلەکان دا کە پڕ لە خەونی بە هەوەس و قین دابکەون ـ بەلاّم من لە ئاست ئەو گەروویەی کە بۆ خۆم بووم پتر لە جۆرێک سەلماندنی گشتی و شێتانە چی دیکە نەبووم ـ هێزێک کە لە کاتی جووت بوون بۆ زاوزێ، دوو کەس لە بەر وەلانانی تەنیایی بە یەکەوە دەنووسێنێ لە ئاکامی ئەو لایەنە شێتانەیە، کە لە هەر کەسێک دا هەیە و هاوڕێ دەگەڵ داخێکە، کە بە شێنەیی بەرەو ناخی مەرگ خۆ کل دەکاتەوە...

تەنیا مەرگە کە درۆ ناکا!

بوونی مەرگ هەموو خەیاڵێک تەرت و تونا دەکا. ئێمە منداڵی مەرگین





و مـەرگـە کە ئێمـە لە دەلەسـەکـانی ژیان رزگـار دەکـا و لە بنی ژیان دا ئەوەکـە بانگمـان دەکـا و بۆ لای خـۆی دەمـانکێشـێ ـ لەو تەمـەنانـە دا کە ئێمـە هێشـتـا لە زمـانی خـەڵک ناگـەین ئەگـەر هەندێک جـار لە کـاتی کـایە کـردن دا مـات دەبین، بۆ ئەوەیە کـە دەنگی مـەرگ ببـیـسـین ... و لە تەواوی مـاوەی ژیان دا مـەرگە کە ئیشـارەمان پێدەکـا ـ ئایا بۆ هـەر کـەسێک رووی نەداوە کـە لە پڕ و بێ هیچ هۆیـەک دە بیـرەوە بچێ و ئەوەنـدە لە بیـری دا نوقم بێ کە لـە زەمـان و مـەکـانی خـۆی بێ خـەبەر بێ و نەزانـێ کـە بیـر لە چی دەکـاتەوە؟ ئـەودەم دوایە دەبێ حـەول بدا بۆ ئەوەکـە دەگـەڵ بارودۆخ و دونیای رواڵەتی خۆی دیسان ئاگا و ئاشنا بێتەوە ـ ئەمە دەنگی مەرگە.

لەم نوێنـە نمدارە دا کـە بۆنی ئارەقـەی گـرتوە، کـاتێک کـە پێڵـووکـانی چاوم قورس دەبوون و دەمەویست خۆم تەسلیمی نەبوون و شەوی هەرمان بکەم ، هـەمـوو یادگـارە ونەکـان و ترسـە لـە بیـر کـراوەکـانم ، لـە سـەڕا دەبووژانـەوە: ترسـی ئـەوەکـە تووکـەکـانی باڵینج ببنە تیـغی خـەنجـەر، دوگمەی عەباکەم لە رادە بەدەر گەورە، بە قەرا بەرداشی لێبێ ـ ترس لەوە کە کوتە نانێک کە دەکەوێتە زەوی وەک شووشە بشکێ ـ نیگەرانی لەوە کە ئەگـەر خـەوم لێبکەوێ پیـسـۆز بکـەوێتـە سـەر زەوی و شـار ئاگـر بگرێ، وازوازی لەوە کە پێیـەکانی سـەگی بەر دوکانی گۆشـتفرۆش وەک سـمی ئەسپ دەنگ بداتـەوە، دڵەکوتە لەوە کە پیرەمێـردی وردەواڵەفرۆش لە بەر خـوانچـەکـەی پێبکـەنـێ، ئەوەندە پێبکەنێ کە نەتوانێ بـەری دەنگی بگـرێ، ترس لەوە کـە کـرمی نێـو حـەوزی مـاڵەکـەمـان ببـێتـە مـاری هیندیی، ترس لەوە کە نوێنەکەم ببێتە بەردی قەبر و بە لاولاوە لە سەر خۆی بگەڕێ و من داپۆشـێ و ددانـە مـەڕمـەڕینـەکـان لێک قـفڵ کـرێن، خـۆف لـەوە کـە دەنگم بگیرێ و هەرچی هاوار بکەم کەس بە فریام نەگا ...

من ئارەزووم دەکرد منداڵی خـۆم وەبیر بێتەوە، بەڵام کاتێک کە دەهـات و هەستم پێدەکرد وەک ئەودەم سەخت و ناخۆش بوو!

کۆخـەیەک کـە وەک کۆخـەی بارگینـە رەش و لاوازەکـانی بەر دوکـانی گۆشتـفرۆش بوو، فڕێ دانی بە نـاچاری بەڵغەم و ترس لەوە کە نەکا پەڵە





خـوێنی تێـدابێ ـ خـوێن ـ ئـەم ئاوەکـییـە شـیلەوتـین و سـوێرە کە لـە بنی لەشـەوە دێتـە دەر، کە شـیرەی ژیانە و ناچار دەبی بیـهێنیـەوە و هـەڕەشـەی هـەمیشـەیی مـەرگ کە هـەموو بیـرەکان بێ هیوای گـەڕانـەوە پێشـێل دەکا و تێدەپــەڕێ بێ ترس و خۆف نەبوو.

ژیان بە خوێنسـاردیی و بێمەیلی سیمای هەر کەس بە خۆی دەنوێنێ، گۆیا هـەر کـەس چەند سـیمای بۆ خۆی هـەیە ـ هـەندێک کەس تەنیـا یەکێک لەو سـیـمـایانە دەکـار دەکـا کـە ئاشکرایە چڵکن دەبـێ و چین و چرووک هـەڵدەگـرێ، ئەم تاقـمـە بە ئابوورن ـ دەسـتـەیەکی دیکە سـیـمـاکـەیان بۆ زاوزێ هـەڵدەگـرن و هـەندێک دایم و دەرهـەم سـیـمـایان دەگـۆڕن بەڵام هـەر کەمێک تەمـەنیان چوە سـەر تێدەگـەن کە ئەمە دوایین سـیـمـایان بوە و بەم زوانە کـۆن و خـراپ دەبێ، ئەودەم سـیـمـای راسـتـەقینەی ئـەوان لە پشت دوایین سیمایان دێتە دەر.

نازانم دیوارەکانی ژوورەکەم چ شـتێکی ژەهراویان پێبوو کـە بیرەکانی منیـان دەرمــانداو دەکــرد ـ من دڵنیــا بووم کــە بەر لـە من کــەســێـکی خــوێنگرتوو، کــەســێکی شـێـتی پـەتیــارە لەم ژوورە دا بوە، نـە تەنیــا دیوارەکـانی ژوورەکــەم، بەڵکەم دیمەنی دەرێش، پیـاوی گــۆشــتـفـرۆش، پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش، دایەنەکەم، ئەو سەڵیتـەیە و هـەموو ئەوانەی کە دەمـدیتن و هـەروەتر قـاپی ئاشـێک کـە ئاشی جـۆم تێـدا دەخـوارد و ئەو جلانەی کـە دەبەرم دابوون هـەمـوو ئەوانـە دەسـتـیـان دابـوو دەست یەک بۆ ئەوەی کە ئەم بیـرانە لە من دا سـاز بکەن. ـ چەند شـەو لەمــەوبەر هـەر لە شانشینی حـەمام جلەکانم داکەندن بیرەکانم گۆڕدران. دەلاک کە ئاوی بە سـەرم دادەکرد وەک ئەوە بوو کـە بیـرە رەشـەکانم دەشـۆرانەوە. لە حـەمـام سـێبـەری خـۆم لـە سـەر دیواری تەڕی ئارەقـاوی دیت، دیتم هـەر ئەوەندە ناسک و تەسک بووم کە دە سـاڵ لـەمـەوپێش ئەودەم مـنداڵ بووم، دروست لە بیرمـە سێبەری لەشم هـەر ئاوا دەکەوتە سەر دیواری ئارەقاوی حـەمام. لە لەشم خـورد بوومـەوە، ران، بـەلەک و نێوگـەڵم حـاڵـەتێکی هـەوەسـباری هیـوابڕاوی هـەبوو. ـ سـێـبــەری ئەوانیش وەک دە سـاڵ پێش بوو، وەک





ئەودەم کە منداڵ بووم ـ هەستم کرد کە هەموو ژیانی من وەک سێبەرێکی سەرگەردان، سێبەرە لەرزۆکەکانی سەر دیواری حەمام بێ مانا و بێ ئامانج تێپەڕ بوە. بەڵام خەڵکی دیکە قورس، پتەو و مل ئەستوور بوون. لەوانەیە سێبەری ئەوان تۆختر و گەورەتر دەکەوتە سەر دیواری ئارەقاوی حەمام و هەتا ماوەیەک شوێنیان هەر دەماوە لە حاڵێک دا سێبەری من دەستبەجێ پاک دەبۆوە ـ لە دەرێ کاتێک جلەکانم دەبەر کردەوە قیافە و بیرەکانم دیسان گۆڕان. دەتکوت چوومە شوێن و دونیایەکی نوێ، وەک ئەوەکە لەو دونیایەی کە لێی بێزار بووم دیسان لە دایک ببوومەوە، بە هەر حاڵ ژیانێکی دیکەم وە دەست خستبوو، چونکە پێم موعجزە بوو کە لە خەزنەی حەمام دا وەک کلۆ خوێیەک نەتوابوومەوە!

..........................................................

ژیانی خۆم هەر ئەوەندە نائاسایی، نادیار و باوەڕنەکراو هاتە بەر چاو کە نەقشی سەر قەڵەمدانێک کە پێی خەریکی نووسینم ـ دەتکوت کەسێکی نەقاشی شێت، لەخۆوە سەر بەرگی ئەم قەڵەمدانەی کێشاوەتەوە ـ زۆر جار کە چاو لەم نەخشە دەکەم وەک ئەوەیە کە دەیناسمەوە. لەوانەیە هەر لە بەر ئەم نەخشەیە... لەوانەیە ئەم نەخشە ناچارم دەکا کە بنووسم ـ دارێکی سەوڵ کێشراوەتەوە کە لە بنی پیرەمێردێکی کووڕ وەک جووکەکانی هیندووستان هەڵترووشکاوە، عەبای لە خۆوە پێچاوە و لە دەوری سەری مێزەری بەستوە بە سەرسوڕماوی ئەنگوستی شادەی دەستی چەپی لە زار ناوە. بەرامبەر ئەو کیژێک بە جلی رەشی درێژ بە رەوتی نائاسایی، لەوانەیە بوگام داسییەک بێ، سەمایە دەکا. گوڵێکی لاولاویشی بە دەستەوە گرتوە و لە نێوانیان دا جۆگە ئاوێک هەیە.

..........................................................

لە پای تریاک هەموو بیرە تاریکەکانم لە نێو دووکەڵی ناسکی ئاسمانی دا بڵاو کردەوە، لەو دەمە دا لەشم بیری دەکردەوە، لەشم خەونی دەدیت، دەخزا و وەک ئەوەکە لە قورسایی و پیسایی هەوا رزگار بوە و لە





دونیــایەکی نامــۆ دا کـە پڕ لە رەنگ و وێنەی نەناسـیـاو بوو هەڵدەفـڕی، ترياک رووحی گـیا، رووحی کـەم بزووتی گیـای لە لەشی من کـرد، من لە دونیای گیایی دا دەگەڕام ـ ببوومە گیا؟ بەڵام هەر وا کە لە پای مەقەڵی و سـفـرەی چەرم وێژینگم دەدا و عـەبام لە سـەر شـان بوو نازانم بۆ وە بیر پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش کەوتمەوە، ئەویش هەر ئاوا لە بەر خـوانچەکەی دەچەمــاوە و هـەر ئاواش هـەڵدەترووشکا. ئـەو بیــرە ترسی رێخـــســتم، هەسـتام عەبام فڕێ دا، چوومـە بەر ئاوێنە، روومـەتم سـوور هەڵگەڕابوو و رەنگی گـۆشــتی بەر دوکـانی گـۆشــتـفـرۆشی هەبـوو، ردێنم ئاڵۆز بەڵام حـاڵەتێکی رووحـانی و راکێشـەری بە خـۆوە گرتبـوو، چاوە نەخـۆشـەکانم حــاڵەتی مــاندوویی، تۆراو و منداڵانـەیان هەبـوو. وەک ئەوەکــە هـەمــوو شـتــەکـانی قـورسـی زەمــینی و خـەڵکی لە من دا تـوابوونەوە. خـۆشـم لە سیمـای خـۆم هات، جۆرە کـەیفـێکی هەوەسـبـارم بە خـۆم دەکرد؛ لە بەر ئاوێنە بە خـۆم دەکوت « ژانی تۆ ئەوەنـدە قووڵە کە لە بنی چاوت دا گیـری کردوە... و ئەگەر بگری یا فرمێسک بە پشت چاوت دا دێتە دەر یا ئەوەکە هەر نایەتە دەر! ... »

دوایە دیســان کـوتم « تۆ گـەوجی، بۆ زووتـر خـۆت خـلاس ناکـەی؟ چاوەڕێی چی... هێشـتـا چ تێرابینییـەکت مـاوە؟ مەگـەر قـاپی شـەراب دە خەڵوەتی ژوورەکەت دا نیە؟ ... قـومێکی بـخۆوە جا بزانـە چۆن دەفڕی! ... گەوج... تۆ گەوجی... دەگەڵ هـەوا قسـان دەکەم! »

ئەو بیرانەی بۆم ساز دەبوون پەیوەنـدیان بە یەکەوە نەبوو، دەنگی خۆم لە ئەوکم دا دەبیـست بەڵام لە مـانای وشـەکان نەدەگەیشـتم. لە سـەرم دا ئەو دەنگانە دەگـەڵ دەنگەکـانی دیکە تێکەڵاو دەبوون. وەک کـاتێک کـە یاوم هەبوو قـامکەکـانی دەسـتم گەورەتر دەهاتنە بەر چاوم. پێڵـووکـانی چاوم قـورسـاییـان دەکـرد. لێوەکانم ئەسـتـوور ببـوون. هـەر کە ئاوڕم داوە دیتم دایەنەکـەم لە نێـو چوارچێوەی دەرکـە دا راوەسـتـاوە. من قـاقـا پێکەنیم، سیمای دایەنەکەم بێ جووڵە بوو، چاوە کەم سۆماکانی لە من بڕیبوو بەڵام بێ واق وڕمـان یا تـووڕەیی و دامـاویی بوون ـ زۆر جـار کـارێکی گـەوجـانـە





پێکەنین دێنێ. بەڵام پێکەنینەکەی من قووڵتر لەوە بوو ـ ئەو گەوجایەتییە گەورەیە دەگەڵ ئەو هەموو شتانەی دیکە کە لە دونیا دا پێیان نەزاندراوە و تێگەیشتنیان زەحمەتە پەیوەندی هەبوو، ئەوەی کە لە بنی تاریکی شەوانە دا ون بوە، رەوتێکی بەرزتر لە بەشەر، مەرگ بوو. دایەنم مەقەڵی هەڵگرت و بە ئارامی وەدەرکەوت، من ئارەقەی نێوچەوانم سڕیوە. بەری دەستم پەڵەی سپی تێکەوتبوو، پاڵم وە دیوار دا. سەرم بە دیوارەوە نا دەتکوت حاڵم باشتر بوو. دوایە نازانم ئەو گۆرانیەم لە کوێ بیستبوو بە ورتە خوێندمەوە:

« وەرە بڕۆین و مەی بخۆین،
شەرابی مڵکی رەی بخۆین،
ئێستا نەخۆین ئەی کەی بخۆین؟ »

هەمیشە بەر لە دەست پێکردنی قەیران بە دڵم دا دەهات و دڵەکوتەیەکی تایبەتیم تێدا پێکدەهات ـ دڵەکوتە و حاڵەتێکی غەمێنەر بوو، وەک گریمانەیەک کە لە سەر دڵم کۆ بووبێتەوە ـ وەک هەوای بەر لە تۆفان ـ ئەودەم دونیای راستی لە من دوور دەبۆوە و لە دونیایەکی روون دا دەژیام کە مەودایەکی دوور و درێژی دەگەڵ دونیای زەمینی هەبوو.

لەودەمە دا لە خۆم دەترسام، لە هەموو کەس دەترسام، گۆیا ئەو حاڵەتە لە بەر نەخۆشی بوو. بۆیە بیرم کز ببوو. لە بەر دەربیچەی ژوورەکەم کە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش و گۆشتفرۆشم دیت ترسام، نازانم لە ئاکار و قیافەیان دا چ شتێکی ترسێنەر هەبوو. دایەنم شتێکی ترسێنەری بۆ گێڕامەوە. سوێندی بە پیر و پێغەمبەر دەخوارد کە دیتوویەتی پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش شەوانە دێتە باڵ ژنەکەم و لە پشت دەرکە بیستوویەتی کە سەڵیتە پێی کوتوە: « شاڵگەردنەکەت لێکەوە! » هیچ بە بیریشم دا نەدەهات ـ پێرێ یا بەسرپێرێ بوو کاتێک هاوارم کرد و ژنەکەم هات لە کەلێن ژوورەکەمەوە دیتم، بە چاوی خۆم دیتم کە جێ ددانی پیس، زەرد و کرماوی پیرەمێردێک کە لە نێوانی ئایەکانی عەرەبی دەهاتنە دەر لە سەر روومەتی ژنەکەم بوو ـ هەر بەراستی بۆچی ئەو پیاوە





لەوەتی من ژنم هێناوە لە بەر ماڵەکەمان پەیدا بوە؟ ئایا چلەکێش بوو، چلەکێشی ئەو سەڵیتەیە بوو؟ لە بیرمە هەر ئەو رۆژە چوومە بەر خوانچەی پیرەمێرد، نرخی گۆزەکەم پرسی. لە نێوان شاڵگەردنەکەی لە بن لێوی کەتی، دووو ددانی کرماوی هاتنە دەر و پێکەنی، کەنینێکی ویشک کە مچورکی بە لەش دادێنا و کوتی: « لە گۆترە دەیکڕی؟ ئەم گۆزەیە شایەنی نیە ها، کاکە بیبە خێری لێببینی! » من دەستم دە گیرفانم نا دوو درەم و چوار پەشیزم لە سووچی خوانچەکەی دانا، دیسان پێکەنی، کەنینێکی کرێتی کرد وەها کە مچوڕکی بە لەش دا دێنا. من لە شەرمان دەمەویست بتوێمەوە، بە دەستەکانم رووم داپۆشی و هاتمەوە.

لە تەواوی خوانچەکەی بەر دەستی بۆنی ژەنگی شتە چڵکنەکان دەهات کە ژیان وەلای نابوون. لەوانەیە دەیەویست شتی وەلانراوی ژیان بە رووی خەڵک داداتەوە. بە خەڵک نیشان بدا ـ ئایا بۆ خۆشی پیر و وەلانراو نەبوو؟ شتەکانی سەر خوانچەی هەموو مرد بوون، پیس و لەکارکەوتوو بوون. بەڵام چ ژیانێکی لاسار و چ شکڵ گەلێکی پڕ مانایان هەبوو! ئەو شتە مردوانە وەها شوێنیان لە سەر من داخست کە خەڵکی زیندوو نەیاندەتوانی لە من دا ئەوەندە شوێن دابخەن.

بەلام نەنە خەبەرەکەی پێدا بووم، بە هەموو کەسی کوتبوو... دەگەڵ سواڵکەرێکی چەپەڵ! دایەنەکەم کوتی جێ و بانی ژنەکەم ئەسپێی هەڵێناوە و خۆشی چۆتە حەمام ـ سێبەری ئەو لە سەر دیواری ئارەقاوی حەمام چۆن بوە؟ لەوانەیە سێبەرێکی هەوەسبار کە هیوای بە خۆی هەبوە. بەڵام بە گشتی ئەوجار سەلیقەی ژنەکەم پێ خراپ نەبوو، چونکە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش کەسێکی ئاسایی لووس و بێتام وەک ئەو پیاوە گوندارانەی کە ژنی حەکەدار و گەوج بۆ لای خۆیان رادەکێشن نەبوو ـ ئەم دەردانە؛ ئەم توێخە بەدبەختانەی کە لە سەر و رووی پیرەمێرد بەستبووی و چارەرەشییەک لە دەور و بەری ئەو دەباری، لەوانەیە بۆ خۆشی نەیدەزانی بەڵام ئەوی وەک نیوە خودایەک نیشان دەدا و بەم





خوانچە پیسەی کە لە پێشی بوو نوێنەر و نوێنگەی خوڵقان بوو.

بەڵێ جێی دوو ددانی زەردی کرماوی کە ئایە عەرەبیەکانیان لە نێوان دەهاتنە دەر لە سەر روومەتی ژنەکەم دیتبووم. هەر ئەو ژنەی کە منی بۆ لای خۆی رێ نەدەدا، کە منی سووک دەکرد بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەوانە خۆشم دەویست، سەرەڕای ئەوەکە هەتا ئێستا نەیهێشتبوو جارێک سەر لێوی ماچ بکەم! ـ

خۆرەتاوێکی زەرد بوو، دەنگی بە سۆزی نەقارە بەرز بۆوە. دەنگی لالانەوە و پارانەوەیەک کە هەموو خورافاتی بە میراتبراو و ترس لە تاریکی دەبزاوت. حاڵی قەیران، حاڵێک کە پێشتر بە دڵم دا هاتبوو و چاوەڕوانی بووم. تینێکی سووتێنەر سەرتاپێی داگرتم، خەریک بوو دەخنکام. چوومە سەر جێگاکەم درێژ بووم و چاوەکانم بەست ـ لە تاوی یاو وەک ئەوە بوو کە هەموو شتێک گەورە ببوون و پەڕاوێزیان لێ ببۆوە. میچ لە جیات ئەوەکە بێتە خوار چوو بوە سەر، جلەکانم رێکیان دەکوشیم. لە خۆڕا هەستام و لە سەر جێگاکەم دانیشتم، لە بەرە خۆمەوە کوتم:

« پتر لەوە ناکرێ... تاقەت ناهێنم... » لەپڕ بێدەنگ بووم. دوایە دەگەڵ خۆم تاق تاق و بەرز بە لەونێکی گاڵتەجاڕ دەمکوت: « پتر لەوە... » دوایە پێوەم دەنا: « من گەوجم! » من لە مانای ئەو وشانەی کە دەمکوتن تێنەدەگەیشتم، تەنیا بە لەرینەوەی دەنگی خۆم لە هەوا دا یاریم دەکرد. لەوانەیە لەبەر چارەسەر کردنی تەنیایی دەگەڵ سێبەری خۆم قسەم دەکرد ـ لەودەمە دا شتێکی سەیرم دیت ـ دەرکە کراوە و سەڵیتە هات. دیارە هەندێک جار وە بیر من دەکەوتەوە ـ دیسان جێی شوکرە ـ ئەویش دەیزانی من زیندووم و زەجر دەکێشم و نەختەنەختە دەمرم ـ جێی شوکور بوو ـ تەنیا دەمەویست بزانم کە ئایا دەزانێ لە بەر خاتری ئەوەکە من دەمردم ـ ئەگەر زانیبای ئەودەم ئاسوودە و خۆشبەخت دەمردم ـ ئەودەم من خۆشبەختترین کەسی سەر زەوی بووم ـ ئەو سەڵیتەیە کە هاتە ژوورەکەم بیرە خراپەکانم هەڵاتن. نازانم چ تیشکێک لە گیانی، لە ئاکاری دەپژا کە ئارامی کردم ـ ئەوجارە حاڵی باشتر بوو، قەڵەو و وێچوو ببوو ـ





کراسێکی بۆری دەبەر کردبوو، برۆکانی هەڵگرتبوو، خاڵی دانابوو، وەسمەی لە برۆ دابوو، سووراو سپیاوی کردبوو و کلی کێشابوو. بە کورتی کە هاتە ژوورەکەی من خۆی لە تەدارەک دابوو . دەتکوت لە ژیانی خۆی رازییە و لەخۆوە ئەنگوستی شادەی دەستی چەپی لە زار نا. ئایا ئەوە هەمان ژنی ناسک، هەمان کچی ناسکی ئاسمانی بوو کە جلی رەشی چینداری دەبەر دەکرد و لە پەنا چۆمی سوورێن قەرەقەرێنمان دەکرد، هەر ئەو کچەی کە حاڵەتی ئازادی منداڵانە و کاتیی هەبوو و بەلەکی بە هەوەسی لە ژێر داوێنی کراسەکەی دیار بوو؟ هەتا ئێستا کە چاوم لێدەکرد چاک تێنەدەگەیشتم، لەودەمە دا دەڵێی پەردەیەک لە بەر چاوم لادرا ـ نازانم بۆچی وە بیر مەڕەکانی بەر دوکانی گۆشتفرۆشی کەوتمەوە ـ ئەو بۆ من وەک پلە گۆشتێکی نەرمەی لێهاتبوو و چلۆنایەتی دڵڕفێنی پێشووی بە تەواوی لە دەست دابوو ـ ژنێکی وێچووی سەنگین و رەنگین ببوو کە دەیەویست بژی، ژنێکی تەواو عەیار! ژنی من! ـ بە ترس و سامەوە دیتم کە ژنەکەم گەورە بوە و پێگەیشتوە، لە حاڵێک دا کە خۆم وەک منداڵ مابوومەوە ـ راستێکەی لە رووی، لە چاوەکانی شەرمم دەکرد. ژنێک کە بێجگە لە من رێی بە هەمووکەس دەدا و من بە بیرەوەری خەیاڵی منداڵی ئەو، دڵخۆشی خۆم دەداوە. ئەودەمەی کە سیمایەکی ساویلکەی منداڵانە، حاڵەتێکی ون و تێپەڕی هەبوو و هێشتا جێ ددانی پیرەمێردی وردەواڵەفرۆشی کۆڵانی لە سەر روومەت نەدەدیترا ـ نا ئەم، ئەو کەسە نەبوو.

ئەو بە لاتاوەوە پرسی کە : « حاڵت چۆنە؟ » من وڵامم داوە: « ئایا تۆ ئازاد نی، ئایا هەر چیت کە پێ خۆشە نایکەی ـ چت بە سلامەتی من داوە؟ »

ئەو دەرکەی پێکدادا و رۆیشت. هەر نەگەڕاوە چاوم لێبکا ـ دەتکوت من شێوەی قسە کردن دەگەڵ خەڵکی دونیا، دەگەڵ خەڵکی زیندووم لە بیر چووبۆوە ـ ئەو، هەر ئەو ژنەی کە پێموابوو بێبەریی لە هەر چەشنە هەستێکە لەو کارەی من دڵی ئێشا! چەند جار ویستم هەستم برۆم و بە





ســەر دەست و پێی دابکەوم، بگریم، داوای لێبووردنی لێبکەم ـ بەڵێ بگریم، چونکە پێمـوابوو ئەگەر توانیبام گریابام راحـەت دەبووم ـ چەند دەقـیقـە، چەند سـاعەت، یا چەند سـەدە تێپـەڕی نازانم ـ وەک شـێتـانم لێهاتبوو و لـە دەردی خـۆم کـەیفم دەکرد ـ کـەیفێکی ئـەوپەڕی بەشـەریی، کـەیفـێک کـە تـەنیـا من دەمـتـوانی بیکەم و خـوداکـانیش ئەگـەر هەبان نەیاندەتوانـی هەتا ئەو رادەیە کـەیف بکەن.. ئەودەم پـەیم بە سـەرتر بوونی خـۆم برد، هەسـتم بە بەرزتر بوون لە سپڵەکان، لە سروشت، لە خـودایان کرد. خوداگەلێک کە ساز کراوی هەوەسی بەشـەرن ـ ببوومە خودایەک، لە خـوداش گەورەتر بووم، چونکە رەوتێکی هـەرمـان و بێ کۆتاییم لە خـۆ دا هەست پێدەکرد...

... بەڵام دیســان ئەو هاتەوە ـ ئـەوەندەش کـە پێـمـوابوو دڵڕەق نەبوو، هەسـتـام و داوێنیم مـاچ کرد و بە گریان و کۆخین خـۆم خسـتـە بەر پێی. رووم لە بەلەکی هەڵدەسـوو و چەند جـار بە ناوی راسـتـەقـینـەی بانگم کرد. وەک ئەوە بوو کـە ناوی راسـتـەقینـەی دەنگ و زەنگی تایبـەتی هەبوو. بەڵام دە دڵم دا؛ دە نێو دڵم دا دەمکوت: « سـەڵیتە... سـەڵیتـە! » ماسـولکەکانی پێی کـە تامی قـونگە هارۆیـان دەدا، تاڵ و نەرم و تفت بوون، لە بـاوەشـم کـردن. ئەوەندە گـریام، گریام، نازانم چەندەی کێشـا هەر وەخـۆ هاتمەوە دیتم ئەو رۆیشـتـوە. لەوانەیـە هەر سـاتێکی نەکێشـا کە هەمـوو کـەیف و لاواندنـەوە و ئێـشــەکـانی بـەشــەرم لە خـۆ دا هـەست پێکرد و هـەر وەک ئەودەم کە لە پای تریاک دادەنیشتم، وەک پیرەمێری وردەواڵەفرۆش کە لە پشت خــوانچـەکـەی دادەنیـشـێ، لـە بەر پیـسـۆزێک کـە دووکـەڵی دەکـرد مـابوومــەوە ـ لە ســەر جێم نەدەبزووتم، هەروا چاوم لە دووکـەڵی پیـسـۆز بڕیبوو ـ دوودە وەک بەفری رەش لە سەر دەست و رووم دەنیـشـتن. کـاتێک دایەنم قــاپێکی ئـاشی جــۆ و تەڕەپڵاوی فــرووجی بۆ هـێنام لـە ترســان هاواری کــرد، کـشــاوە دواوە و کـەشــەفــەکـەی لـە دەست بەربۆوە. من خۆشحـاڵ بووم کە لانی کەم بوومە هۆی ترسانی ئەو. دوایە هەسـتام سەر پڵیتەکەم هەڵپاچی و چوومە بەر ئاوێنە. دوودەکانم لە رووم هەڵدەسوو. چ





قیافەیەکی بەخۆف! بە قامکەکانم بن چاوم دەکێشا و بەرم دەدا، زارم دادەپچڕی، گوویم هەڵدەدا، بن ردێنم هەڵدێنا و لە دوو لاوە بام دەدا، ئەدام دەردێنا۔ سیمای من توانایی بۆ چ قیافەگەلێکی پێکەنینی و ترسناکی هەبوو. دەتکوت هەموو شکڵەکان، هەموو شوباری پێکەنینی، ترسناک و سەیر کە لە دەروونی من دا شاراوە بوو بەمجۆرە هەمووم بە ئاشکرایی دەدیت ـ ئەو حاڵەتانەم لە خۆ دا دەناسی و هەستم پێدەکرد و هاوکات پێکەنینم پێی دەهاتێ. هەموو ئەو قیافانە لەمن دا و هی من بوون. سیماگەلێکی ترسێنەر و پیاوکوژانە و پێکەنینی کە بە ئیشارەیەکی چووک دەگۆڕدران. ـ شکڵی پیرەمێردی قورئانخوێن، شکڵی گۆشتفرۆش، شکڵی ژنەکەم، هەموو ئەوانەم لە خۆ دا دیت. دەتکوت رەنگدانەوەی ئەوان لە من دا بوە ـ هەموو ئەو قەلافەتانە لە من دا بوون بەلام هیچکامیان هی من نەبوون. ئایا هەوێن و حاڵەتی سیمای من لە بەر هانەیەکی شاراوە، لە بەر وازوازیەکان، گانەکان و ناهومێدیەکانی بە میراتبراو ساز نەببوون؟ و من کە پارێزەری ئەم بارە میراتگرتوە بووم بە هۆی هەستێکی شێتانە و پێکەنینی، لە خۆوە بیرم نەیدەتوانی کە ئەم حاڵەتانە لە سیمام دا راگرێ؟ لە وانەیە تەنیا لە کاتی مەرگ دا سیمام لە بەندی ئەو بیرە رەشانە رزگار بێ و حاڵەتی ئاسایی کە دەبێ هەیبێ بە خۆی بگرێ.

بەلام ئایا لە دواین حاڵەتیش ئەو حاڵەتانەی کە هەمیشە ویستی گاڵتەجاڕی من لە سەر سیمام نەقشی کردبوو، شوێنی خۆی سەختتر و قوڵتر جێ نەدەهێشت؟ بە هەر حاڵ تێگەیشتم چ کارگەلێکم لە دەست دێ، پەییم بە توانایی خۆم برد. لەپڕ لە قاقام دا، چ قاقایەکی گڕ و کرێت و بەسام، وەها کە مچوڕکم پێدا هات. چونکە دەنگی خۆم نەدەناسیوە. وەک دەنگێکی لاوەکی، کەنینێک کە زۆرجار لە ئەوکم دا کۆ ببۆوە ـ لە بن گوێم بیستبووم لە گوێم دا دەنگی داوە ـ لەودەمە دا کۆخیم و کوتە بەڵغەمێکی خوێنین، کوتێک لە جەرگم کەوتە سەر ئاوێنە، بە سەری ئەنگوستم بە ئاوێنەم دا هێنا، هەر کە گەڕامەوە، دیتم نەنە رەنگ بزرکاو وەک تریفەی مانگ، پرچی ئاڵۆز و چاوی بێ سۆمای ترساوی، قاپێک ئاشی جۆ هەر





لەو ئاشـەی کـە بۆی هێنابووم لە سـەر دەسـتی بوو و بە مـاتی چاوی لێدەکردم. من دەستەکانم بە رووم گرت و چوومە پشت پەردەی خەڵوەتی و خۆم شاردەوە.

کـاتێک کـە ویسـتـم بخـەوم، ئاڵقـەیەکی ئاگـرین دەوری سـەری رێک دەکوشیم. بۆنی توند و پڕ هەوەسی رۆنی سەندەڵ کە لە پیسۆزم کردبوو بڵاو ببۆوە. بۆنی ماسولکەکانی پێی ژنەکەمی دەدا و تامی قونگە هارۆ بە تاڵاییەکی کەمەوە لە زارم دا بوو. دەستم بە لەشم داهێنا و لە مێشکم دا ئەندامەکانی لەشم: ران، بەلەک، باسک و هەمووی ئەوانم دەگەڵ لەشی ژنەکەم بەراورد کرد. خەتی ران و سمت، گەرمای لەشی ژنەکەم دیسان هاتنەوە خەیاڵم. لە خەیاڵ زۆر بە هێزتر بوو، چونکە لە بەر پێداویستییەک بوو. هەستم کرد دەمەوێ لەشی ئەو لە پەنام بێ. جووڵەیەک، تەمایەک بۆ بەرگری لەم ویستە هەوەسبارە بەس بوو. بەڵام ئەو ئاڵقە ئاگرینەی دەوری سەرم ئەوەندە تەنگ و سووتێنەر ببوو کە بە تەواوی لە دەریایەکی نامۆ دا و دەگەڵ تاپۆ ترسێنەرەکان وە مەلە کەوتم.

هەوا هێشتا تاریک بوو کە بەدەنگی تاقمێک گەزمەی مەست وەخەبەر هاتم کـە بە کـۆڵان دا تێـدەپەڕین، جـوێنی پیسـیـان پێکدەدا و تێکڕا دەیانکوت:

« وەرە بڕۆین و مەی بخۆین،
شەرابی ملکی رەی بخۆین،
ئێستا نەخۆین ئەی کەی بخۆین؟ »

وەبیرم هاتەوە، نا، لە نەکاو پێم ئیلهام کرا کـە قاپێکم شـەراب لە خـەڵوەتی ژوورەکـەم دا هەیە، شـەرابێک کـە ژاری ددانی کـوبرای تێکەڵ کراوە و بە قومێکی ئەو هەموو مۆتەی ژیان تەرت و تونا دەبن... بەڵام ئەو سەڵیتەیە...؟ ئەم وشەیە پتر تامەزرۆی ئەوی دەکردم، ئەوی بە تین و تاوتر پێدەنواندم.

چ شتێک لەوە باشتر بە مێشکم دا دەهات، پیاڵەیەک لەم شەرابەم دەدایە و خۆشم پیاڵەیەکم پێدادەکرد ئەودەم لە نێو لەرزێک دا پێکەوە





دەمرین! ئەوین چیە؟ بۆ هەموو سپڵەکان حەکەداریی، بەرەڵڵابوونێکی کاتییە. ئەوینی سپڵەکان دەبێ لە گۆرانیە جلّف و حەکەدارانە و جوێنە پیسەکانیان، کە لە عالەمی مەستی و وشیاری دا دووپاتی دەکەنەوە بدۆزیەوە. وەک: سەر دە قور نان و چەپۆک پێدادان ـ بەڵام ئەوینی من بۆ ئەو شتێکی دیکە بوو ـ ڕاست بو کە لە کۆنەوە من ئەوم دەناسی: چاوە لارە سەیەرەکانی، زاری تەنگی نیوەئاوەڵە، دەنگی کپ و ئارامی ئەو هەموو ئەوانە بۆ من پڕ لە بیرەوەری دوور و بە ژان بوو و من لە نێو هەمووی ئەوانە دا لەو شتەی دەگەڕام کە لێی بێبەش بووم کە شتێکی سەر بە من بوو و لە منیان وەرگرتبوو.

ئایا بۆ هەمیشە منیان بێبەش کردبوو؟ لە بەر ئەوە بوو کە هەستێکی بە سامتر لە من دا سەری هەڵدابوو. کەیفێکی دیکە کە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەوینی جوانەمەرگی خۆم هەستم پێدەکرد ـ لێم ببوو بە وازواز، نازانم بۆ وەبیر پیاوی گۆشتفرۆشی ڕووبەڕووی دەربیچەی وەتاغەکەم کەوتبووم کە قۆڵی هەڵدەماڵی، بیسمیللای دەکوت و گۆشتەکانی دەبڕی. حاڵەت و چۆنیەتی هەمیشە لە بەر چاوم بوو ـ لە ئاکام منیش تەمام گرت ـ تەمایەکی پڕ مەترسی. لە سەر جێگام هەستام، قۆڵم هەڵماڵی و کێردێکی دەسک نێرۆیی کە دە بن باڵینجم نابوو هەڵمگرت. خۆم کۆم کردەوە و عەبایەکی زەردیشم بە سەر شان دادا. دوایە سەر و ڕووم بە شاڵگەردن داپێچا ـ هەستم کرد کە هاوکات حاڵەتێکی تێکەڵاو لە خووی گۆشتفرۆش و پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش لە من دا پەیدا ببوو. دوایە لە سەر پەنجەی پێیان بۆ لای دیوی ژنەکەم ڕۆیشتم. دیوەکەی تاریک بوو، دەرکەم بە سەبرا کردەوە. دەتکوت خەونی دەدیت، بە دەنگی بەرز بە خۆی دەکوت: « شاڵگەردنەکەت لێکەوە! » چوومە سەر جێگاکەی. سەرم لە بەر هەناسەی گەرم و ئارامی ئەو ڕاگرت. چ گەرمایەکی خۆش و بووژێنەری هەبوو! پێموابوو ئەگەر لە بەر ئەم گەرمایە ماوەیەک هەناسەم هەڵکێشابا دیسان زیندوو دەبوومەوە. ئاه، چەند لەمێژ بوو کە من پێموابوو هەناسەی هەموو کەس دەبێ وەک هی من داغ و سووتێنەر بێ. سەرنجم

دایه بزانم لە دیوەکەی پیاوێکی دیکەی لێیە. یانی لە کەڵەگاکانی ئەو کەسێکیان لەوێ بوو یا نا. بەڵام ئەو تەنیا بوو. تێگەیشتم کە هەرچی بۆیان هەڵبەستوە بوختان بوە. چووزانی هێشتا هەر کچ نەماوە؟ لە تەواوی خەیاڵە پووچەکانم سەبارەت بەو شەرمەزار بووم. ئەم هەستە دەقیقەیەکی پتر نەخایەند، چونکە لەودەمە دا لە پشت دەرکە پشمە و کەنینێکی کپ و کرێتم بیست کە مچورکی بە لەش دا دێنا ـ ئەم دەنگە هەموو رەگەکانی لەشی لە بەر یەک کێشامەوە ئەگەر ئەم پشمە و کەنینەم نەبیستبا، ئەگەر سەبری نەهێنابا، هەر ئەو جۆرەی کە تەمام گرتبوو هەموو گۆشتی لەشیم کوت کوت دەکرد، دەمدا بە گۆشتفرۆشی بەر ماڵمان هەتا بە خەڵکی فرۆشتبا. بۆ خۆم کوتە گۆشتێکی رانیم بە ناوی نەزری دەدا بە پیرەمێردی قورئانخوێن و سبەینەکەشی دەچووم و پێمدەکوت: « دەزانی ئەو گۆشتەی کە دوێنێ خواردت هی کێ بوو؟ »

ئەگەر ئەو پێنەکەنیبا. ئەم کارەم دەبا بە شەو کردبا کە چاوم بە چاوی سەڵیتە نەکەوتبا. چون شەرمم لە حاڵەتی چاوی دەکرد، لۆمەی دەکردم ـ لە ئاکام لە کن جێگاکەی، کوتە پارچەیەک کە وە بەر پێم هات، هەڵمگرت و بە شێواوی هەڵاتمە دەرەوە. کێردەکەم هەڵداشتە سەر بان ـ چونکە هەموو بیرێکی ئینسانکوژانە ئەم کێردە دە مێشکی منی ئاخنیبوو ـ ئەم کێردە کە لە کێردی کابرای گۆشتفرۆش دەچوو لە خۆم دوور کردەوە.

کە گەڕامەوە دیوەکەم لە بەر پیسۆز دیتم کە کراسی ئەوم هەڵگرتوە. کراسێکی چڵکن کە لە سەر گۆشتی لەشی ئەو بوە، کراسی نەرمی هیندیی کە بۆنی لەشی ئەو، بۆنی عەتری موگرای دەدا و لەگەرمای لەشی ئەو، لە بوونی ئەو لەم کراسە دا مابوو. بۆنم پێوە کرد، لە نێو لینگم نا و خەوتم ـ هیچ شەوێک وا راحەت نەخەوتبووم. بەیانی زوو بە دەنگی هات و هاواری ژنەکەم هەستام کە لە بەر ونبوونی کراسەکەی هەڵڵای ساز کردبوو و دوو پاتی دەکردەوە : « کراسێکی تازە و نوێ! » لە حاڵێک دا سەر دەستەکەکەی دڕابوو. بەڵام ئەگەر خوێنیش رژابا من حازر نەبووم کراسەکە بدەمەوە ـ ئایا من بەشم بە کۆنەکراسێکی ژنەکەمەوە نەبوو؟





نەنە کە شیری ماکەر و هەنگوین و نانی بۆ هێنام، کێردێکی دەسک نێرۆیی لە پەنا بەرچایی من لە سەر کەشەف دانابوو و کوتی کە ئەوەی لە سەر خوانچەی پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش دا بینیوە و کڕیویەتی. دوایە برۆی هەڵکێشا و کوتی: « جارجارە بۆ بەردەستان بە کەلک دێ! » من کێردەکەم هەڵگرت و چاوم لێکرد. هەر کێردەکەی خۆم بوو. دوایە نەنە وەک سکالا بە دڵێشاوی کوتی: « ئادی کچەکەم ( یانی ئەو سەڵیتەیە) بەیانی زوو دەڵێ تۆ دوێنێ شەوێ کراسەکەی منت دزیوە! من کە نامەوێ لۆمەتان بکەم. ـ بەڵام دوێنێ ژنەکەت پەڵەی دیوە... ئێمە دەمانزانی کە منداڵ... بۆ خۆی دەیکوت کە لە حەمام زگی پڕ بوە، شەوێ چووم پشتی دامالم، دیتم کە سەر باسکی شین شین هەڵگەڕابوو بە منی نیشان دا و کوتی: « ناوەخت چوومە ژێرخان و جندۆکە هەڵیانقورینجاندووم! » دیسان کوتی: « هیچ دەتزانی زۆر لەمێژ بوو کە خێزانت زگی پڕ ببوو؟ من پێکەنیم و کوتم: « لەوانەیە شوباری منداڵەکە، وەک پیرەمێردی قورئانخوێن بێ، لەوانەیە لەو گوورابێ!» دوایە نەنە پەشۆکاو وەدەرکەوت. دەتکوت چاوەڕوانی ئەو وڵامە نەبوو. من دەست بەجێ هەستام. کێردی دەسک نێرۆییم بە دەستی لەرزۆک بردە خەڵوەتی دیوەکەم و دە نێو مجریم نا و دەرکەکەم داخست.

نا، قەت ناکرێ منداڵەکە لە من گوورابێ. بێ شک لە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش گووراوە!

دوای نیوەڕۆ، دەرکەی دیوەکەم کراوە و برا چکۆڵەکەی، برا چووکەی ئەو سەڵیتەیە لە حاڵێک دا نینۆکی دەجووت وەژوور کەوت. هەر کەس کە ئەوانی دەدیت دەستبەجێ دەیزانی کە خوشک و بران. ئەوەندە وەک یەک! زاری چووکی تەنگ، لێوی گۆشتنی تەڕ و بە هەوەسی، پێڵوو داکەوتوو و خومارەکانی، چاوگەلی لار و واق وڕماو، کوڵمی زەق، مووی بۆری ئاڵۆز و سیمایەکی رەشتاڵەی هەبوو. ـ هەر تەواو وەک ئەو سەڵیتەیە دەچوو و نەختێک لە رووحی شەیتانیی ئەوی تێدابوو ـ لەو سیما تورکمەنیە بێ هەست و بێ رووحانەی کە بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ ژیان ساز بوە،

قـیـافـەیەک کـە هـەر کـاریکی بۆ دریژە دان بـە ژیانی پێ رەوایـە. دەتکوت سروشت پێشتر پێشبینی کردبوو، وەک ئەوەکە باب و باپیرانی ئەو زۆر لە ژێر هەتاو و باران دا ژیاون و دەگەڵ سروشت شەڕیان کردوە و نە تەنیا سـەر و سـیـمـا و شکلّـیـان بە گـۆڕانکاریەوە بۆ وان بە مـیـرات بە جێ هێشتبوو بەڵکەم لە بەرەنگاریی، لە هەوەس و بەرچاوتەنگی و برسیایەتی خـۆشـیـان بەوان بەخـشـیـبـوو. تـامـی زاریم دەزانی، وەک قـونگـە هـارۆ مەیلەوتاڵ بوو.

کـە هـاتە ژوور بە چـاوی واقـوڕمـاوی تورکـمـەنـی روانیـە من و کـوتـی: «شـاگیـان دەڵێ حـەکیم کوتوویـەتی تۆ دەمری، لە دەسـتت رزگـاریمان دێ. مەگەر ئینسان چون دەمرێ؟ »

من کوتم، « پێی بڵێ زۆر لەمێژە من مردووم. »

« ـ شـاگیـان کوتی: ئـەگەر منداڵەکەم لـە بەر نەچووبا تەواوی ئەو مـاڵە دەبوو بە هـی ئێمە. »

من بە خـۆم نەبوو لەقـاقـای پێکەنیم دا، کـەنینێکی ویشکی کرێت کـە مـچـوڕکی بە لـەش دا دێنا، وەهـا کـە دەنگی خـۆم نەدەناسـیـوە، منداڵ پەشۆکاو لە ژوور دەرپەڕی.

تازە تێدەگەیشتم کە پیاوی گۆشتفرۆش بۆچی بە کەیفەوە کێردی دەسک نێرۆیی بە رانی مەڕەکان خاوێن دەکردەوە. ـ کەیفی بڕینی گۆشتی نەرمە کە خوێنی مردوو، خوێنی دەڵەمەبووی وەک لیتەی تێدا کۆ ببۆوە و لە قوڕگی مەڕەکان تک تک خوێناو دەتکا سـەر زەوی ـ سەگی زەردی بەر گۆشتفرۆشی و سەری بڕاوی گایەک لە سـەر عەرزی دوکان کەوتبوو و بە چاوی لێڵی دەیراونی و هـەروەها سـەری هـەمـوو مەڕەکان، بەو چاوانەی کە تۆزی مـەرگـیـان لـە سـەر نیـشـتـبـوو، ئـەوانیش دیتـبـوویان، ئەوانیش دەیانزانی!

لە ئـاکـام تێـدەگـەم کـە بوومـە نیـوەخـودایەک، سـەرتر لە هـەمـوو پێداویستیـەکـانی چووک و سووکی خەڵک بووم، رەوتی هەمـیشـەیی و هەرمـان بوونم لە خـۆ دا هەست پێـدەکـرد ـ هەمـیـشـەیی چیـە؟ بـۆ من





هەمـــیـــشـــەیی بریتی لەوە بوو کــە لـە پەنا چـۆمی ســـوورێن دەگـــەڵ ئەو سـەڵیـتـەیە قـەرەقـەرێنێ بکەم و تـەنیـا سـاتێک چاوم بقـوچێنـم و سـەرم لە داوێنی ئەو دا بشارمەوە.

لە پڕ پێـمـوابوو کـە دەگـەڵ خـۆم قـسـەم دەکـرد، ئـەویش بە لەونـێکی غـەریب، ویسـتـم دەگەڵ خـۆم قـسـە بکـەم بەڵام لێوەکـانم ئەوەندە قـورس ببـوون کـە چووکـتـرین جـووڵەیان نەدەکـرد. بەڵام بێ ئەوەی لێـوەکـانم بجـووڵێتـەوە یا دەنگی خـۆم گوێ لێبێ هەسـتـم کرد کـە دەگەڵ خـۆم قسـەم دەکرد.

لەم دیوە دا کە وەک قـەبـر هـەر دەهـات تەنگتـر و تاریکتـر دەبوو، شـەو بە سێبەرە بە سـامەکانیەوە منی گەمارۆ دابوو. لە بەر پیسۆز کە دووکەڵی دەکـرد بە کـەوڵ و عـەبایەک کـە لە خـۆمـەوە پێـچابوو و شـاڵگەردنێک کـە بەسـتـبووم، سێبـەرەکەم بەهەڵکورماویی کـەوتبوە سـەر دیوار. سێبـەری من گەلێک تۆختـر و ئاشکراتر لە لەشی راستەقینەی من کـەوتبوو سـەر دیوار، سـێـبـەرەکـەم راسـتـەقـینەتر لە بوونی منی لێـهـاتبـوو ـ گـۆیا پیرەمـێـردی وردەواڵەفرۆش، پیـاوی گۆشـتـفرۆش، نەنـە و ژنە سـەڵیـتـەکـەم هەمـوویان سـێـبـەری من بوون، ئەو سـێـبـەرانەی کـە من لە نێـویان دا زیـندانی بووم. لەوەدەمە دا وەک کوندێکم لێهاتبوو، بەڵام ناڵەکانی من لـە ئەوکم دا گیریان خـــوارد بوو و وەک پـەڵە خـــوێن ئەوانم تـف دەکـــرد. لەوانـەیە کـــونـدیش نەخـۆشـیـیـەکی هەیە کە وەک من بـیر دەکاتەوە. سـێـبـەرم لـە سـەر دیوار دروست وەک کوندی لێـهـاتبـوو و بە هەڵکورمـاویی نوسـراوەکـانی منی بە وردیی دەخـوێندەوە. بێ شک ئەو بـاش تێدەگـەیشت، تەنیـا ئەو دەیتـوانی تێبگا. لە بنەوە کە چاوم لە سێبەری خۆم دەکرد دەترسام.

شـەوێکی تاریک و بێـدەنگ، وەک شـەوێک کـە سـەراسـەری ژیـانی منی داگرتبوو. بەو تارمـاییە بە سـامانەی کە لە دەرک و دیوار، لە پشت پەردە، زمانیـان لێدەردەکێشـام. هەندێک جار دیوەکەم ئەوەندە تەنگ دەبۆوە وەک ئەوەکە لە تابووت دا درێژ بووم، لا سەرم دێشا، ئەندامەکانم بۆ چووکترین جووڵە ملیان نەدەدا. قورساییەک پاڵی بە سینگمەوە دەنا، وەک قورسایی





ئەو کـەلاکـانەی لە سـەر پشـتی بارگـینە رەش و لاوازەکـانی دادەنێن و دەیدەن بە گۆشتفرۆش.

مەرگ بە ورتە گۆرانی خۆی دەخوێندەوە. وەک کەسێکی لاڵ کە ناچارە هەر وشـەیەک دووپات کـاتەوە یا هەر ئەوەکە کەسێک شـێعرەکەی تەواو کرد دیسان سەرلەنوێ بیخوێنێتەوە. گۆرانیەکەی وەک دەنگدانەوەی ناڵەی مشار دەچوو نێو گۆشتی لەشەوە، هاواری دەکرد و لەپڕ کپ دەبوو.

هێشـتا چاوەکانم قـورس نەببوون کە تاقـمێک گەزمـەی مەست بە پشت دیوەکەم دا تێدەپەڕین جوێنی پیسیان پێکدەدا و تێکڕا دەیانکوت:

« وەرە بڕۆین و مەی بخۆین،
شەرابی مڵکی رەی بخۆین،
ئێستا نەخۆین ئەی کەی بخۆین؟ »

بە خـۆم کـوت: « لە حـاڵێک دا هـەر دەکـەومـە دەست دارۆغـە! » لەپڕ هێزێکی پتر لە رادەی بەشـەرم لە خۆ دا هەست پێکرد: نێوچەوانم فێنک بۆوە، هەستام عەبایەکی زەردم بە شان دادا. شاڵگەردنم دوو سێ دەور لە سەرم هاڵاند، کۆم بوومەوە، چووم کێردێکی دەسک نێرۆیی کە دە مـجری دا شـاردبوومەوە دەرمـهێنا و لە سـەر پەنجەی پێیـان بەرەو دیوی سـەڵێتـە چووم ـ کـە گـەیشـتـمـە بەر دەرکـەی ژوورەکەی لە تاریکیـیـەکی خـەست دا نوقم ببوو. گوێم هەڵخست دەنگیم بیست کە دەیکوت:

« هاتی؟ شاڵگەردنەکەت بکەوە! » دەنگی زەنگێکی خۆشی هەبوو، وەک دەنگی سـەردەمی منداڵی لێهاتبـوو. وەک ورتەیەک بوو کە بێ ئاگاداری لە خـەو دا دەیکەن ـ من ئەو دەنگەم پێشـتـر لە خەوێکی قـورس دا بیسـتبـوو ـ ئاخۆ خـەونی دەدیت؟ دەنگی کپ و گڕ، وەک دەنگی ئەو کیژۆڵەی لێهاتبوو کـە لە پەنا چـۆمی سـوورێن دەگـەڵ من قـەرەقـەرێنی دەکـرد. من هـەندێک راوەسـتـام دیسـان بیسـتـمـەوە کـەدەیکوت: « وەرە ژووریٚ شـاڵگەردنەکەت بکەوە! »

من ئارام لـە تاریکی دا وەژوور کـەوتم، عـەبا و شـاڵگەردنەکـەم دانان. رووت بوومـەوە بەڵام نـازانم بۆچی هەر وا کـە کـێـردی دەسک نێـرۆییم بە





دەستەوە بوو دەباڵی خزام، گەرمای نوێنەکەی وەک ئەوە بوو کە گیانێکی تازەی دامێ. دوایە لەشی لووس، نمدار و خـــۆش تینی ئەوم بە یادی هەمـــان کـیـــژۆڵەی رەنگ بزرکاوی کـز کـە چاوی درشت و بێگوناهی تورکمەنی هەبوو و لە پەنا چۆمی سوورێن پێکەوە قەرەقەرێنمان دەکرد دەباوەش گرت. ـ نا، وەک گیانلەبەرێکی درِ و برسی شالاوم بۆ برد و لە قـوولایی دڵم دا لێی بێزار بووم، وا دەهاتە بەر چاو کە هەستی ئەوین و قین بە یەکەوە بوون. لەشی تریفەیی و فێنکی ئەو، لەشی ژنەکەم وەک ماری کوبرا کە لە دەوری نێچیری خۆی دەهاڵێ لێک کراوە و منی دە نێو خۆی گرت ـ عەتری سینگی مەستێنەر بوو، گۆشتی باسکی کە لە گەردنم هالاند گەرمایەکی خۆشی هەبوو، لەو ساتە دا ئاواتم دەخواست کە ژیانم ببرێتەوە. چونکە لەو دەقیقەیە دا هەموو قین و رقێکی کە لێم هەبوو نەما و حـــەولم دەدا کـــە بەری گـــریانی خـــۆم بگرم ـ بێ ئەوەی بزانم وەک گیائادەمە پێیەکانی لە پشت پێیەکانم قفڵ بوو و دەستەکانی بە پشت ملمەوە نووسا ـ من تینی خۆشی ئەو گۆشتە تەرِ و تازەیەم هەست پێکرد، تەواوی زەرِرِەکانی لەشی داغم ئەم تینەیان هەڵلووشی. هەستم دەکرد کە وەک نێچیر من بۆ لای خۆی رادەکێشێ ـ هەستی ترس و کەیف تێکەڵاو ببوون، زاری تامی قونگە هارۆی دەدا و مڵ بوو. لە نێو ئەم رێک کوشینە خـــۆشـــە دا ئارەقـــەم دەرِشت و خـــەنی ببـــووم. چونکە لەشم، تەواوی زەرِرِەکانی گیانم بوون کە فەرمانیان بە من دەدا، سەرکەوتنی خۆیان بە دەنگی بەرز رادەگەیاند ـ من مەحکووم و بێچارە لەو دەریا بێبنە دا لە ئاست هەوا و هەوەسی شـەپۆلەکـان دا سـەری تەسلیمم دانواند بوو ـ پرچەکانی کە بۆنی عەتی موگرای لێوە دەهات، بە روومەوە نووسابوون و هاواری هەژیان و شادی لە قوولایی گیانمەوە دەهاتە دەر ـ لەپرِ هەستم کرد کە ئەو توند لێوی گەستم، وەها کە دایدرِاند. ئایا ئەنگوستی خۆشی وەها دەجووت یا ئەوەکە تێگەیشت من پیرەمێردی لێو کەت نیم؟ ویستم خۆم رزگار کەم. بەڵام نەمدەتوانی چووکترین جوولەی بکەم. هەرچی حەولم دا کەلکی نەبوو ـ گۆشتی لەشی ئێمەیان بە یەکەوە لکاندبوو. ـ





وامزانی شێت بوە. لەو گێرە و کێشەیە دا لە خۆوە دەستم وەشاند و هەستم کرد ئەو کێردەی کە دە دەستم دابوو وە جێیەکی لەشی ئەو کەوت ـ ئاوەکییەکی گەرم پڕژا سەر رووم، ئەو هاواری کرد و منی بەردا ـ ئاوەکییەکی گەرم کە مستی پڕ کردبووم هەروا رامگرت و کێردەکەم فڕێ دا. دەستم ئازاد بوو و لە لەشی ئەوم هەڵدەسوو، تەواو سارد ببۆوە ـ ئەو مرد بوو. لەدەمە دا وە کۆخە کەوتم بەڵام ئەوە کۆخە نەبوو، دەنگی کەنینێکی ویشک و کرێت بوو کە مچوڕکی بە لەش دا دێنا ـ پەشۆکاو عەباکەم بە کۆڵ دادا و چوومەوە دیوی خۆم ـ لە بەر شۆقی پیسۆز مستم کردەوە، دیتم چاوی ئەو لە نێو دەستم دابوو و تەواوی لەشم شەڵاڵی خوێن بوو. چوومە بەر ئاوێنە، بەڵام لە ترسان دەستم لە بەر رووم گرتبوو ـ دیتم وەک، نا، هەر ببوومە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش. تووکەکانی سەر و ردێنم وەک موویەکانی سەر و رووی کەسێک بوو کە زیندوو لە دیوێک بێتە دەر کە ماری کوبڕای تێدابوە ـ هەمووی سپی ببوو، لێوەکانم وەک لێوی پیرەمێرد دادڕابوو، چاوەکانم بێ مژۆڵ، کۆڵێک مووی سپی لە سینگم دەرپەڕیبوون و رووحێکی تازە هاتبوە لەشی منەوە. هەر جۆرێکی دیکانە بیرم دەکردەوە ، چەشنێکی دیکە هەستم دەکرد و نەمدەتوانی خۆم لە دەستی ئەو ـ لە دەستی دێوێک کە لە من دا گیانی گرتبوو رزگار کەم، هەروا کە دەستم لەبەر رووم گرتبوو لە خۆوە لە قاقام دا، کەنینێکی توندتر لەوەی پێشوو کە گیانی وە لەرزە خستم. کەنینێکی قووڵ کە دیار نەبوو لە کام چاڵی ونبووی لەشم دەهاتە دەر، کەنینێکی بۆش کە تەنیا لە ئەوکم دا دەگەڕا و لە بۆشایی دەهاتە دەر ـ من ببوومە پیرەمێردی وردەواڵەفرۆش.





×××

له بەر پەشۆکاویی، وەک ئەوە بوو کە لە خەوێکی قورس و گران وە ئاگا هاتبێمەوە، چاوەکانم هەڵگڵۆفی. لە هەمان دیوی پێشووی خۆم دابووم، تاریک و روون بوو و هالاو بەری شووشەکانی گرتبوو ـ قووقەی کەڵەباب لە دوورەوە دەبیسرا ـ پۆلووکانی نێو مەقەڵی ببوونە ژیلەمۆ و سارد ببوونەوە و بە پشوویەک بەند بوون. هەستم کرد کە بیرەکانم وەک پۆلووکانی ئاگر پووک بوون و بوونە ژیلەمۆ و بە پشوویەک بەندن. یەکەم شتێک کە لێی گەڕام گوڵدانی راغە بوو کە لە قەبرستان لە پیرەمێردی کالیسکەچیم وەرگرتبوو، بەڵام گوڵدان لە رووبەڕووم نەبوو. چاوم لێکرد دیتم لە بەر دەرکە کەسێک بە سێبەری چەماوەوە، نا، ئەو کەسە پیرەمێردێکی کووڕ بوو کە سەر و رووی بە شاڵگەردن داپێچا بوو و شتێکی وەک گۆزەی لە دەسرەیەکی چڵکن پێچابۆوە و لە بن هەنگڵی نابوو ـ کەنینێکی ویشک و کرێتی دەکرد کە مچوڕکی بە لەش دا دێنا.





هەر کە ویسـتم بجووڵێمـەوە وەدەرکەوت. من هـەسـتـام، ویسـتم وە دوای بکەوم و ئەو گۆزەیە، ئەو پرێسکەیەی لێبستێنمەوە ـ بەڵام پیرەمێرد گورج دوور ببـۆوە. من گـەڕامەوە پەنجـەرەی روو بە کوچەی وەتاغـەکەم کردەوە ـ تارمـایی کـۆمـی پیـرەمـێـردم لە کـووچە دیت کـە شـانـی لە بەر پێکەنین دەلەرزی و پرێسکەی دە بن هـەنگڵ نابوو. هـەڵتەک هـەڵتەک دەڕۆیشت هـەتا بە تەواوی لـە پشت مـژ ون بوو. من گـەڕامـەوە چاوم لـە خـۆم کـرد، دیتم جلەکانم دڕاون، سـەرتاپێم ئـاوێتـەی خـوێنی دەڵەمـە ببـوو، دوو زەرگـەتە لە دەورم دەفـڕین و کرمگەلێکی سـپی چووک لە سـەر لەشـم تێک دەبەزین ـ و، قورسایی مردوویەک سینگمی رێک دەکوشی...





پشووم سواره، فرمێسک له چاوەکانم دەڕژێن، زارم تامێکی ناخۆشی هەیە، سەرم دە گێژەوە دێ، دڵم گیراوە، لەشم شەکەت و کوتراو و شلە، بێ ویستی خۆم لە سەر تەخت کەوتووم. باسکەکانم دەرزی ئاژن بوون. تەختەکەم بۆنی ئارەقە و بۆنی یاوی لێدێ، چاو لە سەعاتێک دەکەم کە لە سەر مێزی چووکی پەنا تەختەکەم داندراوە، سەعات دەی ڕۆژی یەکشەنبەیە. سەیری میچی وەتاغەکەم دەکەم کە چرا لە نێوەڕاستی هەڵواسراوە، دەڕوانمە دەوروبەری ژوورەکەم، کاغەزی دیوار گوڵ و چرپییەکی سوور و تەختێکی ئاڵی هەیە. نێونێوە دوو مەلی رەش کە بەرامبەری یەک لە سەر چڵ هەڵنیشتوون و یەکێک لەوان دندووکی لێک کردۆتەوە دەڵێی دەگەڵ ئەوی دیکە قسە دەکا، ئەم نەخشە تووڕەم دەکا، نازانم بۆچی بۆ هەر لایەک وەر دەسووڕێمەوە لەبەر چاومە، سەر مێزی نێو ژوور پڕ لە شووشە و فتیلە و قوتوو دەرمانە. بۆنی ئەڵکۆڵی سووتاو و بۆنی وەتاغی نەخۆش لە هەوا دا بڵاو بۆتەوە؛ دەمەوێ هەستم و پەنجەرەی بکەمەوە، بەڵام تەوەزەلییەکی قورس لە سەر تەخت بزمارکوتی کردووم.





دەمەوێ سیگار بکێشم، بەڵام حەزم لێی نیە. دە دەقیقە تێناپەڕێ ردێنم کە زۆر ببوو تاشیم. هاتمەوە و لە سەر تەختەکەم درێژ بوومەوە. لە ئاوێنە دا کە چاوم لە خۆم کردبوو زۆر داتەپیو و لاواز ببووم؛ بە زەحمەت بە ڕێگا دا دەڕۆیشتم، ژوورەکە زۆر شپرزەیە. من تەنیام.

هەزار چەشنە بیری سەیر دە مێشکم دا دەخولێتەوە و دەگەڕێ. هەموویان دەبینم، بەڵام بۆ نووسینی بچووکترین هەست یا بچووکترین خەیاڵێکی تێپەڕ، دەبێ سەرانسەری ژیانی خۆم بگێڕمەوە و ئەویش ناگونجێ. ئەم بیرانە، ئەم هەستانە ئاکامی دەورەیەکی ژیانی منە، ئاکامی شێوەی ژیانی بیرە بە میراتبراوەکانە، ئەوەی کە دیتوومە، بیستوومە، خوێندوومەتەوە، هەستم پێکردوە یا هەڵمسەنگاندوە. تەواوی ئەوانە وجوودی خەیاڵیی و چەپەڵی منیان پێکهێناوە.

دە تەختەکەم دا جینگڵان دەدەم، یادداشتەکانی بیرم لێکدەدەمەوە، بیرە پەرێشان و شێتەکان زەخت بۆ مێشکم دێنن، پشت سەرم دێشێ، برووسکی پێدادێ، لاجانگەکانم داغ بوون، دە خۆم دەهاڵێم. لێفەکەم دەکێشمە سەر خۆم و بیر دەکەمەوە ـ ماندوو بووم، چەند خۆش دەبوو توانیبام کاسەسەری خۆم کردباوە و هەموو ئەم کۆما بۆرە پێچاوپێچەی کەللەم دەرهێنابا و فڕێم دابا، فڕێم دابا بەر سەگ.

هیچکەس ناتوانێ تێبگا، هیچکەس باوەڕ ناکا، کەسێک کە هیوابڕاو بووبێ پێیدەڵێن: بڕۆ سەرت بنێەوە و بتۆپە! بەڵام کاتێک مەرگیش مرۆڤی ناوێ، کاتێک کە مەرگیش پشت لە مرۆڤ دەکا، مەرگێک کە نایە و نایەوێ بێ...!

هەموو لە مەرگ دەترسن و من لە ژیانی لاساری خۆم!

چەندە بەسامە کاتێک کە مەرگ مرۆڤی ناوێ و پاڵی پێوەدەنێ! تەنیا یەک شت دڵم دەداتەوە، دوو حەوتە لەمەوبەر بوو، دە رۆژنامە دا خوێندمەوە کە لە ئۆتریش کەسێک سێزدە جار بە شێوەی جۆراوجۆر تەمای گرتوە خۆی بکووژێ و تەواوی ڕێگاکانی بەتاقی کردۆتەوە: خۆی لە دار داوە پەت پساوە، خۆی بە چۆم داداوە لە ئاو دەریانکێشاوەتەوە و ...،





بەڵام لە ئاکام دوایین جار کە ماڵی چۆڵ دیوە بە کێردی ئاشپەزخانە هەموو رەگ و دەماری خۆی بڕیوە و ئەمجارەی سێزدەهەم دەمرێ!

ئەمە دڵم دەداتەوە!

نا، کەس تەمای خۆکوژیی ناگرێ، خۆکوژیی دەگەڵ هەندێک کەسان هەیە، دە زات و دەروونی ئەوان دایە، ناتوانن لێیڕابکەن. ئەمە چارەنووسە کە دەستەڵاتی هەیە بەڵام بەو حاڵەشەوە ئەوە منم کە چارەنووسی خۆم ساز کردوە، ئێستا ئیدی ناتوانم لێیڕابکەم، ناتوانم لە خۆم رابکەم.

ئادی، چی دەگەڵ دەکرێ، چارەنووس بەهێزتر لە منە.

هەوەسی چەند سەیر لە کەللەم دەدا؟ هەروا کە درێژ ببووم، پێمخۆش بوو منداڵێکی چووکە بام، هەر ئەو **گوڵین باجییە** کە حەکایەتی بۆ دەکوتم و تفی زاری خۆی قووت دەدا، لێرە لە بان سەرم دانیشتبا، منیش هەر ئاوا ماندوو دە تەختەکەم دا کەوتبام، ئەو بە داو و دڵەوە حەکایەتی بۆ کوتبام و ئارام چاوم کەوتبا سەر یەک. بیر دەکەمەوە دەبینم هەندێک لە ساتەکانی منداڵیم باش وەبیر دێتەوە. دەڵێی دوێنێیە، دەبینم کە لە منداڵەتییم هێندە دوور نیم. نووکە سەرانسەری ژیانی رەش، چەپەڵ و بێکەلکی خۆم دەبینم. ئایا ئەودەم بەختەوەر بووم؟ نا، چ هەڵەیەکی گەورە! هەموو پییانوایە کە منداڵ بەختەوەرە. نا، باش لە بیرمە. ئەودەم بە هەستتر بووم، ئەودەمیش لاساکەر و ئاگری بن کا بووم. لەوانەیە بە رواڵەت پێکەنیبام و کایەم کردبا، بەڵام دە دەروونم دا چووکترین لۆمە یان چووکترین پێشهاتی ناخۆش و بێکەلک، ماوەیەکی دوورودرێژ بیری منیان دادەگرت و خۆم، خۆم دەخواردەوە. هەی بە زیاد نەبێ ئەو خدەیەی من! هەق بەوانەیە کە دەڵێن بەهەشت و دۆزەخ دە نێو خودی کەسەکان دایە، هەندێک خۆش دێنە سەر دونیا و هەندێک ناخۆش.

چاو لە کوتە میدادێکی سوور دەکەم کە بە دەستمەوەیە و لە تەختەکەم دا یادداشتی پێدەنووسم؛ هەر بەم میدادە بوو کە شوێنی چاو پێکەوتنی خۆمانم نووسی و دام بەو کچەی کە تازە پێکەوە ناسیاو ببووین. دوو سێ جار پێکەوە چووینە سینەما. جاری ئاخر فیلمەکە دەنگ و مووزیکی





هەبوو. لە بەشێکی گۆرانیبێژی بەناوبانگی شیکاگۆ گۆرانی دەکوت Where is my Silvia? وەهام پێخۆش بوو کە چاوەکانم وێکنا، گوێم دەدایە، گۆرانی بەهێز و دڵڕفێنی ئەو هێشتا دە گوێم دا دەزرینگێتەوە. تالاری سینەمای دەلەراندەوە، پێمـوابوو کە ئەو نابێ قەت بمرێ. نەمـدەتوانی باوەڕ بکەم کە ئەم دەنگە لەوانەیە رۆژێک بێدەنگ بێ. لە دەنگی بە سۆزیی غەم دایگرتبووم و سەرەڕای ئەوەش کەیفم دەکرد. سازیان زیل و بەم لێدەدا، ئاه و ناڵە کە لە ژێیەکانی ویەلۆن بەرز دەبۆوە، لەوە دەچوو کە ئارشەی ویەلۆنەکە بە سەر رەگ و دەمارەکانی من دادێن و تان و پۆی لەشمی دەکردە ساز، دەیلەرزاندم و بۆ دونیای خەیاڵاتی دەبردم، لە تاریکی دا دەستم لە مەمکەکانی ئەو کچە وەردەدا، چاوەکانی خومار دەبوون. منیش جۆرێکی سەیرم لێدەهات. لە بیرمە حاڵەتێکی غەمین و خۆش بوو کە ناکرێ باسی بکەی. لێوە تەڕ و بڕەکانیم ماچ دەکرد، کولمەکانی سوور ببوونەوە. یەکترمان رێکدەکوشی، دە فیلمەکە نەگەیشتین. یارییم بە دەستەکانی دەکرد، ئەویش خۆی بە منەوە نووساندبوو. نووکە دەڵێی خەونم دیتوە؛ لە دوایین رۆژێکەوە کە لێک جیا بووینەوە هەتا ئێستا نۆ رۆژە. قەراری دانا سبەی ئەو رۆژە بڕۆم بیهێنمە ئێرە بۆ وەتاغەکەم. ماڵەکەی لە نزیک گۆڕستانی مەنپارناس بوو. هەر ئەو رۆژە چووم کە ئەو دەگەڵ خۆم بێنم. لەوێ لە سووچی کۆڵان لە میترۆ دابەزیم. کزەبایەکی سارد دەهات، هەور و هەوا بوو. نازنم چ بوو کە پەشیمان بوومەوە. نە لەبەر ئەوە کە ئەو ناحەز بوو یان خۆشم نەدەویست، بەڵام هێزێک بەری گرتم. نا، نەمدەویست ئیدی ئەو ببینم، دەمەویست هەموو دڵبەندییەکانم بە ژیان هەڵپچڕم، لەخۆوە چوومە نێو گۆڕستان، پاسەوانی بەر دەرگاکە خۆی بە شنێلێکی سوورمەیی داپێچابوو. بێدەنگییەکی سەیر بە سەر وێ دا زاڵ بوو؛ من بە شێنەیی هەنگاوم هەڵدێناوە. زەق سەیری کێلەکان، ئەو سەلیبانەی کە لە سەر گۆڕەکانیان چەقاندبوو، گوڵی پلاستیکی نێو گوڵدانەکان و ئەو گژوگیایەی کە لە لێوار یان سەر گۆڕەکان بوون، دەکرد. ناوی هەندێک لە مردووەکانم





دەخوێندەوە. حەسرەتم دەخوارد کە بۆچی لە جیات وان نیم. لای خۆم بیرم دەکردەوە: ئەوانە چەندە بەختەوەر بوون!... ئێرەییم بەو مردوانە دەبرد کە لەشیان دە بن گڵ دا رزیبوو. قەت وەها ئێرەییەک دە من دا پێکنەهاتبوو. پێموابوو کە مەرگ بەختەوەریی و نێعمەتێکە کە بە سانایی نایدەن بە کەس. دروست نازانم چەندە تێپەڕی. بە ماتی دەمڕوانی. کچەم بە تەواوەتی لە بیر چووبۆوە، هەستم بە سەرما نەدەکرد. دەتکوت مردووەکان نزیکترن لە من هەتا زیندووەکان. باشتر دە زمانی وان دەگەیشتم؛ گەڕامەوە، نا، ئیدی نەمدەویست ئەو کچە ببینم، دەمەویست لە هەموو شت و لە هەموو کارێک خۆ بکێشمەوە، دەمەویست هیوابڕاو بم و بمرم. فکری چەند قۆڕ لە مێشکم دەدا! لەوانەیە هاتەران پاتەرانێ دەکەم.

چەند رۆژ بوو فاڵم بە پەڕ دەگرتەوە. نازانم چۆن بوو کە بڕوام بە پڕ و پووچ پەیدا کردبوو، بە راستی فاڵم دەگرتەوە، یانی کارێکی دیکەم نەبوو، کارێکی دیکەم نەدەتوانی کردبا، دەمەویست دەگەڵ داهاتووی خۆم قومار بکەم. نیەتم کرد کە خۆم خلاس کەم، باش هات. رۆژێک حیسابم کرد دیتم سێ سەعات و نیوە بێ نێوبڕ بە پەڕ فاڵ دەگرمەوە. لە پێشدا بۆڕم لێدەدا، لە دوایی لە سەر مێز پەڕێک لە روو و پێنج پەڕی دیکەم بە پشت لە بن دەچنی، دوایی لە پەنای پەڕێک لە روو و چوار پەڕم بە پشت دە بنی دەنا؛ بەمجۆرە هەتا پەڕی شەشەمی کە تەنیا و بە ڕوو دەهات. لە دوایی وەهام ریز دەکردن کە خاڵێکی رەش و خاڵێکی سوور بە دوای یەک دا بکەونە سەر یەک، بەمجۆرە: شا، بیبی، سەرباز، دە، نۆ، .... هەر ماڵێک کە دەکراوە پەڕەکەی بنیم روو دەکرد، ئەگەر پێنج خانە یان کەمتر با زۆر باشتر دەبوو. لە دوایی باقی پەڕەکان کە بە دەستمەوە بوون، سێ سێ لە سەر یەکم دادەنا و ئەگەر پەڕێکی شیاو هاتبا لە سەر خانەکانم دادەنا، بەڵام لە شەش خانە نەدەبا پتر با، تەک خاڵەکانم بە جوێ لە سەرەوەی خانەکان دادەنا وەها ئەگەر فاڵەکە باش هاتبا هەموو پەڕەکانی خانەکانی خوارێ بە رێکوپێکی لە سەر هاوڕەنگەکانی خۆیان ریز دەبوون. ئەم فاڵە





به منداڵی فێری ببووم و کاتم پێ تێپەڕ دەکرد!

حەوت هەشت رۆژ لەمەوبەر لە قاوەخانە دانیشتبووم، دوو کەس لە بەرابەرم تەختەنەردیان دەکرد. یەکێک لەوان کە بە روخسارێکی سوور، سەری کەچەڵ، سیگارێکی دە بن سمێڵی داچۆڕاوی نابوو و گەوجانە گوێی دابوویە ئاواڵەکەی، کوتی « قەت قەت وانەبوە کە من لە سەر قومار ببەمەوە، لە دە جار نۆ جاری دەدۆڕێنم. » من بە سەیریی چاوم لێدەکردن، دەمەویست بڵێم چی؟ نازانم. بە هەر حاڵ دوایی وە کۆڵانان کەوتم، بەبێ ویست دەڕۆیشتم. چەند جار بە مێشکم داهات کە چاوەکانم بقووچێنم و بڕۆمە بەر ماشێن تەگەرەکەی وە سەرم پەڕێ؛ بەڵام مردنێکی سەخت بوو. دواییش چڵۆن ئاسوودە دەبووم؟ بەشکەم دیسان زیندوو مابامەوە. ئەم بیرەیە کە شێتم دەکا، لە دوایی هەروا لە چوارڕێیەکان و شوێنە قەرەباڵغەکان تێدەپەڕیم. دە نێوان ئەم ئاپوورەی کە دە هاتوچۆ دابوون، دەنگی ناڵی ئەسپی داشقەکان، عەرابەکان، دیدەی ماشێنەکان، هات و هەرا و قاوەقاوە، تەک و تەنیا بووم. دە نێوان چەند میلیۆن مرۆڤ دا، دەتکوت دە لۆتکەیەکی شکاو دام و دە نێو دەریا دا ون بووم. هەستم دەکرد کە بە ئابڕووتکاویی منیان لە کۆمەڵگای مرۆڤەکان دەرکردوە. دەمدیت کە بۆ ژیان ساز نەکرابووم، هۆ و بەڵگەم بۆ خۆم دادەتاشی و هەنگاوی یەکسانم هەڵدێناوە، لە پشت شووشەی دوکانەکان کە تابلۆی نەقاشییان دانابوو دەوەستام، ماوەیەک زەق چاوم تێدەبڕی، حەسرەتم دەخوارد کە بۆچی نەبوومە نەقاش، تەنیا کارێک کە پێمخۆش بوو و حەزم لێیدەکرد. لە لای خۆم بیرم دەکردەوە دەمدیت، تەنیا دە نەقاشی دا دەمتوانی دڵدانەوەیەکی چووک بۆ خۆم بدۆزمەوە. نامەبەرێکی پۆست بە پەنام دا تێپەڕی و لە پشت شووشەی چاویلکەکەی خۆی ئادرێسی سەر کاغەزێکی چاو لێدەکرد، چ بیرێکم بە مێشک داهات؟ نازانم گۆیا وە بیر پۆستچی ئێران، وە بیر نامەبەری پۆستی ماڵەکەمان کەوتبوومەوە.

دوێشەو بوو، چاوەکانم رێکدەکوشی. خەوم لێنەدەکەوت، بیرم پچڕپچڕ، تابلۆی بزوێنەر دەهاتنە بەر چاوم. خەون نەبوو چونکە هێشتا





خەوم لێنەکەوتبوو. مۆتە بوو، نە خەو بوو نە بێداری بەڵام ئەوانم دەدیت، لەشم سست، کوتراو، نەخۆش و قورس، سەرم دێشا. ئەم مۆتە ترسناکانە لە بەر چاوم تێدەپەڕین، لەشم شەڵاڵی ئارەقە بوو. دەمدیت: بەستە کاغەز لە حەوا لێک بڵاو دەبۆوە و پەڕپەڕ دەهاتە خوار ـ دەستەیەک سەرباز تێدەپەڕین سیمایان دیار نەبوو. شەوی تاریک و بە سام پڕ ببوو لە تارمایی ترسناک و تووڕە، کاتێک کە دەمەویست چاوەکانم بقووچێنم و خۆ تەسلیمی مەرگ بکەم ئەم وێنە سەیرانە وە دیار دەکەوتن: جەغزی گڕکان کە بە دەوری خۆی دا دەخولاوە، مردوو کە لە سەر ئاوی رووبار مەلەوەر بوو، چاوگەلێک کە لە هەر لاوە چاویان لێدەکردم. ئێستا باشم وە بیر دێتەوە بیچمە شێت و تووڕەکان شاڵاویان بۆ هێنابووم. پیرەمێردێک بە روخساری خوێناوییەوە لە کۆڵەکەیەک بەسترابۆوە. چاوی لە من دەکرد پێدەکەنی، ددانەکانی بریقەیان دەهات. شەمشەمەکوێرەیەک باڵە ساردەکانی خۆی لە سیمام دەکوتا. بە سەر پەتێکی باریک دا دەڕۆیشتم، ژێرەکەی گێژاو بوو، دەخلیسکام، دەمەویست بقژێنم، دەستێک دەکەوتە سەر شانەکانم، دەستێکی کەسیرە ئەوکی رێکدەکوشیم، وام دەهاتە بەر زەین کە دڵم دەوەستا. ناڵەکان، ناڵەگەلێکی شووم لە بنی تاریکایی شەوەکانەوە دەهات، ئەو سیمایانەی کە سێبەری لایەکیان پاک ببۆوە. ئەوان خۆبەخۆ وە دیار دەکەوتن و ون دەبوون. لە ئاست وان دەمتوانی چ بکەم؟ لە عەینی کات دا ئەوان زۆر نزیک و زۆر دوور بوون، ئەوانم دە خەونم دا نەدەدیت چونکە هێشتا خەوم لێنەکەوتبوو.

........................................................

نازانم بە هەموویان رادەبوێرم، بە خۆم رادەبوێرم بەڵام بیرێکە کە خەریکە شێتم بکا، ناتوانم بەری پێکەنینی خۆم بگرم. هەندێک جار پێکەنین بەری ئەوکم دەگرێ. ئاخرەکەی کەس نەیزانی نەخۆشی من چیە، هەموو فریویان خوارد! حەوتەیەکە کە خۆم لە نەخۆشی داوە یا نەخۆشییەکی سەیرم گرتوە ـ بتەوێ نەتەوێ سیگارم هەڵگرت و هەڵمکرد، بۆ سیگار دەکێشم؟ بۆ خۆشم نازانم. دوو ئەنگوستی چەپم کە سیگاری





ده نێوان دایە، دەنێمە سەر لێوم. دووکەڵەکەی فوو دەکەمە هەوا، ئەوەش نەخۆشییەکە!

ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە لەشم دەلەرزێ، گاڵتە نیە، حەتوویەک بوو کە خۆم بە شێوەی جۆراوجۆر ئەشکەنجە دەدا، دەمەویست نەخۆش بم. چەند رۆژێک بوو هەوا ساردی کردبوو، لە پێش دا شێرەی ئاوی ساردم بە سەر خۆم دا کردەوە، پەنجەرەی حەمامم بە ئاوەڵەیی هێشتەوە، ئێستا کە وە بیرم دێتەوە مچورکم پێدادێ: پشووم سوار بوو، پشت و سینگم وە ژان کەوت، بە خۆم کوت ئیدی تەواو. سبەی سەتڵووجەمی دەگرم و دەکەوم، پەرگرتری دەکەم و لە دواییش خۆم خەڵاس دەکەم. سبەی بەیانییەکەی کە هەستام چووکترین هەڵامەتم لە خۆم دا نەدیت. دیسان لە جلەکانم کەم کردەوە، هەوا کە تاریک بوو دەرگام لە پشتەوە داخست، چرام کووژاندەوە، پەنجەرەی ژوورەکەم کردەوە و لەبەر کزەی سەرما دانیشتم. بایەکی سارد دەهات، زۆر پیس هەڵدەلەرزام، تەقەتەقی ددانەکانم کە وێکدەکەوتن، دەبیست. چاوم لە دەرەوە دەکرد، ئەو خەڵکەی کە لە هاتوچۆ دابوون، سێبەرە رەشەکانیان، ئەو ماشێنانەی کە تێدەپەڕین لە سەرەوەی نهۆمی شەشەمی ئاپارتمانەکە، چووک ببوونەوە. لەشی رووتم تەسلیمی سەرما کردبوو و خۆم گرمۆڵە کردبۆوە، هەر ئەودەم ئەو بیرەم بە مێشک داهات کە شێت بووم، بە خۆم پێدەکەنیم، بە ژیان پێدەکەنیم، دەمزانی کە لەم تەماشاخانە گەورەیەی دونیا هەر کەسێک جۆرێک دەور دەگێڕێ هەتا دەمی مەرگی دادێ، منیش لەم دەورەم وە پێش کەوتبووم چوونکە پێموابوو زووتر لە شانۆ دەرم دەکەن. لێوەکانم وشک ببوون، سەرما لەشی دەتەزاندم، دیسان کەلکی نەبوو. خۆم گەرم کردەوە، ئارەقەم دەکرد، لەپڕ رووت دەبوومەوە، لە سەری شەوێ هەتا بەیانی لە سەر تەخت کەوتم ، دەلەرزام هیچ خەوم لێنەکەوت. هەڵامەتێکی چووکم گرت بەڵام هەر وەنەوزێکم دەدا نەخۆشییەکەم تەواو دەبوو. دیتم ئەوەش فایدەی نەکرد، سێ رۆژ بوو کە هیچم نەدەخوارد و شەوانە پەیتاپەیتا رووت دەبوومەوە لەبەر پەنجەرە دادەنیشتم، خۆم ماندوو دەکرد،





شــەوێک هەتا بەیانی بە زگی برسی بە کــۆڵانەکــانی پاریس دا هەڵاتم. ماندوو بووم، چووم لە سەر پلەکانێکی سارد و شێدار لە کۆڵانێکی تەنگ دانیشتم. نیوەشەو تێپەڕیبوو. کرێکارێکی مەست بە لا دادەهات، بە پەنام دا تێپەڕی، لەبەر رووناکی کز و ئەفسووناویی چرای گاز دوو کەسی ژن و پیاوم دیت کە پێکەوە قسەیان دەکرد و تێدەپەڕین، لە دوایی هەستام و وەڕێ کەوتم، لە سەر نیمکەتی شەقامەکان، بێ ئەنوا چارەڕەشەکان خەوتبوون. ئاخرەکەی لەبەر بێهێزیی دە جێ دا کەوتم، بەڵام نەخۆش نەبووم. دۆستەکانم دەهاتنە سەر دانم. لە ئاست وان خۆم هەڵدەلەرزاند، وەها خۆم وەک نەخۆشان لێدەکرد کە ئەوان دڵیان پێمدەسووتا. وایاندەزانی کە ئیدی سبەی دەمرم، دەمکوت دڵم دەگیرێ. کاتێک کە لە ژوور دەر دەکەوتن بە ساویلکەییان پێدەکەنیم. بە خۆم دەکوت لەوانەیە دە دونیا دا تەنیا کارێکم لە دەست دەهات: دەبا بووبامە دەورگێڕی تەئاتر!...

چلۆن دەوری نەخۆشم لە ئاست دۆستەکانم کە بۆ سەر دانم دەهاتن، لە ئاست دوکتور، دەگێڕا! هەموو باوەڕیان کردبوو کە بە راستی نەخۆشم. هەرچی پرسیبایان دەمکوت: دڵم دەگیرێ. چونکە مەرگی کوتوپڕ تەنیا لە دڵ گیرانەوە دێ دەنا سینگ ئێشەیەکی چووک لەپڕ ناتکووژێ.

ئەمە موعجزەیەک بوو. کاتێک بیر دەکەمەوە حاڵێکی سەیرم تێدا پێکدێ. حەوت رۆژ بوو کە خۆم ئەشکەنجە دەکرد، ئەگەر بە زۆریی و تکای دۆستان داوای چام لە خاوەنماڵ کردبا و خواردبامەوە، دەهاتمەوە سەر خۆ. ترسناک بوو، نەخۆشیی بە تەواوەتی بنەبڕ دەبوو. چەندەم پێخۆش بوو ئەو نانەی کە لە پەنا چایەکە داندرابوو بیخۆم بەڵام نەمدەخوارد. هەموو شەوێک بە خۆم دەکوت ئیدی کەوتووم سبەی ئیدی ناتوانم لە جێ هەستمەوە، دەچووم ئەو کاشانەی کە تۆزی تریاکم تێکردبوون دەمهێنان. دە کەشۆی مێزە چووکەکەی پەنا تەختی خەوەکەم دەنا هەتا کاتێک نەخۆشیی باش بڕستم لێببڕێ و نەتوانم لە جێی خۆم ببزووم ئەوان دەربێنم و بیانخۆم. بەداخەوە نەخۆشیی نەدەهات و





نەیدەویست بێ. جارێک کە لەبەر چاوی یەکێک لە دۆستەکانم ناچار بووم کوتە نانێکی چووک دەگەڵ چا بخۆم هەستم کرد کە چاک بوومەوە، بە تەواوەتی چاک بوومەوە. لە خۆم ترسام، لە گیانسەختیی خۆم ترسام، بە سام بوو، جێی باوەڕ کردن نیە، ئەوانە کە دەنووسم هۆشم لە سەر خۆمە، پەرت و پەلای ناڵێم، باش لە بیرمە.

ئەوە چ هێزێکە دە من دا پێکهاتبوو؟ دیتم هیچکام لەم کارانە کەلکی نیە، دەبێ بە راستی نەخۆش بکەوم. ئادی ژاری پیاوکوژ لەوێ دە کیفەکەم دایە، ژاری یەکاویەک. وە بیرم دێتەوە ئەو رۆژە بارانییەی کە بە درۆ و دەلەسە و هەزار زەحمەت ئەوم بە ناوی عەکاسێک کڕیبوو، ناو و ئادرێسی بە درۆم دابوو؛ « سیانوور دۆ پتاسیۆم » کە لە کتێبی پزشکی دا خوێندبوومەوە و نیشانەکانیم دەناسی: چەق و چۆ، هەناسەسواریی، گیان دان لە خورێنی دا، بیست گرەمی دەستبەجێ یا دە دوو دەقیقە دا پیاو دەکووژێ. بۆ ئەوەی کە بە هەوا خراپ نەبێ لە جغجغەی شەگەڵاتم پێچابۆوە و بە توێژێک مێو دامپۆشیبوو و دە شووشەیەکی سەربەستی بلووریم نابوو. ئەندازەکەی سەد گرەم بوو و من وەک گەوهەرێکی گرانبایی پێمبوو. بەڵام بەختەوەرانە شتێکی باشتر لەوم وە گیر کەوت: تریاکی قاچاغ، ئەویش لە پاریس! تریاک کە ماوەیەکی زۆر بوو بە شوێنیەوە بووم بە هەڵکەوت وە چنگم کەوت. خوێندبوومەوە کە مردن بە تریاک زۆر خۆشتر و باشتر لە ژاری یەکەمە؛ ئێستا دەمەویست خۆم بە راستی نەخۆش بکەم و لە دوایی تریاکی بخۆم.

سیانووری دۆ پۆتاسیۆمم کردەوە، لە قەراغی گرمۆڵە هێلکەیەکییەکەی بە قەرا دوو گرەمم تاشی، دە کاشەیەکی بەتاڵم نا، بە چەسپ لێوارەکەیم چەسپ کرد و خواردم. نیو سەعاتێک تێپەڕی، هیچ هەستێکم نەکرد، سەر کاشەکە کە هەندێکی ئاوێتە ببوو سوێر بوو. دیسان هەڵمگرتەوە. ئەمجارە بە قەرا پێنج گرەمم لێ تاشی و کاشەکەم قووت دا، چووم دە تەختەکەم دا خەوتم، وەها خەوتم کە بەشکەم ئیدی هەڵنەستمەوە!

ئەم بیرە هەر پیاوێکی ئاقڵ شێت دەکا، نا هیچ هەستێکم نەکرد، ژاری





پیاوکوژ کاری تێنەکردم! ئێستاش زیندووم، ژاریش لەوێ دە کیفەکەم دا کەوتوە، من دە نێو تەختەکەم دا پشووسوارم، بەڵام ئەمە لەبەر کار تێکردنی ئەو دەرمانە نیە. من بوومە نەمر، ئەو نەمرەی کە لە ئەفسانەکان دا نووسیویانە. جێی باوەڕ کردن نیە بەڵام دەبێ بڕۆم بێهوودە ژیانم وەلا نراوە، بێخود، بێکەلک، دەبێ هەرچی زووتر خۆم خلاس کەم و بڕۆم. ئەمجارە گاڵتە نیە هەرچی بیر دەکەمەوە هیچ شتێک من بە ژیان نابەستێتەوە، هیچ شتێک و هیچ کەسێک ...

لە بیرمە بەسرپێرێ بوو وەک شێتان دە ژوورەکەم دا دەخولامەوە، لێرەوە بۆ وێ دەچووم. ئەو جلانەی کە بە دیوارەوە هەڵواسراون، کاسەی رووشۆریی، ئاوێنەی دەرگای شکاف، وێنەیەک کە بە دیوارەوەیە، تەختی خەو، مێزی نێو ژوور، ئەو کتێبانەی کە لە سەری کەوتوون، سەندەڵییەکان، کەوشێک کە لە بن شکاف داندراوە، چەمەدانەکانی سووچی ژوور، پەیتاپەیتا لەبەر چاوم تێدەپەڕین. بەڵام من ئەوانم نەدەدیت یا سەرنجم نەدەدانێ، بیرم لەچی دەکردەوە؟ نازانم ـ لەخۆوە دەخولامەوە. لە نەکاو وەخۆ هاتمەوە، ئەم رێگا رۆیشتنە وەحشیانەم لە شوێنێک دیتبوو و سەرنجی منی بۆ لای خۆی راکێشابوو. نازانم لە کوێ، وە بیرم هاتەوە، لە باغی وەحشی بێرلین، یەکەم جار بوو کە گیانداری دڕم دەدیت، ئەوانەی کە لە قەفەسەکانی خۆیان دا بەخەبەر بوون ئاوا بە رێ دا دەرۆیشتن دروست هەروا. ئەودەمیش منیش وەک ئەم گیاندارانەم لێهاتبوو؛ لەوانەیە وەک ئەوانیش بیرم دەکردەوە، دە خۆم دا هەستم دەکرد کە وەک ئەوانم، ئەو رێگا رۆیشتنە بەبێ ویستی خۆ، خولانەوە بە دەوری خۆم دا، وە دیوار کە دەکەوتم ئاساییە کە هەستم دەکرد بەرهەڵستە و دەگەڕامەوە، ئەو گیاندارانەش هەر ئەو کارەی دەکەن...

نازانم چ دەنووسم. چرکەچرکی سەعات هەروا لە بن گوێم دەنگی دێ. دەمەوێ هەڵیگرم و لە پەنجەرەوە بۆ دەرەوە تووڕی بدەم. ئەم دەنگە بە سامە کە تێپەڕینی زەمان بە چەکوچ لە کەللەم دەکوتێ!

حەوتەیەک بوو کە خۆم ئامادەی مەرگ دەکرد، هەرچی نووسراوە و





کاغەز هەمبوو هەمووم فەوتاندن، جلە پیسەکانم فڕێ دان هەتا دوای من کە شتەکانم دەپشکنن شتی چڵکن نەبیننەوە. ژێرجلی نوێ کە کڕیبووم دەبەرم کرد، هەتا وەختایەک کە لە تەخت دەرمدەکێشن و دوکتور دێ و موعاینەم دەکا، شیک بم. شووشە ئۆدکۆڵۆنێکم هەڵگرت بە تەختەکەم داکرد هەتا بۆنخۆش بێ. بەڵام لەبەر ئەوە کە هیچکام لە کارەکانم وەک ئەوانی دیکە نەبوو ئەمجارەش دڵنیا نەبووم. لە گیانسەختیی خۆم دەترسام، دەتکوت ئەم شاز و پلەیە بەسانایی نادەن بە کەس، دەمزانی کە وا بە بەلاش کەس نامرێ ...

وێنەی کەس و کاری خۆم هێنا و چاوم لێکرد، هەرکام لەوان وەک بۆچوونی خۆم هاتنە بەر چاوم. ئەوانم خۆش دەویستن و خۆش نەدەویستن، دەمەویست بیانبینم و نەمدەویست. ئایا یادگارییەکانیان زۆر لەبەر چاوم روون بوو، وێنەکانم دڕاندن، نا هۆگرییەکم نەبوو، خۆم قەزاوەت کرد دیتم پیاوێکی دڵاوا نەبووم؛ من رەق، تووڕە و بێزار ساز کراوم، لەوانەیە وەها نەبووم هەتا رادەیەکیش ژیان و رۆژگار منیان والێکرد؛ لە مەرگیش هیچ نەدەترسام. بە پێچەوانە نەخۆشییەک، شێتایەتییەکی تایبەت دە من دا پێکهاتبوو کە بۆ لای میغناتیسی مەرگ دەکێشرام. ئەمەش شتێکی تازە نیە، نەقلێکم وە بیر هاتەوە. هی پێنج شەش ساڵ لەمەوبەرە: لە تاران بەیانییەکی زوو چووم لە شەقامی شائاباد لە عەتتارییی تریاکی بکڕم، ئەسکناسی سێ تمەنییم لە پێش دانا، کوتم: دوو قڕان تریاک. ئەو بە ردێنی خەناوی و ئارەقچنێک کە لە سەری بوو سڵاواتی دەنارد، لە بنەوە چاوێکی لێکردم، دەتکوت پیاوێکی رووناسە یا فکری منی خوێندەوە کوتی: وردەمان نیە. دوو قڕانم دەرهێنا دامێ. کوتی: هەر نایفرۆشین. هۆیەکەم پرسی وەڵامی داوە: ئێوە جحێڵ و نەزانن خودای نەکەردە لەپڕ لە سەرتان بدا تریاک دەخۆن. منیش زۆرییم نەکرد.

نا کەس تەمای خۆکوژیی ناگرێ، خۆکوژیی دەگەڵ هەندێکان هەیە. دە زات و دەروونیان دایە. ئادی چارەنووسی هەر کەسێک لە سەر نێوچاوانی





نووسـراوه، خۆکوژییش دەگەڵ هەندێکان زاوە. من هەمیشە گاڵتەم بە ژیان هاتوە، دونیا، خەڵک هەموویانم لەبەر چاو وەک لەیستۆکێک، نەنگێک، شتێکی پووچ و بێ مانایە. دەمەویست بخەوم و ئیدی هەڵنەستمەوە و خەونیش نەبینم، بەڵام چونکە لە لای هەمووکەس خۆکوژیی کارێکی سەیر و سەمەرەیە دەمەویست خۆم زۆر پیس نەخۆش بکەم، مردەلۆخە و بێهێز بم و دوای ئەوە کە چاو و گوێی هەموویان پڕ بوو تریاکی بخۆم هەتا بڵێن: نەخۆش کەوت و مرد.

........................................................

دە تەختەکەم دا یادداشت دەنووسم. سێی نیوەڕۆیە. دوو کەس سەریان دام، ئێستا رۆیشتن، تەنیا مامەوە. سەرم دە گێژەوە دێ، لەشم سووک و ئاسوودەیە، گەدەم فنجانێک شیر و چای تێدایە، لەشم شل، سست و گەرمایەکی ناخۆشی هەیە. سازێکی خۆشم لە سەفحەی گرامافۆن بیستبوو. وە بیرم هاتەوە. دەمەوێ بە فیتوو لێیدەمەوە ناتوانم، بریا ئەو سەفحەیەم دووبارە بیستباوە. ئێستا نە ژیانم پێخۆشە و نە پێم ناخۆشە، دەژیم بەبێ ویست، بەبێ مەیل، هێزێکی نادیار منی راگرتوە. لە زیندانی ژیان لە ژێر زنجیرە پۆڵایینەکان بەستراومەوە. ئەگەر مردبام دەیانبردم لە مزگەوتی پاریس دەکەوتمە دەست عەرەبێکی بێخێو، دیسان دەمردمەوە، لە شوباریان بێزارم. بە هەر حاڵ بۆ من تۆفیرێکی نەدەکرد. دوای ئەوە کە من مردبێم دە ئاودەستیشم باوێن فەرقی پێناکەم، ئاسوودە دەبووم. تەنیا ماڵەوە شینیان دەگێڕا، وێنەی منیان دێنا، پێیانهەڵدەکوتم، لەم کارە چەپەڵانەی کە باوە. هەموو ئەوانە بە رای من گەوجانە و پووچە. لەوانەیە چەند کەس بە زیادەوە تاریفیان دەکردم و چەند کەسیش رەدیان دەکردەوە، بەڵام لە ئاکام لە بیر دەکرام، من هەر خۆخواز و نەچەسپم.

هەرچی بیر دەکەمەوە، درێژە دان بەم ژیانە بێسوودە. من بوومە میکرۆبێکی کۆمەڵ، بوونەوەرێکی زیانی خورۆ، سەرباری خەڵک، هەندێک جار شێتایەتییم دەپشکوێ، دەمەوێ بڕۆمە دوور، زۆر دوور، بۆ وێنە بڕۆمە سیبیری، نێو ماڵە تەختەییەکانی بن داری کاژ، ئاسمانی بۆر،





بەفر، بەفری قورس، بۆ نێو مووژیکەکان؛ بڕۆم ژیانی خۆم سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە. یا بۆ وێنە بڕۆمە هیندووستان، بن هەتاوی گەش، لێرەوارە تێکچڕژاوەکان، دە نێو خەڵکی سەیر و سەمەرە، بچمە شوێنێک کە کەس نەمناسێ، کەس زمانم نەزانێ، دەمەوێ هەموو شت دە خۆم دا هەست پێبکەم. بەڵام دەبینم بۆ ئەم کارە ساز نەکراوم، نا من تەوەزەل و تەنبەڵم. بە هەڵە هاتوومە سەر دونیا، وەک داری دوو سەر گواوی لێرە داماو و لەوێ دەرکراو، دەست لە هەموو نەخشەکانم هەڵگرت، لە ئەوین، لە خۆشیی، لە هەموو شت خۆم کێشاوە، ئیدی سەر بە بەرەی مردووەکان دەژمێردرێم.

هەندێک جار دەگەڵ خۆم نەخشەی گەورە دەکێشم، خۆ بە شایەنی هەموو کار و هەموو شتێک دادەنێم و بە خۆم دەڵێم: ئادی تەنیا ئەو کەسانەی کە دەستیان لە گیان بەرداوە و لە هەموو شت هیوابڕاوە دەتوانن کارگەلی گەورە بکا. دوایە بە خۆم دەڵێم: کەلکی چییە؟ چ سوودێکی هەیە؟... شێتایەتی، هەموو شێتایەتییە! نا، بڕۆ خۆت بکووژە، با کەلاکەکەت لەم نێوە بکەوێ، بڕۆ، تۆ بۆ ژیان ساز نەکراوی، کەمتر فەلسەفەی ڕێکخە، بوونی تۆ هیچ بایەخێکی نیە، تۆ بۆ هیچ کارێک نابی! بەڵام نازانم بۆ مەرگ نازی کرد؟ بۆ نەهات؟ بۆ نەمتوانی وە شوێن کاری خۆم کەوم و ئاسوودە بم؟ حەوتوویەکە کە خۆم ئەشکەنجە دەکرد. ئەوەش حەقدەستەکەم بوو! ژاریش کاری تێنەکردم، جێی باوەڕ کردن نیە، ناتوانم باوەڕ بکەم. چێشتم نەخوارد، خۆم وەبەر سەرما دا، سرکەم خواردەوە، هەموو شەوێک پێموابوو ئازارەباریکەم گرتوە، بەیانی کە هەڵدەستام حاڵم لە ڕۆژی پێش باشتر بوو. بۆ کێ دەتوانم ئەمە بگێڕمەوە؟ یاوێکیشم نەگرت، بەڵام خەونیشم نەدیوە، چەرەسیشم نەکێشاوە. هەمووم زۆر باش لە بیرە. نا، جێی باوەڕ کردن نیە.

ئەوانەم کە نووسی کەمێک سووک بووم، دڵی دامەوە، دەڵێی بارێکی قورسیان لە سەر شانم هەڵگرت. چەند باش دەبوو ئەگەر کرابا هەموو شت بنووسی، ئەگەر توانیبام خەڵک دە بیرەکانی خۆم بگەیەنم، دەمتوانی





بڵێم، نا هەستگەلێک هەن، شتەهایەک هەن کە ناکرێ خەڵکی لێ حاڵی بکەی، ناکرێ بیڵێی، گاڵتە بە پیاو دەکەن. هەرکەس بە پێی بیر و بۆچوونی خۆی کەسێک هەڵدەسەنگێنێ. زمانی مرۆڤ وەک خودی ئەو کەموکووڕی هەیە و بێدەستەڵاتە.

من نەمرم. ژار کاری تێنەکردم، تریاکم خوارد فایدەی نەبوو. ئادی من بوومە نەمر. هیچ ژارێک کارم تێناکا. لە ئاکام دیتم هەموو زەحمەتەکانم بە فیڕۆ چوو. پێرێشەوێ بوو، تەمام گرت هەتا گەندی دەرنەهاتوە ئەو گاڵتەیە تەواو بکەم، چووم کاشەی تریاکم لە کەشۆی مێزە چووکەکەم دەرهێنا. سێ دانە بوو، بە قەرا لوولێکی تریاکی ئاسایی دەبوو. ئەوانم هەڵگرت. سەعات حەوت بوو. داوای چام لە خوارەوە کرد، هێنایان. یەکسەر خواردمەوە. هەتا سەعات هەشت کەس بۆ لام نەهات، دەرگام لە پشتەوە داخست، چوومە بەر وێنەیەک کە بە دیوارەوە بوو، وەستام. چاوم لێکرد. نازانم چ بیرگەلێک روویان تێکردم، بەڵام ئەو لەبەر چاوم کەسێکی بێگانە بوو. بە خۆم دەکوت: ئەم مرۆڤە چ پێوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ بەڵام ئەم سیمایەم دەناسی. ئەوم زۆر دیبوو. دوایە گەڕامەوە، هەستی شێواویی، ترس یا نەخۆشییم نەبوو. هەموو ئەو کارانەی کە کردبووم، ئەو کارانەی کە دەمەویست بیکەم و هەموو شت لام بێخود و پووچ بوو. سەراسەری ژیانم پێ گاڵتە بوو، چاوێکم لە دەوروبەری ژوورەکە گێڕا. هەموو شت لە سەر جێی خۆیان بوون، چوومە بەر ئاوێنەی دەرگای شکاف، چاوم لە سیمای سوورهەڵگەڕاوی خۆم کرد، چاوەکانم نیوە قووچاو، زارم هەندێک لێک کردەوە و سەرم وەک مردوو لار کردەوە. بە خۆم کوت: سبەی بەیانی ئاوام لێدێ، دە پێش دا هەرچی لە دەرگا دەدەن کەس وەڵام ناداتەوە، هەتا نیوەڕۆ وادەزانن کە خەوتووم. لە دوایی دەرگا لە ڕێسمە دەبەنە دەر، دێنە ژوور و من بەم حاڵە دەبینن، هەموو ئەم بیرانە وەک بەرق بە بەر چاوم دا تێپەڕین.

لیوانی ئاوم هەڵگرت، لە سەرەخۆ بە خۆم کوت کە کاشەی ئاسپرینە و کاشەی یەکەمم قووت دا و دووهەمی و سێهەمیشم بە پەلە بە دوای دا





قـووت دا. هـەسـتـم بە لـەرزێکی کـەم دە خـۆم دا کـرد، زارم بۆنی تـریاکی گـرت، دڵم هەنـدێک توندی لێـدا. سـیگاری نیـوەکـێـشـراوم خـسـتـە نێـو ژێرسیگار. چووم حەبی خۆشبۆنم لە گیرفانم دەرهێنا، مژتم، دیسان خۆم لەبەر ئاوێنە دیت، چاوێکم لە دەوروبەری وەتاغ گێڕا ـ هەموو شتـەکان لە سـەر جـێی خـۆیان بوون. بە خـۆم کـوت ئیـدی کـار تەواوە، سـبـەی ئەفـلاتـوونیش ناتـوانێ زیندووم کـاتەوە! جلەکـانم لە سـەر سـەندەڵی بەر تەختـەکـەم رێکوپێک کرد، لێفـەکەم بە سـەر خـۆم دادا، بۆنی ئـۆدکۆڵۆنی گرتبـوو. دوگمەی چرام بادا وەتاغ خامـۆش بوو، کوتێک لە دیوار و بنەوەی تەخت بـە نوورێکی تلـّخ و کز کـە لـە پشت شـووشـەی پەنجـەرەوە دەهات، کـەمـێک روونـاک بـوو، ئیـدی کـارێکم نەمـابـوو، باش یا خـەراپ کـارەکـەم گەیاندبوو ئێـرەکانە. نوستم، جینگڵم دا، هەموو بیرم لە سـەر ئەوە بوو کە نەکا کەسێک سەرم بدا و پەڵپم پێبگرێ. سەرەڕای ئەمە کـە بە هەموویانم کـوتبـوو چەند شـەوە نەخـەوتووم هـەتا لە کـۆڵم بنـەوە. لەم کـاتـە دا وردکـۆڵیـیـەکی زۆرم هـەبـوو. وەک ئەوەی کـە پێـشـهـاتێکی تایبـەتیـیم بۆ هـاتبێـتە پێش، یا سـەفەرێکی خـۆشم لەبەر بێ، دەمەویست باش هەست بە مردن بکەم. زەینم دابوو بەر خۆم بەڵام گوێم لە دەرەوە هـەڵخستـبـوو. هـەر تەپەی پـێیـەک دەهـات دڵم دادەخـورپا. پێـڵـووکـانم وێکنا. دە دەقـیـقـە یا کەمێک پتر هیچ نەقەوما، بە بیری جۆراوجۆر خـۆم خەریک کـردبوو بەڵام لەو کـارەی خـۆم نە پـەشـیـمـان بووم و نە دەترسـام. هەتا ئـەوە کـە هـەسـتـم کـرد تـۆزەکـان دەست بە کـار بوون. دە پێش دا قـورس بووم؛ هەسـتـم بە مـاندوویەتی کرد؛ ئەم هـەستـە لە دەوروبەری زگم پتر بوو، وەک کـاتێک کـە خـواردەمـەنی باش هـەزم نـەبووبێ، لە دوایی ئەم مـاندوویەتیـیـە گـەیشـتـە سینگ و سـەرم. دەستەکانم جووڵاندەوە، چاوەکانم کردەوە. دیتم هـۆشـم لە سـەر جێی خـۆیەتی، تینـووم بوو، زارم وشک ببوو، بـە زەحمـەت ئاوی زارم قـووت دا، ترپەی دڵـم سـەبر ببـۆوە. تاوێک گوزەرا هـەسـتم کـرد هـەوایەکی گەرم و خۆش لە هەموو لەشم دەچوە دەرەوە، پتر لە شوێنە دەرپەڕاوەکانی لەش بوو؛ وەک سـەری قـامکەکانم، سـەری کەپۆ و شوێنەکانی دیکە ... لەو





حاڵە دا دەمزانی کە دەمەوێ خۆم بکووژم، وە بیرم هاتەوە کە ئەم هەواڵە بۆ تاقمێک ناخۆشە، پێم سەیر بوو. هەموو ئەوانە لە بەر چاوم منداڵانە، پووچ و پێکەنینیی بوو. لای خۆم بیرم دەکردەوە کە ئێستا ئاسوودەم و بە ئاسوودەیی دەمرم، چ گرینگایەتییەکی هەیە کە خەڵک ناڕەحەت دەبن یا نابن، دەگرین یا ناگرین؟ زۆرم پێخۆش بوو کە ئەم کارە سەر بگرێ و دەترسام نەکا جووڵەیەک بکەم یا بیرێک بکەمەوە کە بەری کار تێکردنی تریاک بگرێ. تەواوی ترسەکەم لەمە بوو کە نەکا دوای ئەو هەموو زەحمەتە زیندوو بمێنمەوە، دەترسام کە ئاویلکە دان سەخت بێ و لە ناهومێدیان هاوار یا داوای یارمەتی بکەم. بەڵام کوتم هەر چەند سەختیش بێ تریاک دایدەمرکێنێ و چ هەست پێناکەم. باش خەوم لێدەکەوێ و ناتوانم لە سەر جێ جووڵەی بکەم یا شتێک بڵێم، دەرگاش لە پشتەوە بەستراوە!...

ئادی، بە تەواوی لە بیرمە. ئەم بیرانەم لێ پەیدا بوو. چرکەی یەکجۆرەی سەعاتم گوێ لێدەبوو، تەپەی پێی خەڵک کە لە میوانخانە دا هاتوچۆیان دەکرد، دەبیست. دەتگوت هەستی بیستنم بەهێزتر ببوو. هەستم دەکرد کە لەشم دەپەڕێ، زارم وشک ببوو، هەندێک سەرم دێشا، دە حاڵی خۆم دابووم، چاوەکانم نیوەکراوە بوو. هەناسە هەندێک جار توند و هەندێک جار سەبر دەبۆوە. لە هەموو کونەکانی پێستم ئەم گەرما خۆشە دەدەڵا دەرەوە. دەتکوت منیش بە دوای دا دەچمە دەرەوە. زۆرم پێخۆش بوو تەوژمەکەی پتر بێ، لە عالەمێکی خۆش دابووم. هەر بیرێکم ویستبا دەمکرد. ئەگەر دەجووڵامەوە هەستم دەکرد کە دەبمە هۆی نەچوونە دەری ئەم گەرمایە. هەرچی راحەتتر خەوتبام باشتر بوو. دەستی راستم لە بن لەشم دەرکێشا، جینگڵم دا، لە سەر پشت درێژ بووم، هەندێک ناخۆش بوو، دیسان وەک پێشووم لێهاتەوە و شوێن داخستنی تریاک پتر ببوو، دەمزانی و دەمەویست کە باش هەست بە مردن بکەم، هەستەکانم توند و گەورە ببوون، پێم سەیر بوو کە بۆ خەوم لێنەکەوتوە؟ دەتکوت کە تەواوی وجوودی من بە چەشنێکی خۆش و بە





لەزەت لە لەشم دەچوە دەر، دڵم سەبر دەیکوتا، سەبر هەناسەم هەڵدەکێشا، پێموایە سێ سەعات تێپەڕیبوو. لەم بەینە دا کەسێک لە دەرگای دا، زانیم دراوسێکەمە بەڵام وەڵامم نەداوە و نەمویست لە جێی خۆم جووڵەی بکەم، چاوەکانم هەڵێنا و دیسان وێکم ناوە، دەنگی کرانەوەی دەرگای ئەوم بیست، ئەو دەستی شوشت، فیتووی بۆ خۆی لێدا، هەمووم بیست، هەوڵم دەدا بیری خۆش بکەمەوە، بیرم لە پار دەکردەوە، ئەو رۆژەی کە دە کەشتی دا بووم، سازی دەستییان دەژەنی، شەپۆلی دەریا، راژانی کەشتی، کچێکی جوان کە لە بەرابەرم دانیشتبوو، نوقمی بیرەکەی خۆم بووم، بە دوای دا هەڵدەهاتم. دەتکوت باڵم لێڕواوە و لە فەزا دا خولم لێدەدا، سووک و چوست ببووم وەها کە ناتوانم دەریبڕم. جیاوازیکە ئەوەندەیە کە ئەو تیشکەی کە بە ئاسایی دەیبین لە نەشەی تریاک دا وەک ئەوەیە کە هەر ئەو تیشکە لە پشت ئاوێزەکانی چلچرا یا مەنشوورێکی بلوورییەوە بیبین کە بە رەنگی جۆراوجۆر دابەش دەبێ. لەم حاڵەتە دا خەیاڵە سادە و پووچەکان کە بۆ مرۆڤ پەیدا دەبێ، هەر ئاوا ئەفسووناویی و زەق دەبێتەوە، هەر خەیاڵێکی تێپەڕ و بێکەلک شێوەیەکی دڵڕفێن و بەشکۆ بە خۆیەوە دەگرێ. ئەگەر دیمەنێک بە مێشکی مرۆڤ دا تێپەڕێ زۆر گەورە دەبێتەوە، فەزا هەڵدەمسێ، تێپەڕینی کات هەست پێناکرێ.

لەم کاتە دا زۆر قورس ببووم، هۆشم لە سەرەوەی لەشم شەپۆلی دەداوە. بەڵام هەستم دەکرد کە خەوم لێنەکەوتوە. دوایین هەستێک کە لە کەیف و نەشەی تریاک وە بیرمە ئەمە بوو: کە پێیەکانم سارد و تەزیبوون، لەشم بێ بزووت، هەستم دەکرد کە دەڕۆم و دوور دەبمەوە. بەڵام کە شوێن داخستنەکەی تەواو بوو غەم و پەژارەیەکی لە رادەبەدەر دایگرتم، هەستم کرد کە هۆشم دێتەوە سەر جێی خۆی. زۆر سەخت و ناخۆش بوو. سەرمام بوو، پتر لە نیو سەعات زۆر توند هەڵلەرزام، تەقەتەقی ددانەکانم کە وێکدەکەوتن، دەبیست. دوایە یاو هات، یاوێکی بە تین کە ئارەقە لە لەشم دەتکا، دڵم دەگیرا، هەناسەم سوار ببوو. یەکەم بیرێک کە هاتە





مێشکمەوە ئەمە بوو کە هەرچی رستبووم هەڵوەشاوە و ئەوەی کە دەبا بووبا نەبوو، پتر سەیرم بە گیانسەختیی خۆم هاتبوو، زانیم کە هێزێکی تاریک و بەدبەختییەکی ناگوتەنی دەگەڵ من دە کێشە دایە.

بە زەحمەت نیوەی لەشم لە تەخت هەڵێنا، دوگمەی چرای بەرقم بادا، هەڵبوو. نازانم بۆ دەستم بۆ لای ئاوێنەیەکی بچووک کە لە سەر مێزی پەنا تەخت بوو چوو، دیتم دەم و چاوم پەنەمەیوە، رەنگم بۆر ببوو، فرمێسک لە چاوەکانم دەهاتنە خوار، دڵم توند دەیکوتا، بە خۆم کوت لانیکەم دڵم خراپ بوو! چرام کووژاندەوە و خۆم خستەوە سەر تەخت.

نا، دڵم خراپ نەبوو، ئیمرۆ باشترە، نا، خوێ برش هەڵناهێنێ، دوکتور هاتە سەرم، گوێی لە دڵم گرت، نەبزی گرتم، زمانی چاو لێکردم، دەرمجە (گەرماپێو)ی دانا، لەو کارە ئاساییانەی کە هەموو دوکتورەکان هەر گەیشتنێ دەیکەن و لە هەموو جێی دونیا وەک یەکە. خوێ، میوە و گەنەگەنەی دامێ، هیچ تێنەگەیشت چ دەردێکم هەیە! کەس ناتوانێ پەی بە دەردی من بەرێ!ئەم دەرمانانە فشەن، لەوێ لە سەر مێز حەوت هەشت جۆر دەرمانیان بۆ قەتار کردووم، من لەبەر خۆم پێدەکەنم، چ نمایشخانەیەکە!

چرکەچرکی سەعات هەروا لە بن گوێم دەنگ دەداتەوە، دیدەی ماشێن و هارەی ماتۆڕ لە دەرەوە دێ. چاو لە کاغەز دیواری دەکەم، گەڵا باریکەکان ئەرخەوانییەکی تۆخن و هێشوو گوڵی سپییان پێوەیە، لە سەر چڵەکەی نێوەنێوە دوو مەلی رەش لە بەرابەری یەک هەڵنیشتوون، سەرم بەتاڵە، دڵم دەبوورێتەوە، لەشم کوتراوە. ئەو رۆژنامانەی کە لە سەرەوەی شکاف فرێم داون بە شێوەیەکی تایبەت ماون، چاو کە لێدەکەم لەپڕ وەک ئەوەیە کە هەموو ئەوانە لە بەر چاوم غەریبەن، خۆم بە چاوی خۆم بێگانەم، پێم سەیرە کە بۆچ زیندووم؟ بۆچ هەناسەی هەڵدەکێشم؟ بۆچ برسیم دەبێتەوە؟ بۆچ دەخۆم؟ بۆچ بە رێ دا دەرۆم؟ بۆچ لێرەم؟ ئەو خەڵکەی کە دەیانبینم کێن و چیان لە من دەوێ؟...

ئێستا باش خۆم دەناسم، هەر ئەو جۆرەی کە هەم بێ کەم و زیاد،





هیچ کـارێک ناتـوانم بکەم، لە ســەر تەخت شـەکـەت و مـاندوو کـەوتووم، سـەعات بە سـەعات بیرەکانم دەگەڕێن، لە هەمان جەغزی ناهومێدیی دا دەگەڕێن. تاقـەتم بە سـەر چوە، وجـوودی خـۆم سـەرسـوڕمـاوی کردووم، چەند تاڵ و ترسناکە کاتێک کە مرۆڤ وجوودی خـۆی هەست پێدەکا! کە سـەیری ئاوێنە دەکـەم بـە خـۆم پێدەکەنم، روخسـارم لە روانگەی خـۆمـەوە ئەوەندە نەناسیاو، بێگانە و گاڵتەجارە...

ئەم بیرەم چەند جـار تێدا پێکهاتوە: بوومـە نەمـر، ئەو نەمرەی کە لە ئەفسانەکان دا نووسیـویانە حەکایەتی منە. موعجزە بوو. ئێستا هەموو چەشنە پڕوپووچ و قـســەی قـۆڕێک باوەڕ دەکـەم، ئـەم بیـرە ســەیر و سەمـەرانە بە بەر چاوم دا تێدەپەڕن. موعجزە بوو! ئێستا دەزانم خودا یا هەر سـندانێکی دیکە، لە زوڵم و زۆریی بێـبـڕانەوەی خـۆی دوو دەسـتـە خوڵقاوی ئافراندوە: خۆشبـەخت و بەدبەخت. پشتیـوانی لە یەکەمییـەکان دەکا و لە ئازار و ئەشکەنجـەی دەستـەی دووهـەم زیاد دەکا. ئێستا باوەڕ دەکەم کە هێـزێکی دڕ و ڕەزیل، فریشـتـەیەکی بەدبەختیی دەگەڵ هەندێک کەسان هەیە...

..........................................................

ئاخـرەکـەی تـەنیـا مـامـەوە، ئێسـتـا دوکـتـور رۆیشت، کـاغـەز و قـەڵەمم هەڵگرت، دەمـەوێ بنووسم، نازانم چی؟ یا هـیـچم پێ نیـە یا ئەوەندە زۆرە کە ناتوانم بنـووسم. ئەوەش بۆ خـۆی بەدبەختـییـە. نـازانم، ناتوانم بگریم. لەوانەیە ئەگـەر گریابام هەندێک سـووک بووبام! نـاتوانم. وەک شـێـتـەکـانم لێـهـاتوە. لە ئاوێنـە دا دیتم کـە تووکی سـەرم چینی تێکەوتوە، چاوەکـانم ئاوەڵە و بێـحـاڵـەتن، بیـر دەکـەمـەوە کـە روخـسـارم نابێ وەهـا بـووبێ، روخساری زۆر کەس دەگەڵ بیرەکانیان جیاوازیان هەیە؛ ئەمە پتر تووڕەم دەکـا. ئـەوەندە دەزانم کـە رقـم لە خـۆم هـەڵدەسـتـێ، دەخـۆم رقم لـە خـۆم هەڵدەستێ، بە رێ دا دەڕۆم رقم لە خـۆم هەڵدەستێ، بیر دەکەمەوە رقم لە خـۆم هەڵدەسـتێ ـ چ منجـڕ! چ بە سـام! نـا ئەمـە هێـزێکی ئەوپەڕی مـرۆڤ بوو. سندانێک بوو. ئێسـتـا باوەڕ بەمـجـۆرە شـتـانە دەکـەم! ئیـدی هیچ





شتێک کارم تێناکا. سیانوورم خوارد کاری تێنەکردم. تریاکم خوارد دیسان زیندووم! ئەگەر ئەژدیهاش پێوەم دا، ئەژدیها دەمرێ؛ نا کەس باوەڕ ناکا. ئایا ئەم ژارانە خراپ ببوون؟ ئایا بە رادەی پێویست نەبوون؟ ئایا پتر لە رادەی ئاسایی بوون؟ ئایا ئەندازەکەییم بە هەڵە دە نێو کتێبەکانی پزشکی دا دیتبۆوە؟ ئایا دەستی من ژار دەکاتە نۆشداروو؟ نازانم ـ ئەم بیرانە سەدجار لێم پەیدا بوون و بۆم تازە نین. وەبیرمە بیستوومە کاتێک لە دەوری دووپشک ئاگر بکەنەوە بە خۆیەوە دەدا ـ ئایا لە دەوری من ئاڵقەیەکی ئاگرین نیە؟

لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەم، لە سەر لێواری رەشی شیروانی کە ئاوی باران دە قوڵکەکەی دا کۆ بۆتەوە، دوو چۆلەکە نیشتوون. یەکێک لەوان دندووکی دە ئاو دەنێ، سەری هەڵدێنێ، ئەوی دیکە لە پەنای ئەو هەڵکورماوە و خۆی دەپشکنێ. من جووڵەم کرد، هەردووکیان جیواندیان و پێکەوە هەڵفڕین. هەوا هەورییە، هەندێک جار لە پشت پەڵە هەورەکان، خۆرەتاوی رەنگ بزرکاو دێتە دەرەوە، ئاپارتومانە بڵندەکانی بەرابەر، هەموویان دووکەڵاویی، رەش و غەمێنەر لە ژێر زەختی ئەم هەوا قورس و بارانییە دا ماون. دەنگی دوور و خەفەی شار دەبیسرێ.

ئەم پەڕە بەدزاتانە کە فاڵم پێگرتنەوە، ئەم پەڕە درۆزنانە کە منیان فریو دا، لەوێ دە کەشۆی مێزەکەم دان، لە هەموویان پێکەنینیتر ئەمەیە کە هێشتاش فاڵیان پێدەگرمەوە!

چ دەکرێ چارەنووس لە من بەهێزترە.

باش دەبوو کە مرۆڤ بەو تاقیکارییانەی کە لە ژیان هەیەتی، توانیبای دیسان لە دایک بووباوە و ژیانی خۆی سەرلەنوێ بەڕێوە بەردباوە! بەڵام کام ژیان؟ ئایا بە دەست منە؟ چ کەلکی هەیە؟ هێزێکی کوێر و ترسناک سواری سەری ئێمە بوون، کەسی وا هەن کە ئەستێرەیەکی شووم چارەنووسی ئەوان بەڕێوە دەبا کە لە ژێر باری ئەو دا ورد دەبن و دەیانەوێ کە ورد بن...

ئیدی نە ئارەزوویەکم هەیە و نە قین، ئەوەی کە مرۆڤانە بوو لە کیسم





دا، هێشتم بە فیرۆ بچێ، لە ژیان دا پیاو دەبێ یا فریشتە بێ یا مرۆڤ یا حەیوان، مـن نەبوومە هیچکام لەوان، ژیانم بۆ هەمیشە بە فیرۆ چوو؛ من خۆخواز و نەزان و کۆڵەوار هاتبوومە سەر دونیا، ئێستا ئیدی ناکرێ بگەڕێمەوە و ڕێگایەکی دیکە بگرمە بەر، ئیدی ناتوانم بە شوێن ئەم سێبەرە بێکەلکانە دا بڕۆم، ئامبازی ژیان بم، زۆرەبانی دەگەڵ بگرم، ئێوە کە پێتانوایە بە راستی دەژین کام بەڵگە و مەنتقێکی بەهێزتان بە دەستەوەیە؟ من ئیدی نامەوێ نە ببەخشم و نە ببەخشرێم، نە بە چەپ دا بڕۆم و نە بە راست دا، دەمەوێ چاوەکانم بەرەو داهاتوو بقووچێنم و رابوردوو لە بیر بکەم.

نا، ناتوانم لە چارەنووسی خۆم رابکەم، ئەم بیرە شێتانە، ئەم هەستانە، ئەم خەیاڵە تێپەڕانەی کە تێمدا پێکدێن ئایا راستەقینە نین؟ بە هەر حاڵ زۆر سروشتیتر و کەمتر دەسکرد دێنە بەرچاو هەتا بیرەکانی مەنتقی من. پێمـوایە ئازادم بەڵام لە ئاست چارەنووسی خۆم ناتوانم چووکترین بەربەرەکانییەک بکەم، هەوساری من بە دەست ئەوەوەیە. ئەوە کە من بۆ ئەمـلا و ئەولا دەکێشێ. رەزیلی، رەزیلی ژیان کە ناتوانن لە دەستی رابکەن، ناتوانن هاوار بکەن، ناتوانن خەبات بکەن، ژیانی گەوج.

ئێستا ئیدی نە دەژیم و نە دە خەو دام، نە شتێکم پێ خۆشە و نە پێ ناخۆش. من دەگەڵ مەرگ ناسیاو بووم و خووم پێگرتوە. تاقە دۆستی منە یا تەنیا شتێکە کە دڵم دەداتەوە. گۆڕستانی مەنپارناسم وە بیر دێتەوە، ئیدی حەسرەتی مردووەکان ناخۆم. منیش سەر بە دونیای ئەوان دەژمێردرێم. منیش دەگەڵ وانم، زیندەبەگۆڕێکم...

ماندوو بووم، چەندەم قسەی قۆڕ نووسی! بە خۆم دەڵێم: برۆ شێت، کاغەز و میداد فرێ دە، فرێی دە، هەتڵەنووسیی بەسە. خەفە بە، بیدڕێنە، نەکا ئەم قسە قۆڕانە وە دەست کەسێک بکەوێ، چلۆن قەزاوەتم دەکا؟ بەڵام من شەرمم لە کەس نیە، هیچم بۆ گرینگ نیە، بە دونیا و ئەوەی تێیدایە پێدەکەنم. هەر چەند قەزاوەتیان لە بارەی من دا سەختیش بێ، نازانن کە من خۆم سەختتر قەزاوەت کردوە، ئەوان بە من پێدەکەنن،





نازانن کە من پتر بەوان پێدەکەنم. من لە خۆم و لە هەموو و لە خوێنەری ئەم قسە قۆڕانە بێزارم.

ئەم یادداشتانە دەگەڵ بەستەیەک پەڕ، دە کەشۆی مێزی ئەو دابوو. بەڵام خۆی لە سەر تەخت کەوتبوو و هەناسە هەڵکێشانی لە بیر چووبۆوە.

پاریس یازدەی ڕەشەمەی ١٣٠٨





دوێنی بوو کە دیوەکەیان جوێ کردمەوە، ئاخۆ هەر ئەو جۆرەی کە جێگر بەڵێنی دابوو من ئیدی بە تەواوەتی چارەسەر کراوم و حەوتەی دیکە دەمنێرنەوە ماڵ؟ ئایا نەخۆش بووم؟ ساڵێکە، لە تەواوی ئەم ماوەیە دا هەرچی دەپاڕامەوە کاغەز و قەڵەمم دەویست، نەیاندەدامێ. هەمیشە پێمـوابوو هەر ساتێک قەڵەم و کاغەزم بکەوێتە دەست چەندە شت دەنووسم... بەڵام دوێنێ بێ ئەوەی داوام کردبێ، کاغەز و قەڵەمیان بۆ هێنام. شتێک کە ئەوەندە بە ئاواتییەوە بووم، شتێک کە ئەوەند چاوەڕوانی بووم...! بەڵام کەلکی چیە ـ لە دوێنێوە هەرچی بیر دەکەمەوە شتێکم نیە کە بینووسم. دەڵێی کەسێک دەستم دەگرێ یا باسکم سڕ دەبێ. ئێستا سەرنج دەدەمێ دەنێوان ئەو خەتە تێکەڵ پێکەڵانەی کە لە سەر کاغەز کێشاومەتەوە تەنیا شتێک کە دەخوێندرێتەوە ئەمەیە: « سێ دڵۆپ خوێن. »

..............................................................

ئاسمان شین، باغچە سەرسەوز و گوڵەکانی سەر تەپک پشکووتوون،





شنەیەکی نەرم بۆنی گوڵەکان هەتاکوو ئێرە دێنێ. بەڵام کەلکی چیە؟ من ئیدی کەیفم بە هیچ نایە، هەمووی ئەوانە بۆ شاعیرەکان و منداڵەکان و ئەوانەی کە هەتا کۆتایی ژیانیان منداڵ دەمێننەوە باشە ـ ساڵێکە لێرەم، شەوانە هەتا بەیانی لەبەر دەنگی پشیلە وەخەبەرم، ئەم ناڵە سامناکانە، ئەم حەنجەرە دارووشاوە وە گیانیان هێناوم، بەیانیش هێشتا چاومان هەڵنەهێناوە ئەم دەرزی لامەزەبەیە...! چ رۆژگەل و سەعاتگەلێکی بە سام کە لێرە تێپەڕمان کردوە، بە کراس و دەرپێیەکی زەرد رۆژەکانی هاوین لە ژێرخان لە دەوری یەک کۆ دەبینەوە و زستانانەش لە دەم باغچە لە بەر هەتاو دادەنیشین، ساڵێکە کە دە نێو ئەم خەڵکە سەیر و سەمەرەیە دا دەژیم. هیچ هاوبەشییەک دە نێوان ئێمە دا نیە، من عەرز هەتا ئاسمان دەگەڵ وان فەرقم هەیە ـ بەڵام ناڵەکان، بێدەنگییەکان، جنێوەکان، گریانەکان و پێکەنینەکانی ئەم خەڵکە هەمیشە خەونەکەم دەشێوێنن.

.............................................................

هێشتا سەعاتێکی ماوە شێوەکەمان بخۆین، لەو خۆراکانەی هەمیشەیی: ئاش ماست، شیربرینج، چلاو، نان و پەنیر، ئەویش نەمر نەژی ـ حەسەن هەموو ئاواتی ئەمەیە کە قابڵەمەیەک ئەشکەنە بە چوار نانی سەنگەک بخوا، کاتێک ئەو ئازاد بکرێ لەبری قەڵەم و کاغەز دەبێ قابڵەمەیەک ئەشکەنەی بۆ بێنن. ئەویش یەک لە بەختەوەرەکانی ئێرەیە. بەو بەژنە کورتە، پێکەنینی گەوجانە، ملی ئەستوور، سەری تاس و دەستە پڕ لە پینەکانی بۆ قوڕکێشان خوڵقاوە، هەموو زەڕڕەکانی لەشی شاهیدی دەدەن و نیگای گەوجانەشی جاڕ دەکێشێ کە بۆ قوڕکێشان خوڵقاوە. ئەگەر مەحەمەدعەلی لە سەر نەهار و شێو رانەوەستابا حەسەن هەموومانی گەیاندبوو کن خودا، بەڵام خودی مەحەمەدعەلیش وەک خەڵکی ئەم دونیایەیە، چونکە ئێرە هەرچی پێتان خۆشە بیڵێن، بەڵام دونیایەکی دیکەیە، جیاواز لە دونیای خەڵکی ئاسایی. دوکتورێکمان هەیە بە قودرەتی ئەو خودایە هیچ تێناگا. ئەگەر من لە جیات وی بام شەوێک ژارم دە چێشتی هەموان دەکرد و دەمدا بیخۆن، ئەوسا بەیانی لە نێو باغ





رادەوەستام و دەستم لە سەر کەلەکەم دادەنا، تەماشای مردوەکانم دەکرد کە دەیانبرد ـ لە پێشدا کە منیان هێنا ئێرە ئەم وەسوەسەیەم هەبوو کە نەکا دەرماندراوم بکەن، دەستم لە نەهار و شێو نەدەدا هەتا مەحەمەدعەلی لێی دەچێشت و ئەودەم دەمخوارد، شەوانە هەراسان لە خەو رادەپەڕیم، پێموابوو کە هاتوون بمکووژن. هەمووی ئەوانە چەندە دوور و سڕاوەن...! هەمیشە هەر ئەو کەسانە، هەمیشە هەر ئەو چێشتانە، هەر ئەو ژوورە شینە کە هەتا نێوقەدی مۆرە.

دوو مانگ لەمەوبەر بوو شێتێکیان دە زیندانی خوارەوەی حەوش هاویشتبوو، بە هەڵماتی شکاو زگی خۆی دڕیبوو، ریخۆڵەکانی دەرکێشابوو و یاری پێدەکردن. دەڵێن قەساب بوە، عادەتی بە زگ دڕین هەبوە. بەڵام ئەوی دیکە کە بە نینۆک چاوی خۆی تەقاندبوو، دەستیان لە پشتەوە بەستبۆوە، هاواری دەکرد و خوێن لە چاوەکانی دا ویشک ببوون. من دەزانم هەموو ئەوانە دە بن سەری جێگر دایە:

« خەڵکی ئێرە هەر هەموویان وا نین. زۆرێک لەوان ئەگەر چارەسەر بکرێن و ئازادیان بکەن بەدبەخت دەبن. بۆ وێنە ئەم سوغراسوڵتانە کە لە بەشی ژنانە، دووسێ جار ویستوویەتی هەڵبێ، گرتوویانەتەوە. پیرێژنە، بەڵام گێچی دیوار دە چڕ و چاوی هەڵدەسوا و گوڵی شەمدانیش دەکاتە سووراو. خۆی پێ کچی چاردە ساڵەیە، ئەگەر چارەسەر بکرێ و چاو لە ئاوێنە بکا، دڵی دەتۆقێ. لە هەموان خراپتر تەقی خۆمانە کە دەیەویست دونیا هەڵوەژێرێ و سەرەڕای ئەوە کە لە سەر ئەم بڕوایەیە کە ژن هۆی چارەڕەشی خەڵکە و بۆ چارەسەر کردنی دونیا هەرچی ژنە دەبێ بیکووژن، ئاشقی ئەم سوغراسوڵتانە بوە.

هەمووی ئەوانە دە بن سەری جێگری خۆمان دایە. ئەو لە شێتایەتی دا دەستی تەواوی شێتەکانی لە پشتەوە را بەستۆتەوە. هەمیشە بەو لووتە زل و چاوە چووکانەی وەک وافوورییەکان لە بنەبانی باغ لە بن داری کاژ پیاسەی دەکا. هەندێک جار دادێتەوە بن دارەکە چاو لێدەکا. هەرکەس بیبینێ دەڵێ چ پیاوێکی بێ ئازاری بەستەزمان کە کەوتۆتە دەست





تاقمـێک شـێت. بـەڵام من دەیناسم. من دەزانم لەوێ لـە ژێر دار سـێ دڵۆپ خـوێن تکاوەتـە سـەر زەوی. قـەفـەسـێک لە بەر پەنجـەرەکـەی هـەڵواسـراوە، قـــەفـەســێکی بـەتاڵـە، چونکە پشـــیلە قـــەنارییـــەکـــەی گـــرت، بـەڵام ئەو قەفەسەکەی داناوە هەتا پشیلەکان بۆ لای بێن و ئەوان بکووژێ.

دوێنـێ بوو رەپێـی پشـیلەیەکی پنۆک پنۆکی نا، هـەر کـە حـەیوان بە دارە کـاژی بەر پەنجـەرە هـەڵڕووسکا، بـە کـێشکچـی بەر دەرگـای کـوت کـە بە گوللـە لێی راکێشـێ. ئـەم سـێ دڵۆپە خـوێنە هـی پشـیلەیە، بەڵام ئـەگـەر لە خۆی پرسـی دەڵـێ هـی بایەقوشە.

لە هـەمـوان سـەیرتر ئاواڵ و هـاوسـاکـەم عـەبباسـە، دوو حـەوتە نیـە کـە هێناویانە، دەگەڵم زۆر جـووت بوە، خـۆی پـێ پێغـەمبـەر و شـاعیـرە. دەڵـێ هـەر کارێک، بە تایبەتی پێغەمبەرایەتی، بە بەخت و چارەنووسە. هـەرکەس نێوچاوانی بیکا ئەگـەر هیچیش تێنەگا کـارەکـەی جێبەجێ دەبێ و ئەگـەر عـــەلامـــەی دەهـریش بێ و نێـوچاوانـەکـەی نەیکا وەک وی لێـدەقـــەومـێ. عـەبباس خـۆی پـێ تارژەنێکی لێـهـاتووشـە. ژێی لـە تەختـەیەک داوە و بە خـەیاڵی خـۆی تاری سـاز کـردوە و شـێعرێکیشـی کـوتوە کـە رۆژێ هـەشت جار بۆم دەخـوێنێتەوە. گـۆیا لەبەر ئەم شێعرە هێناویانەتە ئێرە، شێعر یا گۆرانییەکی سەیری کوتوە:

مـخابن کە شـەو هـاتەوە
جەهـانم سیاپۆش دیتەوە
هـەموو خـەڵک سـەرلەنوێ خـەوتەوە
جگە من کە رەنج و غەمم هـەر لە رێن

نەماوە چ خۆشی و مـەزاج
جگە مەرگ نیمە چارە و عیلاج
لەوێندەر لە ژێر داری کاج
سێ قەترە تکاوە لە سەر خاک خوێن

دوێنـێ لە باغ پیاسـەمان دەکرد. عەبباس ئەو شـێعرەی خـوێندەوە. ژنێک و پیاوێک و کچێکی جحێڵ هاتنە سەردانی. هـەتاکوو ئێستا پێنج جارە کە





هاتوون. من ئەوانم دیبوو و دەمناسین. کچە جحێڵەکە چەپکە گوڵێکی هێنابوو. ئەو کچە بە من پێدەکەنی، دیار بوو کە منی خۆش دەویست، هەر لەبەر من هاتبوو. سیمای ئاوڵاویی عەبباس خۆ جوان نیە، بەڵام ژنەکە کاتێک دەگەڵ دوکتور قسەی دەکرد من دیتم کە عەبباس کچە جحێڵەکەی کێشا لاوە و ماچی کرد.

..............................................................

هەتا ئێستا نە کەس هاتۆتە سەردانم و نە گوڵیان بۆ هێناوم،ساڵێکە. دوایین جار سیاوەش بوو کە هاتە سەردانم، سیاوەش باشترین ئاواڵی من بوو. ئێمە پێکەوە دراوسێ بووین، هەموو رۆژێ پێکەوە دەچووینە فێرگە و پێکەوەش دەهاتینەوە و دەرسەکانمان پێکەوە دەورە دەکردەوە و لە کاتی پشوو دان تارم فێرە سیاوەش دەکرد. روخسارە کچەمامی سیاوەشیش کە دەزگیرانی من بوو زۆر جار دەهاتە کۆڕەکەمان. سیاوەش دەیەویست خوشکی روخسارە بێنێ. بە هەڵکەوت مانگێک بەر لە مارە کردنی، سیاوەش نەخۆش کەوت. من دوو سێ جار چوومە سەر دانی بەڵام کوتیان دوکتور قەدەغەی کردوە کە قسەی دەگەڵ بکەن. هەرچی پێم داگرت هەر ئەم وڵامەیان دامەوە. منیش پەڵپم پێنەگرتن.

« باشم لە بیرە، سەروبەندی ئیمتەحانەکان بوو، ئێوارەیەک کە گەڕامەوە ماڵ، کتێبەکانم دەگەڵ جزووی فێرگە فڕێ دا سەر مێز. هەر ویستم جلەکانم بگۆڕم دەنگی تەقینەوەی گوللە هات. دەنگەکەی ئەوەندە نزیک بوو کە ترساندمی. چونکە ماڵەکەمان لە پشت خەندەک بوو و بیستبووم کە لە لای ئێمە دزی کراوە. دەمانچە نێرگانەکەم لە کەشۆی مێزەکەم دەرهێنا و هاتمە حەوش، گوێ قوڵاغ وەستام. لە دوایی لە پلەکانی سەربان وەسەر کەوتم بەڵام چم نەدیت. کاتێک گەڕامەوە لە سەرەوە چاوم بە ماڵە سیاوەش کەوت، دیتم سیاوەش بە کراس و دەرپێوە لە حەوش وەستاوە. من بە سەرسوڕماویەوە کوتم « سیاوەش تۆی؟ »

ئەو منی ناسیوە و کوتی « وەرە خوارێ کەسمان لە ماڵ نیە! »

« تەقەی گوللەت بیست؟ »





قـامكـی له سـەر لێـوی دانـا و بە سـەر ئـامـاژەی كـرد كـە وەرە و من بە هەشـتــاو چوومـە خـوارێ و لە دەرگــای مـاڵەكـەیانم دا. بـۆ خـۆی هات و دەرگای لە سەر من كردەوە.

هەروا كـە سـەری داخسـتـبوو و زەق چاوی لە زەوی بڕیـبوو، پرسـی « تۆ بۆچی نەهاتیە سەردانم؟ »

« من دوو سێ جـار هـاتوومـە سـەردانت بەڵام كـوتيـان كـە دوكـتـور ئيـزن نادا. »

« پێیانوایە كە نەخۆشم، بەڵام هەڵەی دەكەن. »

دیسان پرسیم « ئەو تەقەیەت گوێ لێبوو؟ »

بێ ئەوەی وڵام بداتەوە دەسـتـی گرتم و بردمیـە بن داری كـاژ و شـتـێكـی نیشـان دام. من كـە لە نزیكەوە چاوم لێكرد، سـێ دڵۆپ خوێنی تازە تكابوو سەر زەوی.

دوایە منی بـردە دیوەكـەی خـۆی، هـەمـوو دەرگـاكـانـی گـرێ دا، لە سـەر سـەندەڵی دانیشـتم، چرای هەڵكرد و هـاتە سـەر سـەندەڵی، بەرامبـەری من لە پەنـا مـێـز دانیـشـت. دیوەكـەی سـادە، شـین و نێـوقـەدی مـۆر بوو. لە سـووچی ژوور تارێكـی دانابوو. چەند بەرگ كتـێب و جـزووی فێرگەش لە سـەر مـێـز كـەوتبـوو. دوایە سـیـاوەش دەسـتـی درێژ كـرد و لە كـەشـۆی مێزەكەی نێرگانێكی دەرێنا و نیشـانی دام. لەو نێرگانە كۆنانە بوو كە دەسكیـان نێرۆیی بوو، ئەوی دە گـیـرفـانـی شـاڵوارەكەی نـا و كـوتی « من پشـیلەیەكـی مـێم هـەبوو، ناوی نازێ بـوو. لەوانەیە دیتـبـێت، لەو پشـیلە ئاسـاییـە پنۆكـانـە بوو، بە دوو چاوی گـەورەی وەک چاوی بـە كل كـێـشـراو. لـە سـەر پشـتـی نەخش و خـاڵی رێک بـوون وەک ئەوەی كـە جـەوهـەرت بە سـەر كـاغـەزی ئاوهەڵچن دا رشـتـبێ و لە دوایـی دوو قـەدت كـردبێـتـەوە. رۆژانە كـە لە فـێرگـە دەگـەڕامـەوە نازێ رایدەكـردە لام، میاومیـاوی دەكرد، خۆی تێهەڵدەسووم، كاتێک دادەنیشتم وە سەر سەر و گـوێلاكم دەپـەڕی، لمبـۆزی لە دەم و چاوم دەخـشـاند، بـە زمـانـی زووریی نێوچاوانی دەلێستمەوە و زۆری لێدەكردم كە ماچی بكەم. گۆیا پشیلەی





مێ زیرەکتر و دڵاواتر و بەهەستتر لە گورپەیە. نازێ دوای من دەگەڵ ئاشپەز نێوانی لە هەموان خۆشتر بوو؛ چونکە خواردەمەنی لای ئەو دەست دەکەوت. بەڵام لە پرچ سپی ماڵ کە حەمبەڵی بوو و نوێژی دەکرد و تووکی پشیلەی پێ پیس بوو، خۆی دوور دەخستەوە. لەوانەیە نازێ لای خۆی پێیوابوە کە مرۆڤەکان زیرەکتر لە پشیلەکانن و هەموو خۆراکە خۆش و جێگا گەرم و نەرمەکانیان بۆ خۆیان داگیر کردوە و پشیلەکان دەبێ ئەوەندە خۆ رێکخستن و ماستاوکەریی بکەن هەتا بتوانن تێی دا بەشدار بن.

« تەنیا کاتێک هەستی سروشتی نازێ سەری هەڵدەدا و وەکوڵ دەهات کە سەرەکەڵەبابێکی خوێناوی دەست دەکەوت و ئەوی دەکردە گیانلەبەرێکی درِ. چاوەکانی زەقتر دەبوونەوە و دەبریسکانەوە. جنجرِووکی لە کالان دەهاتنە دەر و هەرکەس لێی نزیک بووباوە بە مرِەمرِ هەرِەشەی لێدەکرد. لە دوایی وەک ئەوەی کە خۆی هەڵخەڵەتێنێ، ئەدای دەردێنا. چونکە بە هەموو بیر و مێشکی خۆیەوە کەللەی کەڵەبابی بە گیاندارێکی زیندوو دادەنا، دەستی وە بن دەدا، گەش دەبۆوە، خۆی دەشاردەوە، دەچوە پارێزەوە، دیسان شالاوی دێنا و تەواوی کارامەیی و لێهاتوویی رەگەزی خۆی بە هەڵبەز دابەز و شەرِ و پاشەکشەی پەیتاپەیتا دەردەخست. دوایە کە لە نمایش ماندوو دەبوو، تامەزرۆیانە کەللەی خوێناوی دەخوارد و چەند دەقیقەیەک لە پاشماوەکەی دەگەرِا و هەتا یەک دوو سەعات شارستانیەتی دەسکردی خۆی لە بیر دەکرد، نەدەهاتە لای کەس، نە نازی دەکرد و نە ماستاوکەریی.

« هەر ئەو دەمەش کە نازێ دۆستایەتی خۆی دەنواند، وەحشی و دە نێو خۆی دابوو و رازەکانی ژیانی خۆی دەرنەدەبرِی، ماڵە ئێمەی بە ماڵە خۆی دادەنا و ئەگەر پشیلەیەکی غەریبە رێی دە ماڵمان کەوتبا بە تایبەت ئەگەر مێ با ماوەیەکی زۆر پفە و مرِە و ناڵەکانی دەبیسرا.

« دەنگێک کە نازێ بۆ خواردن دەریدەبرِی دەگەڵ دەنگی ئاسایی کە خۆی لووس دەکرد، جیاوازیی هەبوو. زیقەیەک کە لە برسان دەیکرد





دەگەڵ ئەو هاوارانەی کە لە شەڕ دا دەیکرد و مڕنەمیاوی کاتی مەستی هەموو دەگەڵ یەک تۆفیریان هەبوو و ئاهەنگەکەی دەگۆڕا: یەکەمینیان هاوارێکی گورچووبڕ، دووهەمی هاوارێکی پڕ لە کوڵ و قین، سێهەمی ناڵەیەکی بە ژان، کە لە بەرابەر پێداویستی سروشتی دەریدەبڕی هەتا بۆ لای جووتەکەی خۆی بچێ. بەڵام نیگاکانی نازێ لە هەموو شت پڕ ماناتر بوو و هەندێک جار هەستەکانی مرۆڤانە بوون، وەها کە پیاو دەستبەجێ لە خۆی دەپرسی: لە بن ئەم کەللە تووکنە، لە پشت ئەم چاوە کەسکە پڕ رازە، چ بیرگەل و هەستگەلێک شەپۆلان دەدەن!

« پارەکە بەهار بوو کە ئەم رووداوە بە سامە قەوما. دەزانی لەم وەرزە دا هەموو گیاندارەکان مەست دەبن و وەخۆ دەکەون، دەڵێی بای بەهاریی شێتایەتییەک دەپژێنێتە نێو هەموو گیاندارەکان. نازێی ئێمەش بۆ یەکەمین جار هەوای ئەویندارییی لە کەللەی دا و بە لەرزەیەک کە هەموو لەشی دەلەرزاندەوە، ناڵەی غەمینی بەرز دەکردەوە. گورپە نێرەکان ناڵەکانیان دەبیست و لە دەوروبەر پێشوازییان لێدەکرد. دوای شەڕ و کێشە نازێ یەکێک لەوان کە لە هەموان بەتاقەتتر و دەنگ گڕتر بوو، بۆ هاوسەریی هەڵیبژارد. لە جووت گرتنی گیاندارەکان دا بۆنی تایبەتی ئەوان زۆر گرینگە، لەبەر ئەوەیە کە گورپەکانی لووس و خاوێنی نێو ماڵ لە لای مێیەکان هێندە قەدریان نیە. بە پێچەوانە گورپەکانی سەر لێواری دیوارەکان، گورپە دز و لاواز و بەرەڵڵا و برسییەکان، کە لەشیان بۆنی سەرەکی رەگەزی خۆیانیان لێدێ، زۆرتر مێیەکان بۆ لای خۆیان رادەکێشن. رۆژەکان بە تایبەت تەواوی شەوەکان نازێ و جووتەکەی ئەوینی خۆیان بە دەنگی بەرز بانگ دەکەن. لەشی نەرم و ناسکی نازێ خۆی لێک دەکێشاوە لە حاڵێک دا لەشی ئەوی دیکە وەک کەوان دەچەماوە و ناڵەی شادییان بەرز دەکردەوە و هەتا سپێدەی بەیان ئەم کارە درێژەی هەبوو. ئەودەم نازێ بە تووکی ئاڵۆز، شەکەت و ماندوو بەڵام بەختەوەر دەهاتەوە ژوورێ.

« شەوانە لەبەر ژوانی نازێ خەوم لێنەدەکەوت، ئاخرەکەی دەرهەڵبووم.





رۆژێک لەبەر ئەم پەنجەرەیە کارم دەکرد. ئاشـقـە و مـاشـقـەم دیتن کە لە باغچە بە کەشـم و نەشم دەڕۆیشتن. من بەو نێرگانـەی کە دیتت، لە سێ هەنگاوییەوە سیلەم تێگرتن. نێرگان تەقی و گوللەکە وە جووتی نازێ کەوت. گۆیا کەمەری شکا، بازدێکی بلّندی دا، بێ ئەوەی دەنگێکی لێوە بێ یا ناڵەیەک بکا لە دالان رایکرد و لەبەر هێرەی دیواری باغ کەوت و تۆپی.

« دلۆپی خوێن لە تەواوی شوێن ڕێگاکەی تکابوو. نازێ ماوەیەکی لێیگەڕا هەتا شوێن پێیەکەی دیتەوە، بۆنی بە خوێنەکەیەوە کرد و یەکڕاست چوە سەر کەلاکەکەی. دوو شەو و دوو رۆژ لە سەر کەلاکەکەی کێشکی دا. هەندێک جار دەستی لێدەدا، دەتکوت پێی دەڵێ « هەستە، سەرەبەهارە، بۆ لە جەنگەی ژوان دا خەوتووی، بۆ ناجوولێیەوە؟ هەستە، هەستە! » چونکە نازێ لە مردن نەدەگەیشت و نەیدەزانی کە جووتەکەی تۆپیوە.

« سبەینێی ئەوێ رۆژێ نازێ دەگەڵ کەلاکی جووتەکەی ون بوون. هەر کوێ گەڕام و لە هەر کەسم پرسی کەلکی نەبوو. ئاخۆ نازێ لە من تۆرا، ئاخۆ تۆپی، ئاخۆ وە شوێن ژوانی خۆی کەوت، ئەدی کەلاکەکەی ئەوی دیکە چی لێهات؟

« شەوێک دەنگی مرنەمیاوی هەر ئەو گورپە نێرەم بیست، هەتا بەیانی هاواری کرد، شەوی دوایەش هەروەتر، بەلام بەیانیان دەنگی دەبڕا. شەوی سێهەم دیسان نێرگانم دەست داوە و بەم دارە کاژەی بەر پەنجەرەکەمەوە نا، چونکە زیتەی چاوەکانی لە تاریکی دا دیار بوو. ناڵەیەکی درێژی کرد و بێدەنگ بوو. سبەی لە بن داری کاژ سێ دلۆپ خوێن تکابوو. لەو شەوەوە هەتاکوو ئێستا هەموو شەوێ دێ و هەر بەو دەنگەوە دەناڵێنێ. ئەوانی دیکە خەویان قورسە نایبیسن. هەرچی پێیان دەڵێم پێم پێدەکەنن. بەلام من دەزانم، دڵنیام کە ئەمە دەنگی ئەو گورپەیەیە کە من تۆپاندوومە. لەو شەوەوە هەتاکوو ئێستا خەو لە چاوم





زڕاوه، دەچمە هەر کوێ، لە هەر دیوێکی دەخەوم، تەواوی شەو ئەم گورپە بێ ئینسافە بە حەنجەرەی ترسناکی دەناڵێنێ و هاواری جووتەکەی دەکا.

« ئەمڕۆ کە ماڵ چۆڵ بوو هاتمە هەر ئەو شوێنەی کە گورپە لێی دادەنیشێ و هاوار دەکا، تەقەم لێکرد چونکە لە زیتەی چاوەکانی لە تاریکی دا دەمزانی کە لە کوێ دادەنیشێ. کە تەقەم لێکرد گوێم لە دەنگی ناڵەی گورپە بوو و سێ دڵۆپ خوێن لەو سەرەوە تکا. تۆ کە بە چاوی خۆت دیتت، تۆ کە شاهید بووی؟ »

لەم کاتە دا دەرگا کراوە و روخسارە و دایکی وە ژوور کەوتن. روخسارە چەپکێک گوڵی پێبوو. من هەستام سڵاوم کرد بەڵام سیاوەش بە بزەوە کوتی « هەڵبەت ئێوە ئاغا میرزا ئەحمەدخان لە من باشتر دەناسن، پێویست بە ناساندن نیە، ئەو شاهیدی دەدا کە سێ دڵۆپ خوێنی بە چاوی خۆی لە بن داری کاژ دیوە. »

« بەڵێ من دیتوومە. »

بەڵام سیاوەش هاتە پێش و قاقا پێکەنی، دەستی دە گیرفانم نا و نێرگانی دەرکێشا و لە سەر مێزەکەی دانا و کوتی « دەزانن ئاغا میرزا ئەحمەدخان نە تەنیا باش تار دەژەنێ و شێعری باش دەڵێ، بەڵکە راوکەرێکی لێهاتووشە، ئەنگێوەی چاکە. »

دوایە ئاماژەی بە من کرد، منیش هەستام و کوتم « بەڵێ ئەمڕۆ ئێواریێ هاتم جزووی فێرگە لە سیاوەش وەرگرم، بۆ گاڵتە ماوەیەک گوللەمان بە داری کاژەوە نا، بەڵام ئەو سێ دڵۆپە خوێنە هی گورپە نیە هی بایەقوشە. دەزانن کە بایەقوش ماڵی سەغیری خواردوە بۆیە شەوانە ئەوەندە دەناڵێنێ هەتا سێ دڵۆپ خوێن لە گەرووی بتکێ، یا ئەمەکە گورپە قەناریی دراوسێی خواردوە بۆیە بە گوللە لێیانداوە و بێرە دا تێپەڕیوە، ئێستا راوەستن گۆرانییەکی تازە کە سازم کردوە بۆتانی بڵێم، تارم هەڵگرت و گۆرانییەکەم دەگەڵ سازەکە رێک کرد و ئەم شێعرانەم خوێندەوە:





مخابن که شەو هاتەوە
جەهانم سیاپۆش دیتەوە
هەموو خەڵک سەرلەنوێ خەوتەوە
جگە من کە رەنج و غەمم هەر لە رێن

نەماوە چ خۆشی و مەزاج
جگە مەرگ نیمە چارە و عیلاج
لەوێندەر لە بن داری کاج
سێ قەترە تکاوە لە سەر خاک خوێن

کە گەیشتە ئێرە دایکی روخسارە شێواو وەدەرکەوت، روخسارە برۆکانی هەڵکێشا و کوتی « ئەمە شێتە » دوایە دەستی سیاوەشی گرت و هەردووکیان قاقا پێکەنین و وەدەر کەوتن و دەرگایان لە سەر داخستم.

کە گەیشتنە حەوش لە بن فانووس من ئەوانم لە پشت شووشەی پەنجەرەوە دیت کە یەکتریان دەباوەش گرت و یەکتریان ماچ کرد.





« بۆ لای ژنان دەچی؟ قەمچی لە بیر مەکە!»
وەهای گوت زەردەشت.		ف. نیچە

بەیانی زوو لە ئیزگەی **قولهەک**، ئاژانێکی کورتەڵەی سوورفل، ژنێک کە منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، نیشانی شۆفیری ماشێنێکی دا و گوتی:

ـ ئەو ژنە ویستوویەتی بچێتە مازندەران هاتۆتە ئێرە، بیگەیەنە شار خێرت دەگاتێ.

ژن بێ سێ و دوو سواری ماشێن بوو، سووچی چارشێوی رەشی بە ددانی گرتبوو، منداڵێکی دووساڵەی بە باوەشەوە بوو و بوخچەیەکی سپی بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو. چوو لە سەر سەندەڵی چەرمیی دانیشت و منداڵەکەی کە قژی کاڵ و قیافەیەکی مالاریایی هەبوو لە سەر کۆشی دانا، سێ نیزامی و دوو ژن کە لە ماشێنەکە دا بوون بێواز چاویان لەو کرد، بەڵام شۆفیر هەر نەگەڕاوە چاویشی لێبکا. ئاژان هاتە نزیک شووشەی ماشێن و بە ژنەکەی کوت:

ـ دەچیە مازندەران چ بکەی؟

ـ مێردەکەم ببینمەوە.

ـ مەگەر مێردەکەت ون بوە؟

ـ مانگێکە بێ خەرجیی جێی هێشتووم رۆیشتوە.

ـ چووزانی کە لەوێیە؟





ـ **غولام ـ** ی ئاواڵی پێیکوتم.

ـ ئەگەر پیاوەکەت هێندە بە غەیرەت بێ لەوێش هەڵدێ، ئێستا چەندت پووڵ پێیە؟

ـ دوو تمەن و دوو قڕان.

ـ ناوت چیە؟

ـ **زێڕن**

ـ خەڵکی کوێی؟

ـ خەڵکی **ئەلویزی شەهریار**م.

ـ لە جیات ئەوە کە بچی مێردەکەت ببینیەوە بڕۆ شەهریار، ئێستا جەنگەی ترێیە ـ بڕۆ لای خزم و کەس و کارت و ترێی بخۆ. لەخۆڕا دەچیە مازندەران، لەوێ گۆڕغەریب دەبی، ئەویش بەو زەینە باشەی کە تۆ هەتە!

ـ دەبێ بڕۆم.

زێڕن ئەو رستەی دوایی بە دڵنیاییەکی تەواوەوە کوت، دەتکوت تەماکەی تەواو و بێ پاشگەز بوونەوە بوو، و نیگای بێ شۆقی لەبەر خۆی بڕیبوو بێ ئەوەی کە شتێک ببینێ یا سەرنج بداتە کەسێک. وا دەهاتە بەرچاو کە بێ ویست و بێ فکر قسەی دەکرد و هۆشی لە شوێنێکی دیکە بوو. پاشان دیسان ئاژان رووی لە شۆفیر کرد و کوتی:

ـ کاکی شۆفیر، ئەو ژنە لە کن **دەروازەی دەوڵەت** دابەزینە و رێگاشی پێ نیشان بدە.

زێڕن دەتکوت لە پشتیوانی ئاژان ورەی هاتە بەری کوتی:

ـ من غەریبم، رێگام پێ نیشان بدەن خێرتان دەگاتێ.

ماشێن وەڕێ کەوت، زێڕن بێ بزووت دیسان نیگای بێ شۆقی وەک سەگێکی تێهەڵدراو لەبەر خۆی بڕی. چاوەکانی دریشت، رەش، برۆکانی قەیتانی و باریک، کەپۆی چووک، لێوەکانی گۆشتن و گووپەکانی تێقوپاو بوون. پێستی رووی گەش، رەشتاڵە و پتەو بوو. لە تەواوەتی رێ دا دەجووڵاوە بێ ئەوەی سەرنج بداتە کەسێک یا شتێک. منداڵەکەی بێدەنگ و غەمین و فێدار، وەنەوزی دەدا و هەنارێکی رێک کوشراوی بە دەستەوە





بوو. نزیک دەروازەی دەوڵەت شۆفیر ماشێنەکەی راگرت و ئەو رێگایەی کە راست دەچوو بۆ دەروازەی شمیران پێی نیشان دا. زێڕنیش دابەزی و دەستبەجێ رێگای درێژ و هەتاویی بە منداڵێک بە باوەشەوە و بوخچەیەک بە دەستەوە، گرتە بەر.

لە بەر دەروازەی شمیران زێڕن چوو نێو کارەژێکەوە و دوای نێو سەعات چەنە لێدان و مەحتەلی، خاوەن کارەژ رازی بوو کە بە ماشێنێکی باریی ئەو بگەیەنێتە **ئاسیاسەر** سەر رێی **ساری** و شەش قرانیشی بابەتی کرێ لێوەرگرت. زێڕنیان بۆ ماشێنێکی گەورە رێنوێنی کرد کە خەڵک لە دەورەی کیپ دانیشتبوون و بار و بنەیان لە نێوەڕاست هەڵچنیبوو. ئەوان پاڵیان بە یەکترەوە نا و جێگایەکیان بۆ کردەوە کە بە زەحمەت جێی خۆی کردەوە.

ئاویان دە ماشێن کرد، دیدەی لێدا، لە پاش خۆی بۆنی بێنزین و رۆنی سووتاو و دووکەڵی خەستە هەواوە و بە جادەی گەرم و تۆزاویی دا وەڕێکەوت. سەرەتا دیمەنی دەوروبەر یەکچەشن بوو، لە دوایی تەپکەکان، کێو و دارەکانی دوورەدەست و پێچ و خەمەکانی رێگا، دیمەنیان دەگۆڕی. بەڵام زێڕن بە هەمان شێوەی ژاکاوی چاوی لە بەر خۆی دەکرد. لە چەند جێ ماشێن رایگرت و چاویان لە بەرگەی مسافرەکان کرد. نزیک نیوەڕۆ لە **شەلەنبە** چەرخی ماشێن خراپ بوو و تاقمێک کە مسافرەکان دابەزین. بەڵام زێڕن لە سەر جێی خۆی جووڵەی نەکرد، چوونکە دەترسا ئەگەر هەستێ جێگاکەی لە کیس بچێ. بوخچەکەی کردەوە، نان و پەنیری لێ دەرهێنا، کوتە نانێکی فەتیری بە پەنیرەوە دا بە کوڕەکەی و بۆ خۆشی چەند باڕۆڵەی خوارد. منداڵەکەی وەک چۆلەکەیەکی تریاکیی بێدەنگ بوو، دایم وەنەوزی دەدا و وا دەهاتە بەرچاو کە تاقەتی قسە کردن و تەنانەت گریانیشی نەبوو. لە ئاکام ماشێن دیسان وەڕێکەوتەوە و گەلێک تێپەڕی، لە **جابون** و **فیرووزکووە** تێپەڕی و دیمەنی جوانی لێرەوار دیاری دا. بەڵام زێڕن تەواوی ئەم ئاڵوگۆڕەی بە نیگای بێ شۆق و بێواز روانی و خۆشییەکی نەهێنی، خۆشییەکی مەرمووزی تێدا پێکهاتبوو، دڵی توند





دەیکوتا، ئازادانە هەناسەی هەڵدەکێشا چونکە لە ئامانجەکەی نزیک دەبۆوە و سبەی دەیتوانی **بەبووی** مێردی ببینێتەوە، ئاخۆ ماڵەکەی چۆنە، کەس و کاری چ قیافەیەکیان هەیە و دەگەڵ ئەو چۆن دەجووڵێنەوە؟ دوای مانگێک دووریی ئاخۆ چۆن دەگەڵ بەبوو دەجووڵێتەوە و چ دەڵێ؟ بەڵام بۆ خۆشی دەیزانی کە لە ئاست بەبوو نەیدەتوانی یەک وشەش دەربڕێ، زمانی سڕ دەبوو و هەموو هێز و توانای لێدەبڕا، دەتکوت دە بەبوو دا هێزێکی تایبەت هەبوو کە هەموو بیر، ویست و هێزی ئەوی لە وزە دەخست و ئەو بە تەواوەتی دەچوە ژێر دەستەڵاتی ئەوەوە. زێڕن دەیزانی کە بە پێچەوانە بەبوو هەڕەشەی لێدەکا و لە دوایی بە قەمچی، هەر ئەو قەمچییەی کە لە وڵاغەکانی رادەکێشا، لە گیانی رادەکێشێ. بەڵام زێڕن هەر بۆ ئەوە دەچوو، ئارەزووی ئەو قەمچییەی دەکرد و لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە دەچوو کە قەمچی دەست بەبووی وێکەوێ. هەوای شێدار، لێڕەوار، دیمەنی دڵڕفێنی دەوروبەری، ئەو خەڵکانەی کە لە دوورەوە کاریان دەکرد، پیاوێک کە بە عەبای کەرباسی شین لە سەر جادە وەستابوو، ترێی دەخوارد، ماڵی لادێییەکان کە بە بەری دا تێدەپەڕین، گشت ئەوانە زێڕنیان وەبیر منداڵەتی خۆی دەخستەوە.

×××

دوو ساڵ دەبوو کە زێڕن ببوو بە ژنی بەبوو. یەکەم جار کە زێڕن بەبووی دیت رۆژێکی ترێ هەڵگرتنەوە بوو. زێڕن دەگەڵ **مێرێ** کچی دراوسێیان و **موچوول خانم** و خوشکەکانی **خورشید** و **بێمانی خانم** کاریان ئەوە بوو کە هەموو رۆژێ تێکڕا لە رەز ترێیان لێدەکردەوە و هێشوو درەوشاوەکانیان دە سێپ یا سندووقی چێوی دەنا، لە دوایی سێپەکانیان دەبرد لە کن رووباری **سیائاو** لە ژێر کۆنە دارچنارێک کە پەرۆیان بۆ دوعا لێدەبەست و لەوێ دایکی دەگەڵ **گەوهەر**، **دایکی هەباس**، **خۆشقەدەم**، **سوڵتان**، **گوڵداد** و **خودایار** سندووقەکانیان دەدا بە ردێن سپی **پەرەندەک ماندگارعەلی**. لەم رۆژە دا سێپ هەڵگرێکی تازەکار





هاتبوو کە سیپەکانی لە بار دەدا و بەبووی مازندەرانی بوو کە گۆرانی دەکوت و کچەکانی فێر دەکرد و ببوو هۆی سەرگەرمی هەموویان و تێکڕا گۆرانیان دەکوت:

« کیژی لەبار ئەهای لەلە

بچینە شار، ئەهای لەلە

یەکمان لە ماڵ، یەکمان لە کار

بێ بچینە شار ئەهای لەلە

بێ بچین کە تۆم دەوێ! »

بەبوو شێوەی راوێژەکەی بۆ راست دەکردنەوە، کچەکان قاقا پێدەکەنین و هەتا ئێوارەی ئەورۆژە ئەو کارە درێژەی هەبوو. بەڵام ئەوەی کە پتر سەرنجی کچەکانی بۆ لای بەبوو راکێشا گۆرانییەکەی ئەو نەبوو، بەڵکەم بۆ خۆی و بوێرییەکەی بوو کە دڵی ئەوان بە تایبەت زێڕنی داگیر کردبوو. هەر کە زێڕن چاوی بە ئەندامی بەخۆوە، ملی ئەستوور، لێوی سوور، قژی سوور، باسکە سپییەکان کە مووی لە سەر روابوو و بە تایبەت دەستوبردێک کە لە راگوێزتنی سیپە قورسەکان هەیبوو، خۆی دۆڕاند. سەرەڕای ئەمە مەیلێک کە بەبوو پێینواند بەو نیگا بە تینانەی کە دە نێوانیان دا پێکهات بەس بوو هەتا زێڕن کە پتر لە چاردەساڵی نەبوو، گیرۆدەی خۆی بکا. زێڕن دڵی دەیکورکاند، رەنگی دێنا و دەبرد، چونکە لەم رۆژە دا پەی بە شتێکی نوێ برد و هەستی کرد کە هەتا ئەودەم ئەوەی تێدا نەبوە. چونکە هەتا ئێستا ئەو هیچی لە پیاو نەدەزانی، دایکی هەمیشە تێیهەڵدابوو و چاوترسێنی کردبوو و خوشکەکانی کە لەو گەورەتر بوون رقەبەرەیان دەگەڵ دەکرد و رازی خۆیان لێدەشاردەوە. هەرچەند زێڕن زۆر جار پیاوی بە بیر دادەهات بەڵام نەیدەوێرا لە کەس بپرسێ و دەیزانی کە ئەمە بیرێکی خراپە و دەبێ خۆی لێ دوور بخاتەوە. تەنیا هەندێک جار **مێرێ** کچی دراوسێیان و **خانمۆڵ** و **بلوورخانم** دەگەڵ ئەو سەبارەت بە رازەکانی پیاو دوابوون و زێڕنیان وە خوتخوتە خستبوو





وەها کە تا رادەیەک چاو و گوێی کرابۆوە. تەنانەت مێرێ باسی نێوانی نهێنی خۆی دەگەڵ **شێرزاد** کوڕی **ماندگارعەلی** کردبوو. بەڵام تەواوی ئەو بیرانەی کە زێڕن لە ئەوین و هەوەس لە زەینی خۆی دا پێکیهێنابوو، نیگای بەبوو گۆڕانی بە سەر داهێنا، پێی سست بوو و هەستێکی تێدا پێکهات کە نەیدەتوانی دەریبڕێ، هەر ئەوەندەی دەزانی کە تەواوی زەرڕەکانی لەشی، بەبوویان دەویست و لەمە بە دوا نیازی بەو بوو و ژیانی بێ بەبوو مەحاڵ و نەگونجاو بوو. بەڵام بە هەڵکەوت ئەوڕۆژە زێڕن قەبایەکی سووری تازە کە هەیبوو دەبەری کرد و کەلاغەیەکی جوان کە پووری لە مەشهەد بۆی هێنابوو دە سەری هاڵاندبوو و حەوت لۆ کەزێی لە پشتەوە هاتبوو دەر، وەها کە جگە لە ئەندامی ڕێکیی و کەشم و نەشم و جوانیی روخساری، جلەکەش جوانتری کردبوو، دەتکوت هەر لەبەر ئەمە بوو کە دە نێوان سەدان کیژ و لەم قەرەباڵغییە دا بەبوو ئاوڕی دەداوە و بە دزی چاوی لێدەکرد و بزەی دەهاتێ و بە زیرەکی و وردکۆڵی و هەستێک کە لەوانەیە کیژۆڵەیەک هەیبێ شکێک بۆ زێڕن نەماوە کە بەبوو خۆشی دەوێ و پێوەندییەکی تایبەتی دە نێوانیان دا ساز بوە. ئاخۆ کاتی وا دەبێ چ بکەن؟ وەها بە هەشتاو خوێن دە لەشی دا دەگەڕا کە هەستی دەکرد سەر کوڵمەکانی گەرم داهاتوون وەک وەی گڕیان گرتبێ. وەها سوور هەڵگەڕابوو کە **شاربانوو** کچی **کشوەرسوڵتان** تێیگەیشت. ئایا زێڕن دەیتوانی ئەم هیوایە بدا بە خۆی کە ببێتە ژنی بەبوو، لە حاڵێک دا کە دوو خوشکی لە خۆی گەورەتر هەیە کە هێشتا مێردیان نەکردوە و جگە لەوەش ئەو لای دایکی لە هەر دووی ئەوان چارەڕەشترە؟ چونکە بەر لەوەی بێتە سەر دونیا باوکی مرد و دایکی دایم و دەرهەم سەرکۆنەی لێدەدا کە تۆ سەری باوکت خواردوە و ئەوی پێ پێوقەدەم رەش بوو. بەڵام لە راستی دا چونکە دایکی دوای زان نۆبەتێی گرت و دوو مانگ لە جێ دا کەوت لەبەر ئەوە ناخۆشی دەویست.

لای ئێوارەی ئەو رۆژە کە هەموو کرێکارەکان دەستیان لە کار هەڵگرت و بە نێوان مێوەکان دا کە وەک گوریسی قاوەیی لە سەر تەپکۆڵەکان لێک





هالآبوون، تێپەڕین و بۆ لای رووباری سیائاو چوون و ترێکانیان وەک هەموو رۆژێ تەحویلی ردێن سپی دێیەکەیان ماندگار عەلی دا، زێڕن و دایکی و مێرێ دەگەڵ گاڕان کە لە رێیە تووشی بوون بۆ لای قەلآی کاگڵی خۆیان کە بورج و بارووییەکی بەرزی هەبوو، وەڕێ کەوتن. لە رێ دا زێڕن باسی گیرۆدەیی خۆی بە بەبوو کرد و مێرێ دڵی داوە و بەڵێنی دا کە هەر یارمەتییەک لە دەستی بێ کۆتایی ناکا.

چ شەوێکی سەخت بە سەر زێڕن دا تێپەڕی! مانگەشەو بوو، خەوی لێنەدەکەوت، هەستا کە ئاو بخواتەوە. لە دوایی چوو هەیوانی ماڵەکەیان. نا، هەر پێی خۆش نەبوو بخەوێ. شووبایەکی فێنک دەشنی، سینگی ئاوەڵە بوو بەڵام هەستی بە سەرما نەدەکرد. دەنگی پرخەی دایکی کە وەک ئەژدیها لە ژوورێ خەوتبوو، دەبیست. هەر کاتێک هەستابا، ئەوی بانگ دەکرد، بەڵام چ قەیدی؟ چونکە لە تەواوی گیانی خۆی دا هەستی بە شۆڕش و سەربزێویی دەکرد. لە سەر پەنجەی پێیان چوە دەم حەوز، لە ژێر داربناو وەستا. لەم کاتە دا دەتکوت کە درەخت، زەوی، ئاسمان، ئەستێرەکان و تریفە هەموویان بە زمانێکی تایبەتی دەدوێن. حاڵەتێکی غەمێنەر و خۆش بوو کە هەتا ئێستا نەیچێژتبوو، ئەو زۆر باش دە زمانی درەختەکان، ئاوەکان، شووبا و تەنانەت دیوارە بەرزەکانی ماڵ و ئەو قەلآیەی کە تێیدا زیندانی بوو و هەروەتر زمانی کیتەڵە ماستێک کە لە پێشۆریی حەوزەکە دابوو، دەگەیشت و لە خۆی دا هەستی پێدەکرد. ئەستێرەکان وەک دڵۆپی ئاونگ کە لە هەوا دا پڕژابن، کز و ترسەنۆک بە شۆقێکی لەرزۆک دەدرەوشانەوە. هەمووی ئەوان و هەر شتێکی ئاسایی و بێنرخ لەبەر چاوی ئەو سەیر، نائاسایی و پڕ لە راز بوو کە مانایەکی دوور و نەناسراوی هەبوو و قەت بە مێشکی ئەو دا نەدەهات. بێ ویستی خۆی دەستی بە سەر سینگ و مەمکەکانی داهێنا و هەتا سەر باسکەکانی برد، شووبا بسکەکانی پەرێشان کردبوو. لە ئاکام لە دەم حەوز دانیشت و کوڵی گریان بەر ئەوکی گرت و لە قوڵپی گریانی دا و فرمێسکە گەرمەکانی بە سەر کوڵمەکانی دا هاتنە خوار. ئەم لەشە نەرم





و ئەم نێوقەدە تەنگە بۆ دە هەمێز وەراندنی بەبوو ساز ببوو. مەمکە چووکەکانی، باسکەکانی و هەموو لەشی چاتر بوو بچنە ژێر بارستی گڵەوە و لە بن خاک بڕزێن هەتا ئەوەکە لە ماڵە دایکی بە جنێو و بەدبەختی داڕزێ و مەمکەکانی داچۆڕن و ژیانی بێسوود و بێ ئاکام و بێ خۆشەویستی بە فیڕۆ بچێ. دەیەویست خۆ دە خۆڵ بگەوزێنێ، کراسەکەی دادڕ دادڕ بکا هەتا لە دەست ئەم کوڵە، ئەم بەدبەختییە کە ئەوکی گرتبوو، رزگاریی بێ. هۆڕهۆڕ گریا، لەم کاتە دا تەواوی چارەڕەشیی و ژیانی هاتە بەر چاوی، ئەو جنێوانەی کە بیستبووی، ئەو لێدانانەی کە وێیکەوتبوو ـ هەر ئەودەم کە منداڵێکی چووکە بوو دایکی چەپۆکێکی بە سەری دادەدا و کوتە نانێکی دەدا دەستی و لە پشت دەرگای ماڵەکەیانی دادەنیشاند و ئەو دەگەڵ منداڵە کەچەڵ و چاوگلەکان کایەی دەکرد. قەت روویەکی خۆش یا چووکترین خۆشەویستی لە دایکی نەدیتبوو. هەموو ئەم بەدبەختییانە دە هێندە گەورەتر و بەسامتر دەهاتنە بەر چاوی. دیسان باش بوو مێرێ و دایکی هەندێک جار دەیانلاواندەوە و هەر کاتێک دایکی لێیدەدا، پەنای بۆ ماڵە وان دەبرد. زێڕن فرمێسکەکانی بە سەردەستی سڕیوە و هەستی کرد کە هەندێک سووک بوو. دڵەکوتە و سەربزێویی دامرکا و هەستی بە سوکنایی کرد ـ جۆرێک سوکنایی بێهۆ بوو کە سەرتاپای لەپڕ داگرت. چاوەکانی قووچاند، هەوای نەرمی هەڵمژی، بەڵام سیمای بەبوو لەبەر چاوی نەدەبزووت، باسکە بە هێزەکانی ئەو کە سیپە باری دە دوازدە مەنی وەک پەڕی کا هەڵدێنا و لە سەر وڵاغی دادەنا، تووکە زیک و سوورەکانی، ملی ئەستووری سوور، برۆ پان و پێک لکاوەکانی، ریشی پڕ و چڕی، ئێستا دەیزانی کە دونیایەکی دیکە جگە لەو دونیایەی کە ئەو دە زەینی دابوو، هەیە. ئاخرەکەی لوێچێکی ئاو بە دەم و چاوی داکرد و گەڕاوە و لە سەر جێکەکەی پاڵ کەوت، بەڵام خەوی لێنەکەوت، لە سەر نوێن جینگڵی دا و دە دڵی دا نیەتی کرد ئەگەر بە کاو و مرادی خۆی بگا و ببێتە ژنی بەبوو، هەر ئەو جۆرەی کە خۆی لە زیندانی ماڵی باوکیی رزگار دەبێ کۆترێکی بکڕێ و بەڕەڵای





بکا و شەوی هەینیش شەمێکی لە ئیمامزادە **بیبی سەکینە** هەڵبکا، چونکە **ئەستێرە** کچی **نایب عەولای** میراویش هەر ئەو نەزرەی کردبوو و مێردی کرد.

بەیانی ڕۆژی دوایی، زێڕن بە چاوە سوور هەڵگەڕاوە بێخەوەکانی، هەستا و چوە ترێ ڕنینەوەی. لە سەر ڕێ لە پەنا ڕووباری سیائاو لە ژێر داری چناری مراد ئەو جێگایەی کە بەبوو ترێکانی لە بار دابوو، وەستا. هەندێک گەلامێوی پێشێلکراو و تەرسی ولاغ و تویکڵی تۆو کوولەکە شوێنەواری دوێنێ لە سەر زەوی کەوتبوون. زێڕن لە لێواری یەخەی داوێکی دەرکێشا و نیەتی لە داری چنار کرد و گرێی لێدا، بەڵام هەر گەڕاوە مێرێی تووش هات و کوتی:

ـ بۆچی ئەوڕۆ چاوەڕێی من نەبووی؟ لێرە چ دەکەی؟

ـ هیچ، من پێموابوو هێشتا هەر خەوتووی، نەمدەویست هەڵتستێنم، ئەوڕۆ بەیانی زۆر زوو وەدەر کەوتم.

بەڵام مێرێ قسەکەی بڕی و کوتی:

ـ من دەزانم لەبەر بەبوویە!

زێڕن بۆ مێرێ دەردی دڵی کرد و لە بێخەویی خۆی و ئەو نەزرەی کە کردبووی هەمووی بۆ گێڕاوە. پێکەوە ڕاوێژیان کرد و مێرێ دیسان دڵی داوە و بەڵێنی دا کە لەم بارەوە دەگەڵ دایکی قسە بکا. چونکە دایکی مێرێ تەنیا کەسێک بوو کە زێڕنی خۆش دەویست. بەیانی زێڕن هەرچی چاوەڕوان بوو بەبووی نەدیت، بەڵام مێرێ خەبەرەکەی هێنا کە بەبوو لە دەشت کار دەکا. نیوەڕۆ کە بۆ نەهار گەڕانەوە ماڵ، زێڕن چوە وەتاغی پێنجدەریی و دەرگاکانی داخست و لە بەر ئاوێنەیەکی دەمپەڕاو کە دە مجرییەکەی خۆی دا هەیبوو، پرچەکانی بە ڕێکی شانە کرد و جوان لە حاڵەت و جووڵەکانی سیمای خۆی خورد بۆوە هەتا ئێوارێ کە بەبوو ببینێ چلۆن پێبکەنێ و چ شێوەیەک لە خۆی نیشان بدا کە بە دڵی خۆی بێ. لە ئاکام بزەیەکی سووکی پەسند کرد، چونکە ئەگەر پێکەنیبا ددانەکانی کە ڕێک نەبوون دەردەکەوتن، هەروەتر لۆیەکی پرچی هێنا سەر





نێـوچەوانی و لەبـەر رازی بوون لە خـۆی بزەیەکی هاتـێ. چونکە خـۆی پێ جـوان و شـیـاوی خـۆش ویستن دیت. برژانگە درێژەکـان، بزەی دڵرفـێن، سـیـمـای منداڵانەی سـادە و خـەتێک کە دەکـەوتە سـووچی لێوەکـانی، لێک دەهاتنەوە. سوورایـی تۆخـی سـەر کوڵمی پێسـتی رەش ئەسـمەری سیـمای باشتـر دەردەخست و سوورایی تەڕ و گـەشـی لێوەکانـی کە لە رەنگی ترێی سـوور بوو و زاری گـەرمی ئەو و بە تایبـەت چاوەکـانی، ئەو نیگا گـیـرایەی کە دایکی مێرێ هەمیشـە پێیدەکوت: « چاوەکانت سەگیـان هەیە » هەموو ئەوانە ئەوی لە زۆرێک کیژی لاوی دیکە شازتر دەکرد.

کاتێک نیـوەڕۆ زێڕن دەگەڵ مێرێ گـەڕانەوە ترێ رنینەوە دە نێو دڵی دا خۆشحـاڵ بوو، چونکە تەمای گرتبوو کە بە هەر لەونێک بێ خۆی بە بەبوو نیـشـان بدا . سـەرسـوڕمـاویی زێڕن پتـر بوو چونکە بەبـووی لەوێ دیت و تەواوی نیوەڕۆ وێڕای کار بە گەمە و گۆرانی کوتن تێپـەڕی. بە پێچەوانەی رۆژەکـانی پێش کە زێڕن ژاکـاو و داماو بـوو، ئیمـڕۆ شاد و خـۆش هێشـوو ترێکانی لێـدەکـردەوە و فـاڵی پێـدەگـرتەوە. بەمـجـۆرە کـە بۆڵێک ترێی لێدەکردەوە و دەیخـوارد و بۆڵێکی دەدا بە مێـرێ و لای خـۆی نیـەتی کـرد ئەگەر بۆڵی ئاخر وەبەر وی کەوێ بە مـرادی دەگا، یانی دەبێتە ژنی بەبوو. لای ئێـــوارێ کـــە گــەڕانــەوە بن داری چنـار بەبـوو و زێڕن دیســـان چەند جـاریـان چاو تێکبـڕی. بەبوو پێـیـپـێکەنی و زێڕنیش وڵامـی پێکەنینـەکەی داوە، هـەر ئەو جۆرەی کە لە ئاوێنە دا پەسندی کردبوو بە تـەڕدەستییـەکی تایبەتی سەری خۆی راوەشاند و لۆیەک لە پرچی کەوتە سەر نێوچەوانی.

هـەتا چوار رۆژان بەمجـۆرە تێپەڕی و رۆژ دەگـەڵ رۆژ ورە و ئازایی پتر دەبوو و کـەم کەمـە پێوەندییـەکی تایبـەت دە نێوان ئەو و بەبوو دا پێکهات. هـەتـا ئەوە کـە رۆژی چوارەم مـێـرێ مـزگـێنی بۆ زێڕن هێنا کـە دایکی کارەکـانی جێبەجێ کردوە. زێڕن لە خۆشـیـان سـەر لێوەکانی مێرێی ماچ کرد، چلۆن کارەکەی جێبـەجێ کردبوو؟ دەگەڵ کێ قسـەی کردبوو؟ زێڕن هیـچ پێویست نەبوو کە تێبگا، هـەر ئەوەندەی دەزانی کە هەندێک پیـرێژن پتـر لە ژیان دەگەن و بۆ ساز دانی زمـاوەند و نێوبژیی کردن تەڕدەستن و





ڕێگای وا دەزانن کە قەت بە مێشکی هیچ لاوێک ناگا. ئێستا دەیتوانی ئەم هیوایە بدا بە خۆی کە بە ئاواتی گەیشتوە، بەڵام ئەوەی کە چەتوون بوو ڕازی بوونی دایکی خۆی بوو کە هەر ئەم قسەی پێگەیشـباوە دەرهەڵدەبوو و دەتەقیەوە و لەو تووک و جنێوە تەڕانەی کە لە سەر زاری بوو، پێدەدا. چونکە ڕۆژێ سێ عەبباسی حەقدەستی زێڕنی لەو وەردەگرت. لە ئاکام دوای زۆریی و پێ داگرتنی دایکی مێرێ، دایکی ڕازی بوو و دوای دمەقاڵەیەکی زۆر دەستێک جلی سووری بۆ هەڵگرت، بەڵام هەر کوتێکی کە دەبڕی نزا و نزوولەی دەکرد و دەیکوت: « یاڕەبی لە سەر تاتی مردووشۆرخانە بکەوی، شەپڵەت لێدا، شاییت لێ بێتە شین، ڕەبی جەرگت خرابێ، حەسرەت لە سەر دڵت بمێنێتەوە، جوانەمەرگ بی بەو مێردە لەندەهۆرەی کە دیتووتەوە! » بەڵام گوێی زێڕن لەم تووکانە پڕ ببوو و ئیدی کاری تێنەدەکرد. مەنجەڵێکی مس و سەماوەرێکی زەردی چووکی بابەتی گیاز دایە. ڕۆژێک لای ئێوارە دایکی مێرێ بانگەوازێکی تەواوی لە خەڵکی دێ کرد و ژنە لادێییەکان وەک بووکە سەماکەرەکان چارشێو بە سەر یا کەلاغەیان دە مل هالاندبوو، هەموو بۆ زەماوەندی زێڕن کۆ بوونەوە. بەڵام خوشکەکانی ئەو خورشید و بێمانی خانم نەهاتنە ئەم ئاهەنگە. مەلای دێ **سەید مەعسوومیان** هێنا و زێڕنی لە بەبوو مارە کرد. لە دوایی بۆ چاوەزار چوە سەر مینبەر و هەندێکی ڕەوزە خوێندەوە. دایکی دەستووری دا ڕەوزەی زەماوەندی قاسم بڵێ و هەموویان گریان. کاتێک ڕەوزە تەواو بوو ماندگار عەلی و کوڕەکەی شێرزاد بوونە ئاواڵ زاوای زاوا. بن پیلی ئەویان گرت و هێنایانە نێو کۆڕ و ئەو لە سەر سەندەڵییەک کە شاڵیان پێدادابوو، دانیشت. ئەودەم شێرزاد دەستی کرد بە پارە کۆ کردنەوە، لە پێشدا چوو بەر باوکی و بە بزەوە کوتی: « با باوکم جەریمە بکەم ». مێرێ کە کەشەفی دەگێڕا هات و کەشەفەکەی لەبەر ماندگار عەلی ڕاگرت و ئەو دوو تمەنی دەرهێنا و دە کەشەفی هاویشت. دەستبەجێ تەپڵژەنێک کە لە سووچێک دانیشتبوو لە تەپڵی کوتا و کوتی: « دوو تمەنت دا ماڵت ئاوا » و بەمجۆرە نزیک سی تمەنیان





بۆ زێڕن کۆ کردەوە و ئاهەنگەکە بە خۆشی بەڕێوە چوو.

سبەی بەیانی زێڕن لە خوشکەکان و دایکی ماڵاوایی کرد بەڵام دایکی لەبری ئەوە کە بە رووی خۆشەوە بەڕێی بکا، هەتا دەم دەرگای ماڵێ وەک بەرازێکی بریندار بە رووی ئاولاوی کە دەتکوت توێکڵە شووتییە و مریشک دندووکی لێداوە، بە دوای دا هات و تووکی لێکرد. دوایی زێڕن چوە ماڵە مێرێ و لە دایکی و لە خۆی ماڵاوایی کرد. رووی مێرێی ماچ کرد و پێیراسپارد کە شەوی هەینی شەمێک لە ئاغا بیبی سەکینە هەڵبکا و کۆترێکیش بەرەڵڵا بکا. ئەودەم زێڕن باروبنە، سەماوەر و مەنجەڵی مسی هەڵگرت و چوە مەیدان، بن داری چناری مراد، ئەو شوێنەی کە بەبوو چاوەڕێی بوو. سواری ولاغ بوو و بەبووش سواری ولاغێکی دیکە بوو و پێکەوە بەرەو تاران وەڕێ کەوتن. شەو و رۆژێک بەڕێوە بوون. زێڕن لە خۆشیان دەیەویست بفرێ، بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد. تریفە ئەنگووت و بەبوو چەند جار دەستی بەهێزی دە ملی ئەو ئالاند و ماچی تەڕی لە لێوەکانی کرد. تامی زاری سوێر بوو وەک تامی فرمێسکی چاو بوو. بەبوو ناوی زێڕنی بە فاڵێکی باش دانا چونکە ناوی دێیەکەی لە مازندەران زێڕن ئاوا یا زێڕن کلاو بوو و ئەم وێکچوونەی بە قسمەت دانا.

هەر گەیشتنە تاران، ماوەی دوو مانگ لە دیوێکی چووک کە لە گەڕەکی **سەرچشمە** گرتبوویان، بە خۆشی رایانبوارد. بەبوو رۆژانە دەچوو سەرکار، زێڕن گەسکی لێدەدا، پینەی دەکرد، بە کارەکانی ماڵێ رادەگەیشت و شەوانەشیان بە کەیف و نەهەنگ رادەبوارد، وەها کە زێڕن منداڵەتی خۆی، خوشکەکان و دایکی و تەنانەت مێرێی بە تەواوەتی لە بیر کرد. بەڵام لەعنەت لە ئاواڵی خراپ. سەری مانگی سێهەم ئەخلاقی بەبوو گۆڕا ـ هەموو شەوێ لە قاوەخانەی **رەزاسمێڵ** دەگەڵ غولام وافووری دەکێشا، خەرجیی نەدەدا بە ژنەکەی و شتێکی کە سەیر بوو لە جیات ئەوە کە تریاک ئەو سڕ و داتەپیو بکا، بە پێچەوانە وەک خوتخوتە یا نەخۆشی هەر دەگەیشتەوە ماڵێ زێڕنی وەبەر قەمچی دەدا و باش ئەوی دەکوتا. لە پێشدا پەلپی پێدەگرت ئەویش لە سەر شتی وردە، بۆ وێنە





دەیکوت: بۆ سووچی چارشێوەکەت سووتاوە، یا سەماوەرەکەت درەنگ پێوەناوە، یا دوێنێ شەوێ شۆرباکەت زۆر سوێر کردبوو، ئەوسا چاوە دڕە بێ حاڵەتەکی دەخولاوە و قەمچی ڕەشی چەرم کە سەرەکەی دوو گرێی لێدرابوو، هەر ئەو قەمچییەی کە لە وڵاغانی دەدا، لە سەر سەری هەڵدەسووڕاند و لە باسک و ڕان و نێوقەدی زێڕنی رادەکێشا. زێڕنیش چارشێوی لە خۆی دەهاڵاند و ئاخ و ناڵەی دەکرد، وەها کە دراوسێکان دەهاتنە بەر ژوورەکەیان و جنێویان بە بەبوو دەدا و تووکیان لێدەکرد و نەسیحەتیان دەکرد. لە دوایی بەبوو پێلاقەیەکی لە زێڕن رادەکێشا و قەمچی فڕێ دەداوە سەر تاقچە. بەڵام ناڵەناڵ و گریانی بێبڕانەوە و بە قەستیی زێڕن چەند سەعاتێک درێژەی هەبوو. ئەودەم بەبوو لە بەر کەیف دەچوو سووچی ژوور و هەڵدەترووشکا، پشتی وە سندووق دەدا و سەبیلەی تێدەکرد. شاڵوارە شینە کورتەکەی لە سەر چۆکی دەچوو خوارەوە و ماسوولکەی رانی هەڵدەمسا. بەلەکی پتەو و بە هێزیی کە بە قەرا بستێک بەلەک پێچی لێبەستبوو، دەگەڵ رانی سپی کە دەردەکەوت ئەوی شێت و شەیدا دەکرد، دوایە بەبوو دەیکوت: «ژنەتیوە ئەوشۆ چمان هەیە؟» زێڕنیش بە ناز و غەمزە هەڵدەستا دەچوو دیزەکەی دێنا و دە بادیەی مسی دەکرد. نانیان دە بادیە دەکوشی و بە پیواز دەیانخوارد و دەستیان بە ئاستەڕی جلەکەیان دەسڕیوە. تەنیا کاتێک کە زێڕن چرای دادەکێشا و دەیانەویست دە نوێنی سوور دا کە گوڵی ڕەش و سەوزی لە سەر بوو، بخەون، بەبوو سەر چاوی فرمێسکاوی سوێری زێڕنی ماچ دەکرد و پێکەوە ئاشت دەبوونەوە. ئەم کارە هەموو شەوێ دووپات دەبۆوە. زێڕن سەرەڕای ئەمە کە لە ژێر قەمچی دە خۆی دەهالا و ئاخ و ناڵەی دەکرد بەڵام لە ڕاستی دا کەیفی دەکرد. لە ئاست بەبوو دا خۆی پێ چووک و بێدەستەڵات هەست پێدەکرد و هەرچی زۆرتر قەمچی وێدەکەوت هۆگریی ئەو بە بەبوو پتر دەبوو. دەیەویست دەستە پتەو و بە هێزەکەی ماچ بکا، ئەو کۆڵمە سوورانە، باسکی قەوی، ملی ئەستوور، لەشی تووکن، لێوە زەلام و گۆشتنەکانی، ددانە سپی و قایمەکانی، بە تایبەت





بۆنی لەشی ئەو، بۆنی بەبوو کە بۆنی سەرانگوێلکی لێدەهات و هەڵسووڕانی توورە و تۆسنی ئەو لە کاتی تێهەڵدانی لە هەموو شت پتر خۆش دەویست. ئایا دەکرا مێردێک لەو باشتری دەست کەوێ؟ سەری نۆ مانگە زێڕن کوڕێکی بوو، بەڵام منداڵ کە هاتە سەر دونیا داغی دوو خەتی سووری لە سەر کەمەر بوو، وەک شوێنی قەمچی و زێڕن پێیوابوو کە ئەم خەتانە هی قەمچییەکە کە بەبوو پێی لێیداوە و گەیشتۆتە منداڵ. بەڵام کوڕەکەی هەمیشە عەلیل و نەخۆش بوو، زێڕن ناوی **ماندەعەلی** لە سەر کوڕەکەی دانا و ئەم ناوەی لە ناوی ماندگار عەلی ردێن سپی پەرەندەک پێی ئیلهام کرا کە لە سەر منداڵەکەی دانا هەتا بمێنێ و گەورە بێ.

دوای ماوەیەک کاسبی بەبوو کەساد بوو. یەکێک لە وڵاغەکانی تۆپی و ئەوی دیکەشی فرۆشت و پارەکەشی خەرجی تریاک و نوشتە و چارەی نۆبەکەی کرا، دوایەش ناڕێکوپێک دەچوە کار. هەتا ئەوەکە ساڵی دوایی پێنج تمەنی خەرجیی دا بە زێڕن و کوتی بۆ بیست ڕۆژان دەچمە کار و دەگەڕێمەوە. بیست ڕۆژەکەی بوو بە مانگێک و لە مانگێکیش چەند ڕۆژ تێپەڕی. هەرچەند زێڕن عادەتی بە دەست پێوە گرتن هەبوو و لە زاری خۆی و منداڵەکەی دەگێڕاوە و کاری دەکرد و دەیتوانی ساڵێکی دیکە دوو ساڵی دیکەش چاوەڕێ بێ بە شەرتێک دڵنیا بێ کە بەبوو مێردیەتی و دەگەڕێتەوە. چونکە زێڕن پێیوابوو هەر ژنێک بەبوو ببینێ لە ئاستی دا تاقەت ناهێنێ و خۆی دەدۆڕێنێ و لەوانەیە زۆر زوو دەم هەراشەکان مێردەکەی لە چنگ دەرکێشن. لەبەر ئەوە بۆ دیێتنەوەی وەخۆ کەوت. لە هەر کوێ و هەر کەس سوراغی بەبووی گرت کەس خەبەری لێی نەبوو. هەتا ئەوە کە شەوێک چوو قاوەخانەی ڕەزاسمێڵ، دەرگای کە کردەوە بۆنی دووکەڵی تریاک هاتە دەرێ و گشت سیما زەردەکان، چاوە دەرپەڕیوەکان، بیچمە سەیر و سەمەرەکان کە بە ئازادییەکی تەواو بیرە داماوەکانی خۆیان لە عالەمی نەشە و لاهووت دا پەروەردە دەکرد. زێڕن غوڵامی ناسیوە، بانگی کرد و هەواڵی مێردەکەی لێپرسی. غوڵام کوتی:

- بەبووی دەڵێی؟ چوو ئەو جێیەی کە ساڵێکی دیکە دەگەڵ بەفر بێتەوە





خوار. تۆی بە جێ هێشت، ژنی هێناوە، چۆتەوە دێیەکەی زیناوا. بە منی کوتوە کە سوراغی نەدەم بە کەس.

- زێڕن ئاوا؟

- ئادی زیناوا.

زێڕن بۆنی کرد کە بەبوو کڵاوی لە سەر ناوە و لە دەستی هەڵاتوە چۆتەوە دێیەکەی. چونکە زۆر جار بۆی گێڕابۆوە کە بنەماڵەکەی لە دێی زێڕن ئاوا لە سەر ڕێی ساری - یە و لەوێ دوو برا و کوتە زەوی و مشتێک ئاو و گیایان هەیە. بەبوو لەبەر تەوەزەلییەک کە هەیبوو هەمیشە هیوا و ئاواتی خۆی پێکوتبوو کە بچێ لەوێ کار نەکا. بخوا و بخواوەتەوە و بە قەولی خۆی: خیارێک بخوا و پێی بە دیوارەوە بنێ و بخەوێ. زێڕن بەڵێنی پێدەدا کە لەوێ کاری بۆ بکا. بەڵام بەبوو سەرسەرەکیی وڵامی دەداوە. ئەمە بوو کە زێڕن گورج تەمای گرت کە بڕواتە مازندەران و بەبوو بدۆزێتەوە. ئاخۆ مانگێک بەس نەبوو؟ ئایا دەیتوانی دیسانیش چاوەڕوان بمێنێتەوە؟ تاقەتی دووریی بەبووی نەدەهێنا. هەناسەی گەرمی ئەو، تینی لەشی، تووکی زوور و بۆنی سەرانگوێلکی و ئێستاکە لە جیایی و دووریی ئەو دا هەموو ئەم ئایبەتمەنییانە بە شێوەیەکی پڕ لە ڕاز و دڵڕفێن دەهاتە بەر چاوی زێڕن و بێشک ئەو نەیدەتوانی بێ بەبوو بژی. هەرچی دەبێ با ببێ، ئەوی دەویست، بە دەست خۆی نەبوو. دوو ساڵ بوو کە خووی پێگرتبوو و مانگێک بوو، مانگێکیش پتر کە خەبەری لە مێردەکەی نەبوو.

زێڕن بە ئاواتەوە بوو کە دیسان بەبوو ببینێتەوە هەتا بەو قەمچییەی کە لە وڵاغەکانی رادەکێشا ئەو وەبەر قەمچییان بدا و دیسان یا تەنیا بۆ جارێکی دیکە هەر ئەو جۆرەی کە قەپی لێدادادەگرت و ڕێکی دەکوشی، دە باوەشی بگرێ. شوێنی داغ و شینی قەمچی کە لە سەر باسکی بوو، سەر ئەو داغانەی ماچ دەکرد و سیمای تێهەڵدەسوو و هەموو ئەو بیرەوەریانەی رابوردوو بە چەشنێکی ئەفسووناویی دەهاتنە بەر چاوی. دەیەویست سەرتاپای بەبوو ماچ بکا، بۆنی پێوە بکا، دەستی بە سەر دابێنێ. کارێک





کە قەت نەیوێرابوو بیکا، ئێستا پەی بە قەدر و نرخی دەبرد! ئەوە کە بەبوو بە دەستە زوورەکانی ئەوی بە سینگی خۆیەوە رێکدەکوشی، حاڵەتێکی خۆشی تێدا پێکدەهێنا کە ناکرێ دەریبڕی. برۆ پڕ و پێک لکاوەکانی، برژانگە زوورەکان و ردێنی لەو زوورتری سووری خەناویی، کە وەک چڵی گەسک لە سیمای دەرپەڕیبوو، کەپۆی گەورە، کوڵمە سوورەکان، بەرخەبەبەی ژێر چەنەی، لێوە سوورەکان، کاتێک کە لەواشەکی دەخوارد شێویلکەکانی وەک بەرداش دەخزانە سەر یەک و ددانە سپی و قایمەکانی لە سەر دادەگرت، چاوە گەورە و بێ حاڵەتەکەی دەگەشاوە، لاجانگەکانی دەجووڵاوە. ئەم شوبارە ئەگەر منداڵ لە تاریکی دا دیتبای زەندەقی دەچوو و پێی وا دەبوو غوولێکی بێ شاخ و بێ کلکە لە بەر چاوی زێڕن جوانترین سەر بوو. بە پێچەوانە کە وە بیر ماڵەوە دەکەوتەوە وە لەرزە دەکەوت. ئەو جنێوانەی کە پێیدرابوو، چەپۆک، تووک، هیچ پێی خۆش نەبوو دیسان بگەڕێتەوە نێو ئەو زیللەت و چارەڕەشییە. ئایا بەبوو فریشتەی رزگاریی ئەو نەبوو؟ بەڵام تەنیا کەسێک کە خۆشی دەویست مێرێ کچی دراوسێیان بوو کە پێی ناخۆش نەبوو بیبینێ، بەڵام نەیدەویست قەت بگەڕێتەوە ماڵێ، ئەو روخسارە پیرانە، ئەو ئەخلاقانەی کە خراپتر ببوون، هیچ پێی خۆش نەبوو ئەوان ببینێ و مەرگی سەد بەرابەر پێ باشتر بوو لەوەی کە دیسان بگەڕێتەوە ئەلویز. وە بیری هاتەوە کە رۆژی زەماوەندەکەی کشوەر سوڵتان دایرەی لێدەدا و دەیکوت:

« ماڵە باوان نان و هەنجیر

ماڵە مێران کۆت و زنجیر

ئیشەڵڵا مەبارەکی بێ »

زێڕن کۆت و زنجیری ماڵە مێردی لە نان و هەنجیری ماڵە باوکی پێ باشتر بوو و حازر بوو لە سووچی کۆڵان سواڵکەریی بکا و نەچێتەوە وێ، نا، هێشتاش تووکەکانی دایکی، رۆژی زەماوەندی کە دەستووری دا رەوزەی زەماوەندی قاسم بڵێن و هۆڕهۆڕ گریا لە بیری نەکردوە. ئەو





دەستـە لاوازە خـاڵ کـوتراوانەی کـە خـەریکی تێکوەردانی ئاورگی مـاڵێ دەبوو، دەتکوت دەگەڵ هێـزێکی نەناسـراو قسـە دەکـا و داوای یارمـەتی لێدەکرد. تووکی لەو دەکرد و دەیکوت: « ئەو ئاورگە گەرمـە بتگرێ، رەبی جەرگت خـرابێ. شاییت لێبێتـە شـین ... » دیسان لەوێ بکە و نەکەی گوێ لێبێ، بۆ چـەپ بچـێ هـەزار جـۆرە جنێو، بۆ راست هـەزار جـۆرە بوختـان. ئەودەم تیـر و تانـەی لێـدا و بلێ: « مـەگـەر پـێم نەکـوتی کـە ئەمـە پارووی زاری تۆ نیە؟ تۆ لیاقەتت نیە، بەبوو بۆ تۆ نابێتە مێرد. » و هـەر ئەو جنێوە تەڕانەی پێبدا! زێڕن لەم فکرە مـچوڕکی پێدا هات، نا، ئەو هـەر زیللەتێکی پێ باشترە لەوەی کە بگەڕێتەوە ماڵە دایکی.

لەبەر ئەوە کـە زێڕن نەیدەویست ئەم بیرە بخـاتە نێو مـێشکی کـە ئیدی بەبوو نابینێتـەوە، تەنیـا بەبوو بوو کە دەیتوانی نیگای بێ شـۆقی رووناک بکاتەوە و لەشـی ژاکـاوی ببـووژێنێـتـەوە، بـە هـەر نرخـێکی کـە بوایە دەیەویست ئەو بـدۆزێتـەوە. دامـنا ئەگــەر ژنی دیکـەشی هێنابێ یا ئەوی نەوێ، بەڵام ئـەوەندە کـە لە نزیک ئەو بێ بـۆ وی بەس بوو. ئەگـەر لە سـەر رێی بـەبوو سـواڵکـەریشی کـردبا لانی کـەم رۆژێ جـارێک ئەوی دەدیت. ئەگەر تێیهـەڵدابا، دەری کردبا، سـووکایەتی پێکردبا دیسان لـەوە باشتـر بوو کـە بگەڕێتـەوە مـاڵێ. نـەیدەتوانی، خـۆ بە زۆریی نیـە، سروشـتی ئەو وەهـا دارِشـتـرابوو. منداڵەکـەشی مـاندەعـەلی بوونەوەرێک بوو کـە هیچ چاوەڕوانی نەدەکرد و خۆشەویستییەکی سەبارەت بەو هـەست پێنەدەکرد. هـەر ئـەوجـۆرەی کـە دایکی خـۆی هـۆگـرییـەکی بەو نـەبوو. بەڵام چەلێ پێویسـتی بە بوونی ئەو هەبوو. چونکە بیسـتبووی کە منداڵ بزمـاری نێو مقـەستە و ئێستا بەو چەکەی کە بە دەستیەوە بوو هیوادار بوو. بەشکەم بتوانێ ئەم پێوەندییە هەڵپچڕاوە بەو منداڵەوە لێک ببەستێتەوە، چێشتی باشـی دەرخــوارد دەدا، مــیــوەی بۆ دەکــڕی هـەتا عــادەتی پێــبگرێ و هۆگرییەکی کەم کە پێی هـەبوو لەبەر ئەمە بوو کە مووی سـەری وەک مووی ســەری بـەبوو بـوو و لەبـەر ئەوە کــە منداڵ نـەگــری و گــڕوو نـەگــرێ، گـڕمـۆڵەیەکی چـووکی تریاک دەدایە و منداڵ بە چاوە خـومـارەکـانی دایم





وەنەوزی دەدا. زێڕن دڵنیا بوو کە بە پرسەپرس بەبوو دەدۆزێتەوە و دڵ و مەیل و هەستی پێیان دەکوت کە بە مەبەستی دەگا، ئەم مەیل و بە دڵ داهاتنە سروشتییە کە هیچکات فریوی نەدابوو.

ئەوڕۆژەی کە تەمای گرت وە دوای مێردەکەی کەوێ، شەمێکی نەزر کردە سەقاخانەی نزیک ماڵەکەیان هەتا بەبوو بدۆزێتەوە، دوایی سەماوەر و مەنجەڵی مس کە تەواوی گیازەکەی بوو بە سێ تمەن و چوار قڕانی فرۆشت. دوازدە قڕان قەرزەکەی داوە بە دوکاندارەکانی گەڕەک، دوو تمەن و دوو قڕانیشی بۆ خەرجی سەفەر هەڵگرت. هەرچی وردەواڵە هەیبوو دە مجرییەکی کۆنەی کرد و بۆ بارمتەی قەرزەکەی لە کن خاوەنماڵی بە ئامانەت دانا. لە دوایی لە بوخچەیەک دا دوو کراس و دەستێک جلی بۆ ماندەعەلی دەگەڵ هەندێک نان و پەنیر و دوو کوتە لەواشەک لەو لەواشەکەکانەی کە بەبوو ئەوەندە باش دەیخوارد، دانا و دوای سێ رۆژ هاتوچۆ جەوازی بۆ مازندەران وەرگرت. سبەکەی فێنکایی بەیان وەڕێ کەوت، بەڵام لەبەر ئاگا لە خۆ نەبوون لە جیات ئەوە کە بۆ مازندەران ماشێن بگرێ، بە هەڵە چوە شمیران و ئاژان لەوێ بە ماشێنێکی دیکە گەڕاندیەوە و دیسان لە دەم دەروازەی شمیران بۆ مازندەران ماشێنی گرت.

×××

لە **شاهی** ماشێن وەستا، وڵات کەم کەم تاریک دەبوو. خانووبەرە تازەسازەکان، هاتوچۆی خەڵکی رەش ئەسمەر، خەڵکێک کە قەبای شین، گیوە و پاتۆڵی شینیان دە بەر کردبوو، راست وەک بەبوو دەچوون. دوو مسافر لەوێ دابەزین و هەندێک جێگا کراوە. دیسان ماشێن وەڕێ کەوتەوە. هەوا شێدار، گیراو و تاریک ببوو. زێڕن هەستی بە سوکنایی و خۆشییەکی رازداری دە خۆی دا دەکرد، وەک خۆشی کەسێک کە بێ پارە، بێ هیوا و بێ داهاتوو لە شارێکی غەریب پێی بە دوای خۆی دا دەکێشێ.





لەشی شەکەت، لێوی تینوو بوو و کەمێک هەستی بە برسیایەتی دەکرد. بەڵام جوڵە و ترەی یەکجۆری ماشێن، هەوای تاریک، ئەو خەڵکەی کە لە دەورەی دەخولانەوە، دەنگی هەناسەی یەکجۆری کوڕەکەی بە تایبەت ماندوویەتی ناچاری کرد کە وەنەوز بدا. کاتێک وە ئاگا هاتەوە لە شاری ساری بوو. پرێسکەکەی هەڵگرت، منداڵەی دە باوەش کرد و لە ماشێن دابەزی. تاریکی و بێدەنگی شاری داگرتبوو دەتکوت ماڵەکان، درەختەکان و شیناوەرد بە دووکەڵ یان بە قورمی رەش و نەرم و کاتیی ساز کرابوون. دەنگی ناڵەی مەلێک لە دوورەوە نێوەنێوە بێدەنگی دەبڕی، ناڵەیەکی گلەداری دوورەدەست بوو. چراکان لە دوورەوە دەترووسکانەوە، لە هەیوانی باڵەخانەیەک کچێک بە چارشێوی سپی وەستابوو. بەڵام زێڕن هیچ چاوی لە دەوروبەری خۆی نەدەکرد و دەنگێکی دیکە جگە لە دەنگی بەبووی نەدەبیست و شتێکی دیکە جگە لە سیمای بەبووی لە بەر چاو نەبوو. لە دەم بەقاڵی دوو کەس دانیشتبوون لەوان سوراغی زێڕن ئاوای گرت. یەکێک لەوان کوتی کە لە سەر رێی سارییە. قاپە ئاوێک لەوێ بوو هەڵیگرت و خواردیەوە. بێ شوێن و بێ ویست هەندێک دوور رۆیشت چونکە هیچ کوێ و هیچکەسی نەدەناسی. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە چونکە دڵنیا بوو کە نزیکتر لە بەبوویە دڵەکوتەکەی نەمابوو و ئێرەی پێ خۆمانە و میوانگر دەهاتە بەر چاو. لە ئاکام لە سووچی چارشێوەکەی قڕانێکی دەرهێنا و، نانی تازەی دەگەڵ سەوزی و شیرەی کڕی و چوە بەر دەرگای ماڵێک لە بن چراکەی دانیشت، پریسکەی بەستراوی کردەوە، شێوەکەی خوارد و بەشی کوڕەکەشی دا. دوایە هەستا چوو ژێر تاقێک بۆی خەوت. بەیانی زوو کە هەستا، چوە مەیدانی شار و دوای سەعاتێک چەنە لێدان وڵاغێکی بە چوار قڕان و دە شایی بڕیوە هەتا ئەو بگەیەنێتە زێڕن ئاوا. سوار بوو. هەوا هەورێکی لاساری دڵپڕ بوو و هەڕەشەیەکی شاراوە و بێدەنگی دەکرد، وەها کە دڵی دەگیرا. مێشوولە بە نێوچەوانی کوڕەکەیەوە دابوو و بای کردبوو. ماوەیەکی زۆر لە سەر وڵاغ هەڵبەزیوە، بە نێوان شیناوەرد دا بە ژێر هەتاو و باران، بە نێو زەلکاو دا تێپەڕی.





دیمەنی دەوروبەر لە رادەبەدەر جوان، کێوەکانی شین، دەشتی سەرسەوز، هەورە سپی و بۆرەکان وەک بن زگی مراوی بوون و پەیتاپەیتا دەگۆڕان. کە گەیشتنە ئاسیاسەر دیسان باران دایداوە، ڕێژنەیەکی توند بوو. چارشێوی سەری تەڕ بوو، پەنایان بردە بن درەختێک، بۆنی نیشاستە و بۆ هەڕنەهووت و بۆدڕنی گرتبوو. دیسان وەڕێ کەوتنەوە. زێڕن ماندەعەلی بە خۆیەوە نابوو و زەق بەر پێی ولاغی چاو لێدەکرد. دڵی دەیکوتا و هەمووی هەر بیری لە یەکەمین چاوپێکەوتنێک دەکردەوە کە دەگەڵ بەبوو دەیبێ. هەتا ئەوەکە نزیک نیوەڕۆ گەیشتنە زێڕن ئاوا. کاتێک زێڕن لە مەیدانێک دابەزی و ویستی لە سووچی چارشێوەکەی پارەی دەربێنێ، چاوی لێکرد دیتی سووچی چارشێوەکەی کراوەتەوە و پارەی تێدا نیە. ئایا کەسێک دزیبووی؟ نا، کەس نەیدەتوانی پووڵ لە سووچی چارشێوەکەی بدزێ و ئەو نەزانێ. ئایا لە بیری کردبوو و یا لەبەر گێژیی و هۆش لە سەر خۆ نەمانی ئەو بوو؟ هەمووئەوانە بۆیان هەبوو بەڵام چەلێ دەردێکی دەرمان نەدەکرد. دوای هات و هەرای کەردار کە راوێژی تورکی هەبوو پرێسکەی دەستی وەرگرت و سواری ولاغەکەی بوو و هەچەی کرد و رۆیشت. بەڵام دیسان چ قەیدی هەبوو. ئایا زێڕن بە مەبەستی نەگەیشتبوو، ئایا لە نزیکی بەبوو و لە دێیەکەی وی نەبوو؟ ئێستا دەڕوا و ماڵە بەبووی دەدۆزێتەوە، باسی سەفەری خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و کارەکەی یەکسەرە دەبێ. هەزاران تمەن لەو پووڵانە فیدای تاڵە موویەکی بەبوو! دەوروبەری خۆی چاو لێکرد، ئەم دێ چووکە دێمەنێکی چەپۆک پێدادراو و نزمی هەبوو و لە ئاخری دۆڵێک هەڵکەوتبوو. دوروبەرەکەی بە مووچە و مەزرا گیرابوو و وا دەهاتە بەرچاو کە دێ و خەڵکەکەی هەموو دە خەو دان. سەگێکی ران لە دوورەوە دەوەڕی و دەنگی پیاوێک دەهات کە دەیکوت: « بەبوو... بەبوو هۆی ... » لەم ناوە دڵی زێڕن داخورپا، بەڵام دیتی کە پیاوێک کە بۆ لای دەنگ دەچێ بەبووی ئەو نیە. لە بن دیوار دوو قاز وەنەوزیان دەدا و مریشکێک زۆر بە وردی بە پێیەکانی خاکی دەداوە و بڵاوی دەکردەوە و چینەی دەکرد. لە سەر زبڵەکان





ســەتڵــێکی شکاو و کــوتـە پارچـەیەکی کــەسکی دڕاو و توێکڵـی هارۆ کەوتبـوو. کەمێک دوورتر دوو مریشک هەڵکورمـابوون و هەر کام پێیـەکیان دە ژێر باڵیـان نابوو. جـریوەجـریوێکی ســەبر کــە لە گــەرووی چۆلەکــە تازەپێگەیشـتووکان دەهاتە دەرێ حاڵەتێکی خـۆمانە و تەڕ و تازەیی دابوو بە وێ. لە مـەیدان سێ منداڵی لادێیـی بە زاری ئاوەڵە چاویان دەو بڕیبـوو. پیرەمـێردێک لە پەنا دوکانی عـەتتاریی لە سـەر کاریتـەکان دانیشـتبـوو و پۆلێک مـراوی کـێـویی بە قـاڕەقـاڕ وەک خـەتێکی زنجیـر بە ئـاسمـان دا دەفڕین. زێڕن چوە لای پیرەمێرد و کوتی:

ـ ماڵە **بابافەرروخ** لە کوێیە؟

ئەو بە دەستی ماڵێکی هەندێک بەرز کە لە دوورەوە دیار بوو نیشان دا و کوتی:

ـ هۆو ماڵە چاو لێکە، هەیوانێکی هەیە، ئەوێیە.

زێڕن منداڵەکەی دە باوەش کرد و بە دونیـایەک هیواوە بۆ لای ئەو ماڵە ڕۆیشت. هەر گەیشـتـە بەر مـاڵەکە لە دەرگای دا و ژنێکی گەڕاوەی گرۆ هاتە بەر دەرگا:

ـ کارت بە کێیە؟

ـ بەبووم دەوێ.

ـ چ کارت پێیەتی؟

ـ من ژنی بەبووم لە تارانەوە هاتووم، ئەوەش ماندگارعەلی کوڕیەتی.

ـ باشـە، باشـە، بەبوو ئەو ژنـەی بەرداوە، ئەوی تەلاق داوە، لەخـۆتەوە قسان دەکەی.

لە دوایی رووی دە حەسار کرد و هاواری کرد:

ـ بەبوو هۆی .... بەبوو هۆی...

قـەڵافەتی دانەتاشـراوی بەبوو بە کراسی سینگ ئاوەڵەوە، پشت چاوی





هەڵمساو و خەواڵوو لە بەر دەرگا پەیدای بوو کە چنگێک تووک لە ملی دەرپەڕیبوو و ژنێکی زەردڵەی لاوازیش بە چاوی دریشت هاتە پەنای و خۆی بە بەببوووە نا. داغی شەلاق لە سەر باسک و نێوچەوانی دەدیترا، دەلەرزی و باسکی بەبووی گرتبوو دەتکوت دەترسا مێردەکەی لە چنگی دەرکێشن. هەر کە زێڕن بەبووی دیت هاواری کرد:

ـ بەبوو گیان، بەبوو... من هاتم.

بەڵام بەبوو راست چاوی تێبڕی و کوتی:

ـ بڕۆ، بڕۆ من تۆ ناناسم.

پیرێژنەکە خۆی دە نێوانیان کوتا و کوتی:

ـ چت لە گیانی کوڕەکەی من دەوێ؟ ژنەتیوە بێحەیایە شەرم ناکەی، ئەو منداڵەی تۆ بیژوویە و ئێستا دەتەوێ بە سەر کوڕەکەی منی دابڕی؟

بەبوو کوتی:

ـ هۆشت لە خۆت نیە بە هەڵە هاتووی.

زێڕن واقی وڕ مابوو. بەڵام ئەم وەخۆ نەگرتنەی بەببوی پێشبینی نەکردبوو. لەم کردەوەی ئەوان هەستی بێزاری تێدا پێکهێنا کە هەموو چاکەکانی بەبووی لە بیر کرد و دەنگێکی گاڵتەجاڕانەوە کوتی:

ـ کەوایە منداڵەکەت بگرە و گەورەی کە، من هیچ خەرجییم نیە.

دایکی بەبوو کوتی:

ـ ئەو منداڵە بیژوویە، ئەمن چووزانم لە کوێ را هێناوتە.

زێڕن تێگەیشت کە مەیدانی پێ چۆل کراوە، چاوی لە سیمای بەبوو بڕی بەڵام روخساری ئەو تووڕە و چاوەکانی وەها دڕ بوو کە قەت وای نەدیتبوو، حاڵەتێک بوو کە نیشانی دەدا کە ژیانێکی بە ئیرووی هەیە و بۆتە ئەرباب و بە ئاواتی خۆی گەیشتوە. نایەوێ لە خۆی تێک دا و لە بە سووک چاو لێکردنی دیار بوو کە نایەوێ ئەو ببینێ. زێڕن تێگەیشت کە





پێ داگـرتنـی زۆر کـەلکی نیـە و بە حـەسـرەتـەوە چاوی لە جێ شـوێنی قـەمچی سـەر لەشـی ژنـی جحێڵ کرد کە خۆی بە بـەبووە نابوو لە دوایی لەپڕ بـەبێ مـەیل گـەڕاوە. لە حـاڵێک دا کـە **کاس ئاغا** دایکی بەبوو وەک دایکی خـۆی دەسـتـی لاوازی رادەوەشاند و بـە زمانێک کە تێینەدەگەیشت جنێـوی پێـدەدا و تـووکی لێـدەکـرد. زێڕن بە هەنگاوی شل ئارام بەرەو مـەیدان گـەڕاوە. بـەڵام لە رێ دا بیـرێکی بە مـێشکـی داهات، راوەسـتـا و منداڵەکەی کە وەنەوزی دەدا لە بەر دەرگای ماڵێکی دانا و پێی کوت:

ـ رۆڵە گیان لێرە دانیشە، من دێمەوە.

منداڵ ئارام و گوێڕایەڵ وەک بووکی لۆکەیی لەوێ دانیشت. بەڵام زێڕن بە تەما نەبوو کە بگەڕێتەوە و تەنانەت منداڵەکەی ماچیش نەکرد. چونکە ئەو منداڵەی بە کەلک نەدەهات، تەنیا سەربارێک و نانخۆرێکی زێدە بوو و ئێستا لـە کۆڵ خـۆی کردەوە، هەر ئەوجۆرەی کە بەبوو ئەوی وەلا نابوو و دایکی خۆی ئەوی دەرکردبوو، هەر ئەوجۆرەی کە خۆشەویستی دایکانە لە دایکی فێـر بوو، نا، ئەو پێویسـتـییـەکی بە منداڵەکەی نەبـوو، دەسـتـی بە تـەواوەتـی بەتـاڵ بـوو، بـێ یـەک شـــایـی پووڵ، بـێ مـنداڵ، بێ بار و بـنـە، هەناسـەیەکی راحـەتی هەڵکێشـا. ئێـسـتـا ئەو ئازاد بوو و چارەی خـۆی دەزانی. کە گەیشـتـە مـەیدان چاوی لە دەوروبەری خـۆی کـرد. پیرەمێـرد هێشـتا لە سـەر کاریتـەکانی بـەر دوکانی عـەتتاری دانیشـتبـوو، وەنەوزی دەدا. دەتکوت تـەواوی ژیانی لە سـەر ئەو کـاریـتـانـە تێـپـەڕ کـردوە و هـەر لەوێ پیـر بوە. ئەو سێ مـنداڵ لادێییـە نزیک دوکـان خـەریکی خـۆ دە خـۆڵ وەردان بوون. هەموو بەبێ سەرنج دان خەریکی کاری خۆیان و کات تێپەڕ کـردن بوون و کـەڵەبابێکی لاریی گـەورە کـە ئەو نەیدیتـبـوو بە دەنگێکی دوورەگـە دەیخـوێند. کـەس نەگـەڕاوە چاوێک لەو بکا. دەتکوت ژیـان هیچ گرینگایەتییـەک ناداتە پێشـهاتەکانی ژیانی ئەو. ئاخـۆ چی بە سـەر دێ؟ بێهۆ و بێ هیچ خەتـایەک دەیەویست هەڵبێ لانی کەم لە دەست منداڵەکەی را بکا. ئێـستـا گشت باری ئەرکـەکان لە سـەر شـانی هەڵگیـرابوو. هەوا گـەرم، شێـدار و خـەفـە بوو و هـالاوێکی گـەرمـا وەک هووی زاری کـەسی





یاودار لە هەوا دا بڵاو ببۆوە. بێ ئامانج، بێ نەقشە زێڕن بە هەنگاوی خێرا بە بەر ماڵەکان و کۆڵانەکان دا تێپەڕی. هەر کە گەیشتە مووچە و شیناوەردەکان شارێیەکی کە لە بەرابەری بوو گرتیە بەر. بەڵام هەر لەو کاتە دا پیاوێکی گەنج کە قەمچی بە دەست، بە هێز، سوور و سپی لە سەر وڵاغ بوو و وڵاغێکیش لە پێشەوەی غاری دەدا و زەنگوڵەکانی ملیان زەنگەزەنگیان دەهات. هەر کە نزیک بۆوە زێڕن پێیکوت:

ـ کاکە خێرت دەگاتێ.

پیاو وڵاغەکەی راگرت و کەتی:

ـ چت دەوێ؟

ـ من غەریبەم، کەسم نیە، منیش سوار کە.

بە دەستی وڵاغەکەی نیشان دا. پیاو وڵاغەکەی راگرت. دابەزی و زێڕنی سوار کرد. خۆشی بازی دایە سەر وڵاغەکەی دیکە، بەڵام هەر نەگەڕاوە کە چاو لە روخساری بکا. دوایی قەمچی لە سەر سەری هەڵسووڕاند و لە کەفەڵی وڵاغی راکێشا. بە پەنا جۆیەکان دا کە تێدەپەڕین لاوەکە دەستی دایە و لاسکی جۆیەکی لێکردوە و دە زاری نا و بە فیتوو ئاهەنگێکی تایبەتی کە بە گوێی زێڕن ئاشنا بوو، لێیدا. ئەوە هەر ئەو ئاهەنگە بوو کە بەبوو لە کاتی ترێ هەڵگرتنەوە دەیکوت، هەر ئەو رۆژەی کە لە رەز تووشی بوو:

« کیژی لەبار ئەهای لەلە

بچینە شار، ئەهای لەلە

یەکمان لە ماڵ، یەکمان لە کار

بێ بچینە شار ئەهای لەلە

بێ بچین کە تۆم دەوێ! »

زێڕن تەواوی ژیان، جوانیی، تووکی دایکی، دوایە ئەو مانگەشەوەی کە





دەگەڵ بەبووی هاتە تاران، تووکی دایکی بەبووی بە بەر چاو دا تێپەڕی. سەرەڕای ئەوە کە تینوو و برسی بوو، بەڵام دە دڵی دا خۆشحاڵ بوو. نەیدەزانی کە بۆ سوار بوە و بۆ کوێ دەچێ، بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەمانە دە دڵی خۆی دا بیری کردەوە: « بەشکەم ئەم لاوەش عادەتی بە قەمچی لێدان هەبێ و لەشی بۆنی وڵاغ و سەرانگوێلکی لێبێ! »

## ١٦٣ ـ ژنێک کە مێردەکەی ون کرد



هاوینەپشوو دەستی پێکردبوو. لە دالانی فێرگەی **لوهافر** خوێندکارانی شەوانەرۆژیی چەمەدان بە دەست، بە فیتوو لێدان و شادیی کردن لە فێرگە دەچوونە دەر. تەنیا مێرداد کڵاوەکەی بە دەستەوە گرتبوو وەک تاجرێک کە پاپۆڕەکەی نوقم بووبێ مات و غەمبار لە سەر چەمەدانەکەی وەستابوو. جێگری فێرگە بە سەری کەچەڵ و زگی زلییەوە لێی هاتە پێش و کوتی:

ـ ئێوەش دەڕۆن؟

مێرداد سوور هەڵگەڕا و سەری داخست، جێگر دیسان کوتی:

ـ ئێمە زۆر بە داخەوەین کە ساڵێکیتر ئێوە لە فێرگەی ئێمە نابن. بە راستی لە باری ئاکار و کردار ئێوە وێنەیەک بۆ خوێندکارانی ئێمە بوون، بەلام لە من ئەو پەندە ببیسە، کەمتر شەرم بکەن، هەندێک رووتان هەبێ، بۆ لاوێکی وەک تۆ شوورەییە. لە ژیان دا دەبێ رووت هەبێ!

مێرداد لە جیات ولام کوتی:

ـ منیش بە داخەوەم کە فێرگەی ئێوە جێ دەهێڵم!





جێگر پێکەنی، دەستی لە سەر شانی کوتا، ماڵاوایی کرد، دەستی ڕێک کوشی و دوور بۆوە. خزمەتکاری فێرگە چەمەدانی مێردادی هەڵگرت و هەتا ئاخری شەقامی **ئاناتۆل فرانسی** برد و لە تاکسی نا. مێردادیش دەستخۆشانەی دایە و ماڵاواییان لێک خواست.

نۆ مانگ بوو کە مێرداد لە فێرگەی **لوهاڤر** خەریکی بە هێز کردنی زمانی فەرانسەیی بوو. ڕۆژێک کە لە پاریس لە ئاواڵەکانی جیا بۆوە وەک مەڕێک کە بە زۆر لە ران جیای بکەنەوە، دەستەمۆ و تەیار بۆ لای **لوهاڤر**یان نارد. ئاکار و کرداری ئەو لە فێرگە لە لایەن سەرۆک و جێگر ڕێزی لێدەندرا. گوێبیست، داماو و بێدەنگ، لە کار و دەرس دا بە زیپک و زاکوون و بە پێی یاسای فێرگە دەجووڵاوە. بەڵام هەمیشە داماو و غەمین بوو. جگە لە بەڕێوە بردنی دەرس و هەوڵ دان چی دیکەی نەدەزانی. دەتکوت هاتۆتە سەر دنیا بۆ دەرس خوێندن و بیری لە چوارچێوەی دەرس و کتێبەکانی فێرگە پتر نەدەڕۆیشت. قەڵافەتی ئەو ئاسایی، ڕەنگ زەرد، باڵابەرز، کز، چاوی خڕی بێ حاڵەت، مژۆڵی ڕەش، کەپۆی چووک و ردێنێکی کۆسەیی هەبوو کە سێ ڕۆژ جارێک دەیتاشی. ژیانی ڕێکوپێک و چاپیی فێرگە، خۆراکی چاپیی، دەرسی چاپیی، خووی چاپیی و هەستانی چاپیی رووحیان چاپیی بارهێنابوو. تەنیا هەندێک جار مێرداد لە نێوان دیوارە بەرز و دووکەڵاویەکانی فێرگە و خوێندکارانێک کە بیری دەگەڵیان یەکی نەدەگرتەوە، زمانێک کە باشی تێنەدەگەیشت، خوو و خدەیەک کە ئاشنایەتی دەگەڵ نەبوو، خواردەمەنی جۆری دیکە، هەستی بە تەنیایی و بێبەشیی دەکرد، وەک هەستێک کە بەندییەک بیکا. ڕۆژانی یەکشەمبەش کە چەند سەعات ئیزنی وەردەگرت دەچوە گەڕان چونکە خۆشی لە شانۆ و سینەما نەدەهات. لە پارکی بەر شارەداری ماوەیەکی دوورودرێژ لە سەر نیمکەت دادەنیشت. دەیڕوانییە ئەو کیژ و خەڵکەی کە هاتوچۆیان دەکرد، ئەو ژنانەی کە شتیان دەچنی و چاوی لە چۆلەکە و کۆتر دەکرد کە بە ئازادیی دەخولانەوە. جارجارەش بە لاسایی خەڵک کوتە نانێکی دەگەڵ خۆی دەبرد، وردی دەکرد و بۆ چۆلەکەکانی داویشت و یا ئەوەکە دەچوە





قەراغ دەریا لە سەر تەپۆڵکەیەک کە دەیڕوانیە فانوسە دەریاییەکان، دادەنیشت، چاوی لە شەپۆلی ئاو و دوورنوای شار دەکرد - چونکە بیستبووی **لامارتین**یش لە پەنا دەریاچەی **بورژە** هەر وای کردوە. ئەگەر هەوا ناخۆش با لە کافەیەک دەرسەکانی خۆی لە بەر دەکرد و لە بەر ئەوە کە گۆشتتاڵ بوو، ئاواڵ و هاودەمی نەبوو و ئێرانیی دیکەشی نەدەناسی کە هاتوچۆی بکا.

مێرداد لەو کوڕە چاو و گوێ بەستراوانە بوو کە لە ئێران لە نێو بنەماڵەکەی دا ببوو بە مەتەڵ و ئێستاش ئەگەر ناوی ژنی بیستبا هەتا بناگوێچکەی سوور هەڵدەگەڕا. خوێندکارانی فەرانسەیی گاڵتەیان پێدەکرد و کاتێک باسی ژن، سەما، رابواردن، وەرزش و ئەوینداریی خۆیان دەکرد، مێرداد هەمیشە بۆ ڕێز لێنان قسەکانی ئەوانی دەسەلماند بێ ئەوەی کە بتوانێ لە ڕووداوەکانی ژیانی خۆی قسەیەک لە بەسەرهاتی ئەویندارانەی ئەوان زیاد بکا. چونکە ئەو ناسک و نازدار، ترسەنۆک، غەمبار و داماو بار هاتبوو، هەتا ئێستا دەگەڵ ژنی نامەحرەم قسەی نەکردبوو و دایک و باوکی هەتا توانیبوویان مێشکیان لە پەند و قسەی هەزار ساڵ لەمەوبەر ئاخنیبوو. دوایەش بۆ ئەوەی کوڕەکەیان بە ڕێی خراپە دا نەڕوا، **درەخشەندە**ی ئامۆزایان کردبوە دەزگیرانی و شیرنیشیان خواردبوو و ئەمەیان بە دوایین پلەی لەخۆبوردوویی و بە منەتێکی گەورە لە سەر کوڕەکەیان دادەنا و بە قەولی خۆیان کوڕێکی پارێزەر و چاو و دڵ پاک و کۆتەڵێکی ئەخلاقیان پەروەردە کردبوو کە بە کەلکی دوو هەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەهات. مێرداد بیست و چوار ساڵی بوو بەڵام هێشتا بە قەرا منداڵێکی چاردە ساڵەی هەندەرانی ڕوو، ئەزموون، تەربیەت، زیرەکیی و بوێریی لە ژیان دا نەبوو. هەمیشە غەمبار و داماو بوو وەک ئەوە کە چاوەڕوان بوو ڕەوزەخوێنێک وەسەر مەنبەر کەوێ و ئەو بگری. تەنیا بیرەوەری ئەویندارانەی ئەو هی ئەو ڕۆژەی بوو کە لە تاران وەدەردەکەوت و **درەخشەندە** بە چاوی پڕ لە گریانەوە بۆ بەڕێ کردنی ئەو هاتبوو. بەڵام مێرداد وشەیەکی بۆ دڵدانەوەی نەدیتەوە. یانی





شەرم نەیهێشت ـ هەر چەند ئەو دەگەڵ کچەمامەکەی لە ماڵێک دا گەورە ببوون و بە منداڵی دەگەڵ یەک کایەیان کردبوو، هەتا ئەو دەم کە کەشتی **کراسیەن** لە بەندەری **پەهلەوی** جوێ بۆوە، ئاوی دەریای برِی و بەستێنی سەوز و شێداری ئێران، ئارام لە پشت مژ و تاریکی دا ون بوو هێشتا بە یادی درەخشەندە بوو، چەند مانگی ئەوەڵیش لە هەندەران جارجارە ئەوی وە بیر دەهاتەوە بەڵام وردەوردە درەخشەندەی لە بیر کرد.

لە ماوەی خوێندنی دا مێرداد چەند تەعتیلی هەبوو، بەڵام تەواوی ئەو پشوودانە لە فێرگە ماوە و خەریکی خوێندنی دەرسەکانی بوو و هەمیشە بەڵێنی بە خۆی دەدا کە سێ مانگی هاوینەپشوو تۆڵەی بکاتەوە. ئێستا کە بە رەزایەتییەکی دوورو درێژ لە فێرگە هاتە دەرێ و لە شەقامی **ئاناتۆل فرانس** دوایین نیگای لە تارمایی دووکەڵاویی فێرگە کرد و لە لای خۆی ماڵاوایی لێکرد، یەکسەرە چوە پانسیۆنێک کە پێشتر دیبووی. دیوێکی گرت و هەر ئەوشەوە لە بەر ئەوە کە هێندەی بەسەرهاتی ئەویندارانە و کەیفەکانی هاوکلاسیەکانی لە **گراند تاڤێرن**، کازینۆ، **دانسینگ رۆیال** و شوێنەکانی دیکە بیستبوو، هەر ئەو شەوە حەوتسەد فرانک پاشەکەوتی خۆی دەگەڵ هەزار و هەشت سەد فرانک مانگانەی لە کیفی باغەڵی نا و تەمای گرت بۆ یەکەم جار بچێتە کازینۆ. سەری شەو ردێنی تاشی، شێوی کرد و بەر لەوەی بچێتە کازینۆ، چونکە هێشتا زوو بوو بۆ پیاسە بۆ لای کۆڵانی پاریس چوو کە کۆڵانی پڕ لە حەشیمەت و قەرەباڵغی **لوهاڤر** بوو و دەگەیشتە بەندەر. مێرداد بە شێنەیی دەڕۆیشت و بۆ خۆ خافڵاندن دەیڕوانیە دەورووبەری، سەرنجی دەدا پشت شووشەی دوکانەکان ـ ئەو پارەی پێبوو، ئازاد بوو، سێ مانگ وەختی هەبوو و ئەم شەویش دەیەویست لەو ئازادییەی خۆی کەلک وەرگرێ و بچێتە کازینۆ. ئەو بینا جوانەی کە ئەوەندە بە لای دا تێپەڕیبوو بەڵام هیچکات نەیوێرابوو بچێتە ژوورەکەی، ئێستا ئەمشەو دەچێتە وێ و لەوانەیە، کێ دەزانی چەند کیژیش گیرۆدەی چاو و برۆی رەشی ئەو بن! هەروا کە بە پیاسە دەڕۆیشت، لە پشت شووشەی دووکانێکی گەورە راوستا و چاوی





لێکرد. چاوی بە پەیکەرەی ژنێک، بە پرچی کاڵ کە سەری لار کردبۆوە و بزەی دەهاتێ کەوت. برژانگی درێژ، چاوی درشت، ملی سپی بوو و دەستێکی لە کەمەر دابوو. جلی کەسکی ئەو لە ژێر شۆقی کەوی رەنگی لامپ ئەو پەیکەرەی بە لەونێکی غەریب پێ نواند. وەها کە بێ ویستی خۆی راوەستا، ویشک هەلات و مات و حەیران چوە نێو بەحریەوە. ئەمە پەیکەرە نەبوو، ژنێک، نا باشتر لە ژنێک، فریشتەیەک بوو کە پێی پێدەکەنی. ئەو چاوە شینانە، بزەی نەجیبی دڵبەرانە، بزەیەک کە بە مێشکیشی دا نەدەهات، ئەندامی شووش و باریک و رێکوپێک، هەمووی ئەوانە پتر لە رادەی چاوەڕوانیی ئەو لە وێنە و سەرچاوەی ئەوین و بیر و جوانی بوو. هەروەتر ئەم کچە قسەی دەگەڵ نەدەکرد، ناچار نەبوو بە درۆ و دەلەسە ئەوین و هۆگریی خۆی بۆ دەربڕێ، ناچار نەبوو وە دوای کەوێ، دڵپیسی لێبکا، هەمیشە بێدەنگ، هەمیشە بە شێوەیەکی جوان، ئەوپەڕی بیر و ئاواتی وی نیشان دەدا. نە خۆراکی دەویست و نە پۆشاک، نە بیانووی دەگرت و نە نەخۆش دەکەوت و نە خەرجی هەبوو. هەمیشە رازی، هەمیشە دەم بە بزە، بەڵام لە هەمووی ئەوانە گرینگتر ئەمە بوو کە قسەی نەدەکرد، رای خۆی دەرنەدەبڕی و ترسی نەبوو کە ئەخلاقیان یەک نەگرێتەوە. سیمایەک کە قەت چینی تێنەدەکەوت، نەدەگۆڕدرا، زگی پڕ نەدەبوو، تێکنەدەچوو. ئەوجار ساردیش بوو. هەموو ئەو بیرانە بە مێشکی دا تێپەڕین. ئاخۆ دەیتوانی، ئایا لەوانە بوو وەچنگی خا، بۆنی پێوە بکا، بیلێسێتەوە، عەترێک کە پێیخۆش بوو لێیبدا و ئیتر لەم ژنە شەرمیشی نەدەکرد. چونکە هیچکات لێی لە هەڵلا نەدەدا و لە ئاستی شەرم و حەیاشی نەدەبوو و ئەو هەمیشە هەر مێردادی پارێزەر و چاو و دڵ پاک دەماوە. بەڵام ئەم پەیکەرە لە کوێ دابنێ؟

نا، هیچکام لەو ژنانەی کە هەتا ئێستا دیتبوونی نەدەگەیشتنەوە سەر ئەم پەیکەرەیە. بڵێی گەیشتبانەوە؟ بزە و حاڵەتی چاوی بە چەشنێکی غەریب ئەم پەیکەرەیەی بە رووحێکی نائاسایی لە بەر چاوی ئەو گیاندار کردبوو. هەموو خەتەکان، رەنگەکان و رێکییەک کە ئەو بۆ جوانی





دەیتوانی دایبنێ ئەم پەیکەرە بە باشترین شێوە بۆی پێکدێنا و شتێک کە ببوو بە هۆی سەرسوڕمانی ئەوە بوو کە سیمای ئەو بە گشتی وێچوونێکی لە هەندێک حاڵەتەکانی تایبەتی سیمای درەخشەندەی هەبوو، تەنیا چاوەکانی ئەو رەش بوو و هی پەیکەرە کاڵ، بەڵام درەخشەندە هەمیشە ژاکاو و غەمبار بوو، لە حاڵێک دا بزەی ئەم پەیکەرەیە شادیهێنەر بوو و هەزار چەشنە هەستی لە مێرداد دا پێکدێنا.

کوتە مقەبایەک کە لە ژێر پێی پەیکەرەیان دانابوو، لە سەری نووسرابوو ۳۵۰ فرانک. یانی لەوانە بوو ئەم پەیکەرەیەی بە سێ سەد و پەنجا فرانک بدەنێ؟ ئەو حازر بوو هەرچی هەیەتی بیدا، جلەکانیشی بدا بە خاوەن دوکان و ئەم پەیکەرەیە هی ئەو بێ، ماوەیەک زەق تێیڕوانی، لە پڕ ئەو بیرەی بە مێشکی داهات کە لەوانەیە گاڵتەی پێبکەن. بەڵام نەیتوانی دڵی لەو تەماشایە بکاتەوە، بە دەست خۆی نەبوو، بە تەواوی لە چوون بۆ کازینۆ چاوپۆشی کردبوو و پێیوابوو کە بێ ئەم پەیکەرەیە ژیانی بێ کەلک دەبێ و تەنیا ئەم پەیکەرەیە ئاکامی ژیانی ئەو پێکدێنێ. ئەگەر ئەم پەیکەرەیە هی ئەو با، ئەگەر توانیبای چاوی لێبکا! لە نەکاو دیتی کە لە پشت شووشە تەنیا جلی ژنانە داندراوە و راوەستانی ئەو لەوێ زۆر بەجێ نەبوو و لە لای خۆی پێیوابوو هەموو خەڵک سەرنجی دەدەنێ، بەڵام نەیدەوێرا کە بچێتە دوکانەکە و سەوداکە ببڕێتەوە. ئەگەر لوابا کەسێک بە نەهێنی هاتبا و ئەو پەیکەرەیەی پێفرۆشتبا و پارەکەی لێستاندبا هەتا ناچار نەبا لە بەر چاوی خەڵک ئەم کارەی کردبا، ئەودەم دەستەکانی ئەو کەسەی ماچ دەکرد و هەتا زیندوو با خۆی بە منەتباری ئەو دەزانی. لە پشت شووشە خورد بۆوە، لە دوکان دا دوو ژن پێکەوە قسەیان دەکرد و یەکێک لەوان بە دەست ئەوی نیشان دەدا. تەواوی رووی وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕا، سەر دوکانی چاو لێکرد دیتی نووسراوە: « دوکانی **سێگران** ژمارە ۱۰۲ » بە سەبرا کشاوە و چەند هەنگاو دوور کەوتەوە.

لە خۆوە وەڕێ کەوت، دڵی دەیکوتا، بەر خۆی چاک نەدەدیت. پەیکەرە بە بزەی سێحراویی لە بەر چاوی لانەدەچوو و دەترسا نەکا کەسێک دەست





ڕەپێش خا و بیکڕێ. پێی سەیر بوو بۆچی خەڵکی دیکە ئەوەندە بێخەیاڵ چاو لەم پەیکەرەیە دەکەن. لەوانەیە لە بەر ئەمە بوە کە ئەو فریو بدەن، چونکە بۆ خۆی دەیزانی کە ئەمە مەیلێکی ئاسایی نیە!

وە بیری کەوتەوە کە سەراسەری ژیانی ئەو لە سێبەر و تاریکایی دا گوزەرابوو، درەخشەندەی دەسگیرانی خۆش نەدەویست. تەنیا لە ناچاری، لە شەرمی دایکی هۆگریی خۆی پێ نیشان دەدا. دەگەڵ ژنەکانی هەندەرانیش دەیزانی کە بە سانایی ناتوانێ پەیوەندی بگرێ، چونکە لە سەما، قسە، میوانی، هەلات هەلاتێن، جلی شیک دە بەر کردن، کلکەسووتە و هەموو ئەو کارانەی کە بۆ ئەمە پێویستی پێی هەبوو لێی هەڵدەهات، جگە لەوە شەرم نەیدەهێشت و ئەو تواناییەشی لە خۆی دا نەدەدیت. بەڵام ئەم پەیکەرەیە وەک چرایەک بوو کە سەراسەری ژیانی ئەوی ڕووناک دەکرد ـ وەک ئەو چرایەی نزیک دەریا کە ئەوەندە لە پەنای دانیشتبوو و شەوانە شوقێکی کەوانی دەخستە سەر ئاوی دەریا. ئایا ئەو هێندە ساویلکە بوو، ئایا نەیدەزانی کە ئەم مەیلە دژی مەیلی گشتییە و گاڵتەی پێدەکەن؟ ئایا نەیدەزانی کە ئەم پەیکەرەیە لە هەندێک مقەوا و چینی و ڕەنگ و مووی دەسکرد ساز بوە وەک بووکۆڵەیەک کە دەیدەنە دەست منداڵ. نە دەتوانێ قسان بکا، نە لەشی گەرمە و نە سیمای دەگۆڕدرێ؟ بەڵام هەر ئەم تایبەتیانە بوون کە مێردادیان گیرۆدەی ئەم پەیکەرەیە کردبوو. ئەو لە کەسێکی زیندوو کە قسە بکا، کە لەشی گەرم بێ، کە هاوڕێ یا دژی مەیلی بجووڵێتەوە، کە ئێرەیی ببزوێنێ، دەترسا و خۆفی لێهەبوو. نا، ئەم پەیکەرەیەی بۆ ژیانی پێویست بوو و نەیدەتوانی لەمە بە دوا بێ ئەو کار بکا و درێژە بە ژیانی بدا. ئاخۆ دەکرا هەمووی ئەوانە بە سێ سەد و پەنجا فرانک وەچنگ خا؟

مێرداد بە نێو خەڵکی بە پەلە کە لە هاتوچۆ دا بوون بە بیرێکی ئاڵۆز تێدەپەڕی، بێ ئەوەکە کەسێک ببینێ یا سەرنجی بداتە شتێک. وەک کەسێکی مقەوایی، وەک پەیکەرە بێڕووح و بێویست دەڕۆیشت، وەک کەسێک کە شەیتان ڕووحی داگیر کردبێ. هەروا کە دەڕۆیشت ژنێکی





دیت کە چارشێوشانێکی کەسکی بە شان دادابوو و سوراوسپیاوێکی خەستی کردبوو، بێ هیچ مەبەستێک و لە خۆڕا وە دوای ژنە کەوت. ئەو بە پەنا کلیسا دا لە کووچەی **سێن ژاک** بای داوە کە کووچەیەکی باریک و بە سام بوو بە خانووبەرەی دووکەڵاویی و تاریکەوە. ئەو ژنە چوە نێو ماڵێکەوە کە لە پەنجەرەی ئاوەڵەی ئاهەنگی سەمای **فیکس trووت** کە لە گرامافۆنەوە بڵاو دەبۆوە دەبیسرا، کە تاو نا تاوێک بە گۆرانی بە سۆزی ئینگلیسی هەر ئەم هەوایەیان دوو پات دەکردەوە. ئەو ماوەیەکی راوەستا هەتا سەفحەکە تەواو بوو بەڵام هیچ نەیتوانی پەی بە چلۆنایەتی ئەم سازە بەرێ. ئەو ژنە کێ بوو و بۆ چوە وێ؟ بۆ وەدوای کەوتبوو؟ دیسان وەڕێ کەوتەوە. چرا سوورەکانی مەیخانە چووکەکان، پیاوە قاچاغچیەکان، سیمای سەیر و سەمەرە، قاوەخانە چووکەکان و جێی شک کە بە قەدەر حاڵی ئەو کەسانە ساز کرابوون، یەک بە دوای یەک دا لە بەر چاوی تێپەڕ دەبوون. لە پێش بەندەر شنەیەکی شێدار و فێنک دەهات کە تێکەڵ بە بۆنی چەوریی، بۆنی قەتران و رۆن ماسی بوو. چرا رەنگاورەنگەکان، لە سەر دارتێلە ئاسنینەکان چاویان دادەگرت. لە نێو هات و هاواری کەشتیەکانی چووک و گەورە، لۆتکە و گەمێی باسپێردار، دەستەیەک کارگەر، دز و دەمەهەراش هەمە چەشنە وینەیەک لە رەگەزی حەزرەتی ئادەم دەدیترا، لەو دزە بە دەستوبردانەی کە هێلکەیان لە قەل دەدزی، مێرداد لەخۆڕا دوگمەکانی کۆتەکەی داخست و سینگی دا پێشەوە. دوایە خێرا بۆ لای شەقامی **ئاتازۆنی** چوو کە ئاوبەندێکی سمیتیان لە بەر ساز کردبوو. کەشتییەکی گەورە لە قەراغ دەریا لەنگەری گرتبوو و چراکانی ئەو لایەی لە دوورەوە هەڵکرابوون. لەو کەشتیانەی کە وەک دونیا بچووکەکان، وەک شاری گەڕۆڵ، ئاوی دەریایان دەبڕی و دەگەڵ خۆیان کۆمەڵێک خەڵکی بە نەریت و قیافە و زمانی سەیرەوە لە وڵاتانی دوورەوە دەهێنا بەندەر و دوایە ئەوان وردەوردە تێکەڵاو دەبوون و دەتوانەوە. ئەو خەڵکە سەیرە، ئەو ژیانە سەمەرانەی یەک بە یەک بە بەر چاوی دا دەگوزەراند، لە سووراوسپیاوی ژنەکان خورد بۆوە. ئایا ئەوانە





بوون کـه پیـاویان شـێت و شـەیدای خـۆیان کـردبوو؟ ئایا هـەر کـام لەوانە پەیکەرەیەکی زۆر پەسـتـتـر لە پـەیکەرەی پشت شـووشـەی دوکـان نەبوون؟ سەراسـەری ژیانی پێ دەسکرد، خەیاڵـی و بێخۆ هاتە بـەر چاو. وەک ئەمە بوو کە لەم ساتە دا ئەو لە ئاوەکییەکی خەست و چەسپ دا پەلی دەکوتا و نەیدەتوانی لێی رزگار بێ. هـەموو شـتی پێ فشـە بوو، هـەروەتر ئەو کیژ و کوڕەی کە دەست لـە گەردنی یەکتـر لە بەر ئاوبەندەکە دانیشتبوون، پێی فـشـە بوو. ئەو دەرسـانەی کـە خـوێندبوونی، ئەو تارمـایە دووکـەڵاوییـەی فێرگە، هـەموو ئەوانەی پێ دەسکرد، خـۆکرد و کایە بوون. بۆ مێرداد تەنیا یەک راسـتـەقینە هەبوو و ئەویش پەیکەرەی پشت شـووشـەی دوکـان بوو. لەپڕ گـەڕاوە، بە هـەنگاوی رێکوپێک بە نێـو خـەڵک دا تێـپـەڕی و هـەر کـە گەیشتە بەر دوکـانی **سیگران** راوەستـا. دیسان چاوێکی لە پەیکەرە کرد، لە سـەر جـێی خـۆی بوو. دەتکوت بـۆ یەکـەم جـار لە ژیانی دا تەمـای گـرت. وەژوور دوکـان کـەوت. کـیـژێکی جـوان بە جلی رەش و پـێشـبـەندی سـپی بزەیەکی دەسکردی کرد، هاتە پێش و کوتی:

ـ چ ئەمرێکتان هەبوو ئاغا؟

مێرداد بە دەستی پشت شووشەی نیشان دا و کوتی:

ـ ئەم پەیکەرەیە.

ـ ئەم جلە کـەسکەت دەوێ؟ ئێمـە رەنگی دیکەشـمـان هـەیـە. ئیـزن بدەن. دوو دەقـیـقە راوسـتن، فەرمـوون هـەر ئێسـتـا کـارگەرەکـەمـان دەبەری دەکا بیـبـیـنن. لەوانەیـە بۆ دەسگیـرانـەکـەتان بوێ. هـەر ئـەو رەنگە کـەسـکەتان ویستبوو.

ـ ببوورن، پەیکەرەکەم دەویست.

ـ پەیکەرە! چۆن پەیکەرە، تێتانناگەم.

مێرداد تێگەیشت کـە پرسـیـارێکی بێـجێی کردوە بەڵام وە رووی خـۆی نەهێنا، دەستبەجێ وەک پێی ئیلهام کرابێ کوتی:

ـ بەڵێ پەیکـەرەکە هـەر ئەم جـۆرەی کـە هـەیە بە جلەکانیـەوە، چونکە من هـەندەرانییم و دوکـانی خـەیاتییم هـەیە، ئەم پـەیکەرەیەم هـەر ئاوا کە هـەیە





دەمەوێ.

ـ ئاھ! ئەوە چەتوونە، دەبێ لە خاوەن دوکان بپرسم، (رووی لە ژنێک کرد و کوتی :) هۆی **سوزان**، **میسیۆ لێئۆن** بانگ کە.

مێرداد چوە لای پەیکەرە. **مسیۆ لێئۆن** بە ردێنی بۆز، کورتەڵە، قەڵەو، جلی رەش و زنجیری سەعاتی زێڕ دوای وتووێژ دەگەڵ کیژی فرۆشیار هاتە لای مێرداد و کوتی:

ـ ئاغا پەیکەرەکەتان ویستبوو؟ چونکە هاوکارین بۆ ئێوە هەروا بە جلەکانیەوە بە دوو هەزار و دووسەد فرانک دەتدەمێ بە داشکاندنی نۆ سەد فرانک. چونکە ئەم پەیکەرەیە بۆ خۆمان بە دوو هەزار و حەوتسەد و پەنجا فرانک تەواو بوە. جلەکانیشی بایی سێسەد و پەنجا فرانکە. ئەمە جوانترین پەیکەرەیەکە کە لە چینیی خالیس ساز کراوە. پیرۆزبایتان لێدەکەم، دیارە کە ئێوەش شارەزان. ئەمە کاری هونەرمەندی بەناوبانگ **دۆکرۆ**یە. چونکە ئێمە دەمانەویست پەیکەرەی نوێ بکڕین ئەمەیە کە بە زەرەری خۆمان ئەم پەیکەرە دەفرۆشین، بەڵام بزانن کە ئەمە هەڵکەوتە، چونکە ئێمە شمەکی دوکان بە کڕیار نافرۆشین و هەروەها رادەگەیەنم کە دەتوانین بۆتان لە سندووقێک دا بیپێچینەوە.

مێرداد سوور هەڵگەڕابوو و نەیدەزانی لە ئاست نوتقی دوور و درێژ و گەرمی خاوەن دوکان چ بڵێ. لە جیات وڵام دەستی لە باغەڵی نا و کیفەکەی دەرهێنا، دوو دانە هەزار فرانکی و یەک پێنسەد فرانکی لە دەست خاوەن دوکان نا و سێسەد فرانکی وەرگرتەوە. ئایا بە سێسەد فرانک دەیتوانی مانگێک بژی؟ چ گرینگایەتییەکی هەبوو چونکە بە ئاواتی بەرزی خۆی کەیشتبوو!

..............................................................

پێنج ساڵ دوای ئەم پێش هاتە مێرداد بە سێ چەمەدان کە یەکێک لەوان زۆر گەورە و وەک تابووت وا بوو گەڕاوە تاران. بەڵام شتێک کە هەموو بنەماڵە پێیان سەیر بوو مێرداد زۆر سارد دەگەڵ دەسگیرانی جووڵاوە و تەنانەت دیاریشی بۆ نەهێنابوو. رۆژی سێهەم کە تێپەڕی





دایکی بانگی کرد و لۆمەی کرد، بە تایبەت وەبیری هێناوە کە لە ماوەی ئەم شەش ساڵە دا دەرخشەندە بە هیوای ئەو دانیشتوە و چەند داواکەری جواب کردوون و ئەو ناچارە کە درەخشەندە بێنێ. بەڵام مێرداد زۆر لە سەرەخۆ گوێی دایە و دایکی دڵنیا کرد و کوتی کە من بڕوام گۆڕاوە و تەمام گرتوە کە قەت ژن نەهێنم. دایکی نارەحەت بوو و دیتی کە کوڕەکەی هەمان مێردادی شەرمێونی گوێ لە مستی پێشوو نیە. هۆی ئەم گۆڕانی ئەخلاقەی لە بەر هاتوچۆی کافران و سست بوونی بیروڕای ئەو دانا. بەڵام دوایەش هەرچی لە ئەخلاق، کردار و ئاکاری ورد بۆوە شتێکی کە دژی بیروڕای ئەو نیشان بدا نەدیت و نەیزانی کە ئاخریەکەی ئەو لە چ ڕێباز و خەتێک دایە. ئەو هەمان مێردادی ترسەنۆک و دواکەوتووی کۆن بوو، تەنیا بیروڕای گۆڕابوو و ئەگەر چی چەند کەس ئاگایان لە ئاکاری بوو بەڵام لە کەین و بەینی ئەویندارانە شتێکیان نەدیت.

بەڵام بۆ شتێک کە ماڵێ شکیان پەڕی سەر مێرداد ئەمە بوو کە لە دیوی تایبەتی خۆی دا لە پشت دەرگا پەیکەرەی ژنێکی دانابوو کە جلی کەسکی دەبەر دابوو، دەستێکی لە کەمەر دابوو و دەستی دیکەی داکەوتبوو و بزەی دەهات، پەردەیەکی گوڵدۆزیشی لە پێش هەڵاوەسرابوو و شەوانە ئەودەم کە مێرداد دەگەڕاوە ماڵ دەرکەکانی دادەخست، سەفحەی گرامی دادەنا، شەرابی دەخواردەوە و پەردەی بەر پەیکەرەی لادەدا، دوایە سەعاتگەلێکی دوور و درێژ لە سەر کورسی لە بەرامبەر پەیکەرە دادەنیشت و دەچوو نێو بەحری جوانی وییەوە. هەندێک جار کە شەراب دەیگرت هەڵدەستا، دەچوە پێش و دەستی بە سەر پرچ و سینگی دادێنا. تەواوی ژیانی ئەویندارانەی ئەو بەوەندە دەبڕاوە و ئەم پەیکەرەیە بۆ ئەو سەرچاوەی ئەوین، هەوەس و ئاوات بوو.

دوای ماوەیەک بنەماڵەکەی و بە تایبەت درەخشەندە لەم بابەتەوە شک هەڵیگرتبوون کە رازێک لەم پەیکەرە دایە. درەخشەندە بە لاتاو ناوی ئەم پەیکەرەی نابوو بووکی پشت پەردە. دایکی مێرداد بۆ تاقی کردنەوە چەند





جار پەڵپی پێگرتبوو کە ئەم پەیکەرەیە بفرۆشێتەوە یا جلەکانی بە دیاری بدا بە درەخشەندە. بەڵام مێرداد هەمیشە داواکەی ڕەد دەکردەوە. لە لایەکی دیکەوە درەخشەندە بۆ ئەوە کە دڵی مێرداد وەچنگ خا، سەلیقە و مەیلی ئەوی لەم پەیکەرەیە وەرگرت. مووی سەری وەک پەیکەرەکە لوول کرد، جلی کەسکی وەک هی بەر پەیکەرەکەی دروو، تەنانەت مۆدی کەوشەکەشی لە رووی پەیکەرەکە هەڵگرتەوە و ئەو رۆژانەی کە مێرداد وەدەر دەکەوت، کاری درەخشەندە ئەمە بوو کە دەچوە دیوی مێرداد، لە بەر ئاوێنە لاسای پەیکەرەی دەکردەوە. دەستێکی لە کەمەر دەدا، وەک پەیکەرە ملی لار دەکردەوە و پێدەکەنی، بە تایبەت حاڵەتی چاوەکانی، حاڵەتی دڵبەریی کە هاوکات چاوی لە ئینسان دەکرد و وەک ئەمە بوو تەماشای بۆشایی دەکا، هەر دەیەویست لاسای رووحی پەیکەرە بکاتەوە. وێچوونێکی کەمی کە دەگەڵ پەیکەرەکە هەبوو ئەم کارەی هەتا رادەیەک بۆ هاسان دەکردەوە. درەخشەندە سەعاتگەلێکی زۆر هەموو ئازای لەشی دەگەڵ پەیکەرەکە هەڵدەسەنگاند و حەولی دەدا کە خۆی بە شکڵ و حاڵەتی ئەو دەربێنێ و ئەودەم کە مێرداد دەهاتەوە ماڵێ، بە شێوەی جۆراوجۆر و زیرەکی تایبەتی خۆی پێ نیشان دەدا. لە پێشدا رەنجبەخەسار دەبوو و مێرداد سەرنجی نەدەدایە. ئەم مەسەلە بوو بە هۆی ئەمە کە بۆ ئەو کارە پتری هان بدا و بەم جۆرە وردەوردە کەوتە بەر دڵی مێرداد و شەڕی دەروونی و کێشەی نێو دڵی تێدا بەدی هات. مێرداد بیری دەکردەوە دەست لە کامەیان هەڵگرێ؟ لە چاوەڕوانی و پێ داگریی کچەمامی هەستی ڕێز و قینی تێدا پێکهاتبوو. لە لایەکەوە ئەم پەیکەرە سارده رەنگ پەڕیوە بە جلی کاڵ بۆوە کە بەتاڵن و فەوتانی لاویی و ئەوین و نوێنەری بەدبەختی بوو و پێنج ساڵ بوو کە بەم قەڵافەتە خەیاڵی و بێچارەیەی هەست و مەیلەکانی خۆی هەڵخەڵەتاندبوو، لە لایەکی دیکەوە کچەمامی کە زەجری کێشابوو و سەبری کردبوو، خۆی بە مەیل و سەلیقەی ئەو رازاندبۆوە، دەیتوانی لە کامەیان چاوپۆشی بکا؟ بەڵام هەستی کرد کە بەم سانایییەش ناتوانێ لەم پەیکەرە کە سەرچاوەی





ئەوینی ئەو بوو خۆ لا دا. ئایا ئەو ژیانێکی تایبەتی، شوێنێک و جێگەیەکی جیای لە دڵی ئەو دا نەبوو؟ چەندە فریوی دابوو، چەندە بە بیری رابواردبوو، هەستی بە خۆشی کردبوو و لە مێشکی دا ئەوە پەیکەرە نەبوو کە بە کۆگایەک گڵ و مووی دەسکرد دروست کرا بوو، بەڵکەم کەسێکی زیندوو بوو کە لە خەڵکی زیندوو بۆ ئەو راستەقینەتر بوو. ئایا دەیتوانی فڕێی داتە کەلاوە یا بیداتە کەسێکی دیکە. لە پشت شووشەی دوکانی دابنێ و نیگای هەر بێگانەیەک راز و سڕڕی جوانی ئەو بپشکنێ و بە چاوان بیلاوێننەوە و یا بیشکێنن، ئەو لێوانەی کە ئەوەندە ماچی کردبوو، ئەو ملەی کە ئەوەندە دەستی پێداهێنابوو؟ قەت. دەبێ لێیبگۆڕێ و بیکووژێ هەر ئەو جۆرەی کە کەسێکی زیندوو دەکوژن، بە دەستی خۆی بیکووژێ. لە بەر ئەمە مێرداد دەمانچەیەکی چووکەی کڕی. بەڵام هەر کات کە دەیەویست کارەکەی تەواو کا دوودڵ دەبوو.

شەوێک کە مێرداد مەست و پەست، درەنگتر لە جاران هاتەوە ژوورەکەی، چرای هەڵکرد. وەک دابی جارانی خۆی پەردەی لادا، شووشەی شەرابی لە شکاف دەرهێنا، گرامەکەی قورمیش کرد و سەفحەیەکی دانا و دوو شەربە شەرابی لە سەر یەک پێداکرد. دوایە چوە سەر کورسی بەرامبەری پەیکەرە دانیشت و چاوی تێبڕی.

دەمێک بوو کە مێرداد چاوی لە سیمای پەیکەرە دەکرد بەڵام ئەوی نەدەدیت، چونکە خۆبەخۆ لە مێشکی دا جێگر دەبوو. ئەو کارەی تەنیا لە بەر عادەت دەکرد چونکە چەند ساڵ بوو کە کاری هەر ئەوە بوو. دوای ئەوە کە ماوەیەک چاوی لێکرد، ئارام هەستا و چوە نزیک پەیکەرە، دەستی بە سەر پرچی داهێنا و دوایە دەستی بردە پژمل و سەر سینگی بەڵام لە پڕ وەک ئەوە کە دەستی لە سەر ئاسنی داغ دانابێ، دەستی کێشاوە و پشتاپشت گەڕاوە. ئایا راست بوو، یانی دەکرا، ئەو گەرما بە تینەی کە هەستی پێکردبوو. نا جێی شک نەبوو. ئاخۆ خەونی نەدەدیت، یا مۆتە نەیگرتبوو؟ لە بەر مەستی نەبوو؟ بە سەر دەستی چاوی پاک کردەوە و خۆی خستە سەر کورسی هەتا مێشکی رێکوپێک بکاتەوە. لەپڕ





لەو کاتە دا دیتی پەیکەرەکە بە هەنگاوی ورد کە دەستێکی لە کەمەر دابوو و پێدەکەنی و لێی نزیک دەبۆوە. مێرداد وەک شێتان هەستا کە هەڵێ بەڵام لەو کاتە دا بیرێک بە مێشکی داهات و بێ ویستی خۆی دەستی دە گیرفانی شاڵوارەکەی نا و دەمانچەی دەرکێشا و سێ گوللەی بە دوای یەک دا لە پەیکەرە راکێشا. لەپڕ ناڵەیەک هات و پەیکەرە کەوتە زەوی. مێرداد هەراسان داهاتەوە و سەری بەرز کردەوە. بەڵام ئەمە پەیکەرە نەبوو درەخشەندە بوو کە دە خوێن دا دەگەوزا!





چەند نانەواخانە، قەسابیی، عەتتاریی، دوو قاوەخانە و سەلمانییەک کە هەموویان بۆ بژیو و بەڕێوە چوونی پێداویستیەکانی زۆر سەرەتایی ژیان بوون، مەیدانی وەرامینیان پێکهێنابوو. مەیدان و مرۆڤەکان لە ژێر هەتاوی بە تین، نیوە سووتاو، نیوە هەڵقرچاو، ئاواتەخوازی یەکەم شنەی زەردەپەڕ و سێبەری شەو بوون. مرۆڤەکان، دوکانەکان، دارەکان و گیاندارەکان، لە کار و جموجۆڵ کەوتبوون. هەوایەکی گەرم لە بان سەریان قورسایی دەکرد و تۆز و خۆڵێکی نەرم لە بەر ئاسمانی شین شەپۆلی دەداوە کە لە بەر هاتوچۆی ماشێنەکان هەر دەهات و خەستتر دەبوو.

لە لایەکی مەیدان پیرەچنارێکی لێبوو کە هەڵۆڵ ببوو، بەڵام بە لاسارییەوە لقە خوار و خێچەکانی خۆی بڵاو کردبۆوە و لە ژێر سێبەری گەڵا تۆزاویەکان سەکۆیەکی پانی گەورەیان ساز کردبوو، کە دوو کوڕ لەوێ بە گۆرانی شیربرینج و تۆوی کوولەکەیان دەفرۆشت. قوڕاوێکی خەست بە نێو قاناوی پێش قاوەخانە دا بە زەحمەت خۆی دەکێشا و تێدەپەڕی.





تەنیا بینایەک کە جێی سرنج بوو بورجی بە ناوبانگی وەرامین بوو کە نیوەی دیواری خڕی قەڵش تێکەوتووی بە سەری قووچییەوە بە دیارەوە بوو. ئەو چۆلەکانەش کە دە نێو کەلێن و درزی خشتە هەڵوەریوەکانی دا هێلانەیان چێ کردبوو لە تاوی گەرما بێدەنگ بوون و وەنەوزیان دەدا ـ تەنیا نووزەی سەگێک نێونێوە بێدەنگی دەشکاند.

ئەمە سەگێکی سکاتلەندی بوو کە لمبۆزی بۆز و پێیەکانی خاڵی رەشیان لە سەر بوو، وەک ئەوە کە بە نێو قوڕ و چڵپاو دا هەڵاتبێ و شڵپەشڵپی تێدا کردبێ. گوێیەکانی پان، کلکی قیت، تووکەکانی لوول و چڵکن بوون و دوو چاوی وریای مرۆڤانە لە سیمای تووکناویی دا زیتەیان دەهات. لە بن چاوەکانی ئەو دا رووحێکی مرۆڤانە دەدیترا، لە شەوەزەنگێک کە ژیانی ئەوی داگرتبوو شتێکی بێبن لە چاوەکانی دا شەپۆلی دەداوە و پەیامێکی پێبوو کە نەدەکرا تێیبگەی، بەڵام لە پشت زیتەی چاوەکانی پەنگی خواردبۆوە. ئەوە نە رووناکی و نە رەنگ بوو، شتێکی سەیری دیکە بوو وەک ئەو شتەی کە لە چاوەکانی ئاسکێکی بریندار دا دەبیندرێ. نە تەنیا وێچوونێک دە نێوان چاوەکانی ئەو و مرۆڤ دا هەبوو بەڵکە جۆرێک یەکسانیی و بەرابەریی دەدیترا. ـ دوو چاوی مۆری پڕ لە دەرد و ژان و چاوەڕوانیی کە تەنیا لە سیمای سەگێکی گەڕۆڵ دا لەوانەیە ببیندرێ. بەڵام وا دیاریی دەدا کە کەس نیگای بە ژان و پڕ لە تکای نابینێ و پەی پێنابا! لەبەر نانەواخانە شاگردەکەی لێیدەدا، لەبەر گۆشتفرۆشی شاگردەکەی بەردی پێدادەدا، ئەگەر پەنای بردبا بەر نسێی ماشێن، شەپی قورسی کەوشی بزمارداری شۆفیر پێشوازیی لێدەکرد و کاتێک هەموو لە ئازار دانی ماندوو دەبوون، کوڕی شیربرینجفرۆش کەیفێکی تایبەتی بە ئەشکەنجەی دەهات. لە ئاست هەر نووزەیەک خڕکەبەردێک وە پشتی دەکەوت و دەنگی قاقای منداڵ بە دوای نووزەی ئەو دا بەرز دەبۆوە و دەیکوت: « هەی لە خێوت بەم! » دەتکوت ئەوانی دیکەش دەگەڵی هاودەست بوون و لەبنەوەبڕانە هانیان دەدا، لە قاقای پێکەنینیان دەدا. هەموو لەبەر رەزای خودا تێیانهەڵدەدا و پێیان

زۆر ئاسایی بوو سەگێکی گلاو کە مەزهەب تووکی لێکردوە و حەفتا گیانی هەیە، بۆ خێر بیچزێنن.

لە ئاکام کوڕی شیربرینجفرۆش ئەوەندە بەرببینگی گرت هەتا حەیوان ناچار بەرەو کۆلانێک کە دەگەیشتە بورج رای کرد، یانی بە زگی برسی بە زەحمەت خۆی کێشا و لە ئاوەڕۆیەک دا خۆی شاردەوە. سەری لە سەر هەردووک دەستەکانی دانا، زمانی دەرکێشا. لە حاڵی نیوەخەو و بەخەبەریی تەمەشای مووچەیەکی سەوزی دەکرد کە لە بەرامبەری هەڵکەوتبوو و کەروێشکەی دەکرد. لەشی ماندوو بوو و عەسەبەکانی دێشان، لە هەوای شێداری ئاوەڕۆ حەسانەوەیەکی تایبەتی سەرتاپای داگرت. بۆنی جۆراوجۆری سەوزەی نیوەگیان، لینگە کەوشێکی کۆنی نمدار، بۆنی شتە مردوو و زیندوەکان لە کەپۆی دا، گەلێک بیرەوەری تێکەڵ و دووری تێدا زیندوو کردەوە. هەر جارەی کە لە مووچە خورد دەبۆوە، مەیلی غەریزەیی دەبزووت و بیرەوەری کۆنەکان دە مێشکی دا دەبووژانەوە، بەلام ئەمجارە ئەم هەستە ئەوەندە بە هێز بوو دەتکوت دەنگێک لە بن گوێی بۆ هەڵبەزهەڵبەز هانی دەدا. هەستی بە حەزێکی زۆر دەکرد کە لەم مووچەیە را بکا و بازبازدێنێ بکا.

ئەمە هەستی بە میراتبراوی ئەو بوو، چونکە هەموو باب و باپیرەکانی ئەو لە سکاتلەند دە نێو مێرگ دا بە ئازادیی بار هاتبوون. بەلام لەشی هێندە کوتراو بوو کە ئیزنی چووکترین جووڵەی پێنەدەدا. هەستێکی بە ژان تێکەڵ بە بێهێزیی و بێدەستەلاتیی تێیدا پێکهاتبوو، کۆمەڵێک هەستی لەبیرکراو و ون هارووژا بوون. بەر لە ئێستا ئەو پابەندیی و پێداویستیی جۆراوجۆری هەبوو. بە ئەرکی خۆی دادەنا کە بە بانگی خێوەکەی خۆی بگەیەنێتێ، کەسی بێگانە یا سەگی نەناسیاو لە ماڵە خێوەکەی بتارێنێ، دەگەڵ منداڵی خێوەکەی گەمەی بکا، دەگەڵ کەسی ناسیاو چۆن بجووڵێتەوە، دەگەڵ غەریبە چ بکا، بە کاتی خۆی بخوا، لە کاتی خۆی دا چاوەڕوانی لاواندنەوە بێ. بەلام ئێستا تەواوی ئەو پابەندییانەی لە کۆڵ ببوونەوە.





هەموو زیکر و هۆشی ببوو ئەمە کە بە ترس و لەرز لە سەر زبیل، کوتە خۆراکێک بدۆزێتەوە و تەواوی ڕۆژ تێیهەڵدەن و بنووزێنێ ـ ئەمە ببوو بە تاکە ئامرازی بەرگریی ئەو ـ پێشتر ئەو بە ورە، بێباک، خاوێن و بە دەماغ بوو، بەڵام ئێستا ترسەنۆک و خوێڕی ببوو. هەر دەنگێک کە هاتبا یان شتێک لە نزیکی ئەو جوولابا‌وە، لەرزی تێدەکەوت. تەنانەت لە دەنگی خۆشی زەندەقی دەچوو ـ ئەو هەر خووی بە پیسایی و زبیل گرتبوو. ـ لەشی خورووی تێکەوتبوو، تاقەتی نەبوو کێچەکانی بدۆزێ یا خۆی بلێسێتەوە. ئەو هەستی دەکرد کە بۆتە بەشێک لە کەلاوە و شتێک لەو دا مردوە، کووژاوەتەوە.

لە کاتێکەوە ڕێی دەم جەهەننەمخانەیە کەوتوە، دوو زستان دەبێ کە ژەمێکی تێری نەخواردوە، خەوێکی ڕاحەتی نەکردوە، مەیل و هەستەکانی دامرکابوون، کەسێک دەستی لاواندنەوەی بە سەر دانەهێناوە، کەس چاوی دە چاوی نەبڕیوە. هەر چەند خەڵکەکەی ئێرە بە ڕواڵەت وەک خاوەنەکەی دەچوون، بەڵام وا دەهاتە بەرچاو کە هەستەکان و ئاکار و کرداری خێوەکەی دەگەڵ ئەوانە عەرز و ئاسمان جیاوازی هەبوە. دەتکوت ئەو کەسانەی کە پێشتر تێکەڵاویان بوو لە دونیای ئەو نزیکتر بوون، باشتر لە دەرد و هەستەکانی ئەو دەگەیشتن و پتر لایەنگرییان لێدەکرد. دە نێو ئەو بۆنانەی کە بۆی دەهات، بۆنێک کە پتر لە هەموان گێژی دەکرد، بۆنی شیربرینجی بەر کوڕەکە بوو ـ ئەم ئاوەکی سپییە کە زۆر لە شیری دایکی دەچوو و بیرەوەری منداڵەتی لە مێشکی دا زیندوو دەکردەوە ـ لەپڕ داهێزا، واهاتە بەر زەینی کاتێک کە توڵە بوو لە گوانی دایکی ئەم ئاوەکی گەرم و خەستەی دەمژی و زمانی نەرم و پتەوی دایکی لەشی دەلێستەوە و خاوێنی دەکردەوە. ئەو بۆنە توندەی کە دە باوەشی دایکی لە پەنا براکەی هەڵیدەمژی ـ بۆنی توند و قورسی دایکی و شیرەکەی دە کەپۆی دا بووژانەوە.

هەرکە شیرمەست دەبوو، لەشی گەرم و ڕاحەت دەبوو و گەرمایەک بە ڕەگ و دەمارەکانی دا دەگەڕا، سەری قورسی لە گوانی دایکی جوێ

دەبۆوە و خەوێکی قورسی بە سەر دادەهات و لەرەیەکی کەیفدار لە سەر لەشی هەست پێدەکرد. ـ چ خۆشییەک لەمە زیاتر، دەستەکانی بە گوانی دایکییەوە دەنا، بێزەحمەت و کوێرەوەریی شیر دەهاتە دەر. لەشی کوڵکنی براکەی، دەنگی دایکی هەموو ئەمانە پڕ بوون لە کەیف و لاواندنەوە. کۆختەی چێوینی پێشووی خۆی وەبیر هاتەوە، ئەم گەمەیانەی کە لە سەر چیمەن دەگەڵ براکەی دەیکرد.

قەپی بە گوێ پانەکانی ئەو دادەگرت، دەکەوتنە زەوی، هەڵدەستانەوە، رایان دەکرد و لە دوایی هاوگەمەیەکی دیکەی دیتەوە کە کوڕی خێوەکەی بوو. لە بنەبانی باغ بە دوای دا رای دەکرد، دەوەڕی، بە کەڵپی جلەکەی دەگرت. بە تایبەت دەست بە سەر داهێنانی خێوەکەی و ئەو قەندانەی کە لە دەستی ئەو خواردبووی، قەت لە بیری ناکا، بەڵام کوڕی خێوەکەی پتر خۆش دەویست، چونکە هاوگەمەی بوو و قەت لێینەدەدا. لە دوایی لەپڕ دایک و براکەی ون بوون، تەنیا خێوەکەی و کوڕەکەی ئەو و ژنەکەی دەگەڵ نۆکەرێکی پیر مابوونەوە. چەندە باش بۆنی ئەوانی لێک دەکردەوە و دەنگی پێی لە دوورەوە دەناسینەوە. کاتی شێو و نەهار بە دەوری مێز دا دەخولاوە و بۆنی بە خۆراکەکانەوە دەکرد و هەندێک جار ژنی خێوەکەی سەرەڕای دژایەتی مێردەکەی پاروویەکی خۆشەویستانەی بۆ ساز دەکرد. دوایە نۆکەری پیر دەهات، بانگی دەکرد: « پات... پات... » و خۆراکەکەی دە دەفرێکی تایبەتی کە لە کن کۆختە چێوییەکەی بوو، دەکرد.

مەست بوونی پات بوو بە هۆی بەدبەختی وی، چونکە خێوەکەی نەیدەهێشت کە پات لە ماڵ دەرکەوێ و وەشوێن دێڵەبەبایان بکەوێ. بە هەڵکەوت رۆژێکی پاییزی خێوەکەی دەگەڵ دوو کەسی دیکە کە پات ئەوانی دەناسی و زۆرجار هاتبوونە ماڵەکەیان، سواری ماشێن بوون و پاتیشیان بانگ کرد و لە پەنا خۆیان دایاننیشاند. پات چەند جار دەگەڵ خێوەکەی بە ماشێن سەفەری کردبوو، بەڵام لەم رۆژە دا ئەو مەست بوو و حاڵ و هەوایەکی تایبەتی هەبوو. دوای چەند سەعات رێ بڕین لەم





مەیدانە دابەزین. خێوەکەی دەگەڵ ئەو دووکەسە بەم کۆڵانەی پەنا بورج دا رۆیشتن بەڵام بە هەڵکەوت بۆنی دێڵــەســەگــێک، بۆنێکی تایبــەتی هاوڕەگەزەکەی کە پات لێیدەگەڕا، لەپڕ ئەوی شێت کرد، بۆنی بە هەموو شوێنێکەوە کرد و لە ئاکام بە ئاوەڕۆیەک دا وە نێو باغێک کەوت.

لای ئێوارە دیسان گوێی لە دەنگی خێوەکەی بوو کە دەیکوت: « پات... پات!... »، ئایا بە راستی دەنگی ئەو بوو یا زایەڵەی دەنگی ئەو بوو کە دە گوێچکەی دا زرینگابۆوە؟

هەرچەند دەنگی خاوەنەکەی شوێنێکی غەریبی لە سەر دادەخست، چونکە گشت بەڵێنی و بەرپرسیایەتییەکی کە بە ئەرکی خۆی دادەنا، وە بیری دەخستەوە، بەڵام هێزێکی بەهێزتر لە هێزی دونیایی ئەوی ناچار دەکرد کە دەگەڵ دێڵەسەگ بێ. وەها کە هەستی کرد گوێچکەی لە ئاست دەنگەکانی دیکە کپ و قورس بوە. هەستگەلێکی تازەی تێدا پێکهاتبوو و بۆنی دێڵەسەگ ئەوەندە توند و بەهێز بوو کە سەرەگێژەی گرتبوو.

تەواوی ماسولکەکان، تەواوی لەش و هۆشی لە ژێر فەرمانی ئەو چووبوونە دەر وەها کە هۆشی لە سەر خۆی نەمابوو. ـ بەڵام هێندەی نەخایاند کە بە دار و پەیاغ گەیشتنە سەری و بە ئاوەڕۆ دا دەریان کرد.

پات گێژ و ماندوو، بەڵام سووک و راحەت، هەر کە هاتەوە خۆ، وە شوێن خێوەکەی کەوت. لە چەند پشت کۆڵان بۆنێکی کزی لێمابۆوە. هەمووی پشکنی و لە مەودای دیاریکراو نیشانەی دانا، هەتا وێرانەی دەرەوەی ئاوەدانی چوو، دیسان گەڕاوە، چونکە پات بەوە گەیشتبوو کە خاوەنەکەی گەڕاوەتەوە مەیدان، بەڵام لەوێ بۆنی کزی ئەو دە نێو بۆنەکانی دیکە دا ون دەبوو. ئاخۆ خێوەکەی رۆیشتبوو و ئەوی جێ هێشتبوو؟ هەستی بە دڵەکوتە و ترسێکی خۆش کرد. چلۆن پات دەیتوانی بێ خێوەکەی، بێ خوداکەی بژی. چونکە خێوەکەی بۆ وی وەک خودا بوو، بەڵام سەرەڕای ئەمە دڵنیا بوو کە خێوەکەی بە شوێنی دا دێ. هەراسان بە چەند جادە دا دەستی بە هەڵاتن کرد. زەحمەتەکەی بێفایدە بوو.

لە ئاکام شەو، ماندوو و شەکەت گەڕاوە مەیدان، هیچ شوێنەوارێک لە

خێوەکەی نەمابوو. چەند خولی دیکەی لە ئاوەدانی دا لێدا. لە ئاکام چوە دەم ئاوەڕۆیەک کە دێڵەسەگەکەی لێبوو، بەڵام بەردیان وەبەر ڕێگای ئاوەکە دابوو. پات بە دڵگەرمییەکی سەیر بە دەستەکانی زەوی هەڵکۆڵی بەشکەم بتوانی بچێتە نێو باغ، بەڵام نەگونجا. دوای ئەمە کە هیوای بڕا، هەر لەوێ خەریکی وێژینگ دان بوو.

نیوەشەو پات بە دەنگی ناڵەی خۆی ڕاچەنی. هەراسان هەستا، لە چەند کۆڵان خولاوە، بۆنی بە دیوارەکانەوە کرد و ماوەیەک ئاوارە و سەرگەردان بە کۆڵانەکان دا گەڕا. لە ئاکام هەستی بە برسیایەتییەکی زۆر کرد. کە گەڕاوە مەیدان بۆنی خواردەمەنی جۆراوجۆری بۆ هات: بۆنی گۆشتی شەومەنە، بۆنی نانی تازە و ماست، هەموو ئەو بۆنانە تێکەڵ یەک ببوون. بەڵام هاوکات هەستی دەکرد کە تاوانبارە و پێی دە مڵکی کەسێکی دیکە ناوە. دەبێ لەو خەڵکە کە وەک خێوەکەی دەچن سواڵ بکا و ئەگەر غەنیمێکی دیکەی لێ پەیدا نەبێ و ڕاوی نەنێ وردەوردە هەقی مڵکایەتی ئێرە وە چنگ بخا و لەوانەیە یەکێک لەو بوونەوەرانەی کە خۆراک بە دەست ئەوانەوە بوو، ئاگاداری لێبکا.

بە پەنامەکی و ترس و لەرزەوە چوە بەر نانەواخانەیەک کە تازە کرابۆوە و بۆنی توندی هەویری پێژراو لە هەوا بڵاو ببۆوە. کەسێک کە نانی لە ژێر هەنگڵی نابوو، کوتی « کوت کوت... کوت! » دەنگی وی چەندە پێ سەیر بوو! و کوتە نانێکی گەرمی بۆ هاویشت. پات دوای ماوەیەک تێڕامان، نانەکەی خوارد و کلکەسووتەی بۆ کرد. ئەو کەسە، نانەکەی لە سەر سەکۆی نانەواخانە دانا، بە پەنامەکی و بە ترسەوە دەستێکی بە سەری پات داهێنا. دوایە بە هەر دووک دەستان قەڵادەی ملی کردەوە. چەند ڕاحەت بوو! دەتکوت تەواوی بەرپرسایەتی، بەند و ئەرکەکانیان لە ملی پات داڕنی. بەڵام کاتێک دیسان کلکەسووتەی کردەوە و لە خاوەن دوکان نزیک بۆوە، شەپێکی توندی وە کەلەکە کەوت و بە قرووسکاندن دوور بۆوە. خاوەن دوکان چوە سەر جۆگە و دەستی جوان شوشتەوە. هێشتاش قەڵادەکەی کە لەبەر دوکان هەڵواسرابوو، دەیناسیەوە.





لەوڕۆژەوە پات جگە لە شەپ، خڕکەبەرد و پەیاغ شتێکی دیکەی لەم خەڵکە پێنەبڕا. دەتکوت هەموویان دوژمنی خوێنیی ئەو بوون و کەیفیان بە ئازار دانی دەهات!

پات هەستی دەکرد چۆتە نێو دونیایەکی تازەوە کە نە ئەوێی بە هی خۆی دادەنا و نە کەس پەی بە هەست و دونیای ئەو دەبرد. چەند رۆژی یەکەمی زۆر سەخت لێگوزەرا، بەڵام لە دوایی وردەوردە خووی پێگرت. هەروەتر لە سەرپێچی کۆڵان شوێنێکی دیتبۆوە کە زبڵ و زاڵیان لێ بەتاڵ دەکرد و دە نێو زبیل دا کوتی چێژداری دەست دەکەوت وەک ئێسک، چەوری، پێست، سەرەماسی و گەلێک خواردەمەنی دیکە کە ئەو نەیدەتوانی بیانناسێتەوە. لە دواییش باقی رۆژەکەی لە بەر دوکانی گۆشتفرۆش و نانەواخانە تێپەڕ دەکرد. چاوی لە دەستی گۆشتفرۆش بڕیبوو، بەڵام پتر لە کوتی چێژدار لێدانی وێدەکەوت و دەگەڵ ژیانی تازەی خۆی سازابوو. لە ژیانی رابوردووی کۆمەڵێک شتی نائاشکرا و سڕاوە و هەندێک بۆنی بۆ مابۆوە و هەر کاتێک زۆر ناخۆشی لێگوزەرابا، لەم بەهەشتە ونبۆوەی خۆی دا ئۆخژن و دەروویەکی دەرباز بوونی دەدیتەوە و بێ ئەوەی خۆی بیەوێ بیرەوەری ئەودەم دەهاتە بەر چاوی.

بەڵام شتێک کە لە هەموان پتر ئازاری دەدا، پێداویستی ئەو بە لاواندنەوە بوو. ئەو وەک منداڵێک بوو کە هەر چەپۆکیان پێدادابێ و جنێویان پێدابێ، بەڵام هەستە لاوازەکانی هێشتا دانەمرکابوون. بە تایبەت لەم ژیانە نوێیەی پڕ لە دەرد و زەجر دا پتر لە جاران پێویستی بە لاوانەوە هەبوو. چاوەکانی ئەم لاواندنەوەیان سواڵ دەکرد و حازر بوو گیانی خۆی بەخت بکا ئەگەر کەسێک بیلاوێنێتەوە و دەستی بە سەر دابێنێ. ئەو پێویستی بەمە هەبوو کە خۆشەویستی خۆی بۆ کەسێک دەربڕێ و فیداکاری بۆ بکا، هەستی پەرستن و ئەمەگداریی خۆی بە کەسێک نیشان بدا بەڵام وادەهاتە بەر چاو کە کەس پێویستی بە دەربڕینی هەستەکانی ئەو نیە؛ کەس پشتیوانی لێنەدەکرد و چاوی لە هەر چاوێک دەبڕی جگە لە قین و رق شتێکی دیکەی بۆ دەرنەدەکەوت و هەر

هەنگاوێک بۆ راکێشانی سەرنجی خەڵک وەک ئەمە بوو کە رق و تووڕەیی ئەوانی پتر هەڵدەستاند.

لەو حاڵە دا پات دە ئاوەڕۆ دا وێژینگی دەدا، چەند جار ناڵەی کرد و وەئاگا هاتەوە، دەتکوت مۆتە گرتوویەتی. لەم کاتە دا هەستی بە برسیایەتییەکی زۆر کرد، بۆنی کەباب دەهات. برسیایەتییەکی بێ ئامان تەواوی دەروونی ئەشکەنجە دەکرد وەها کە بێهێزیی و دەردەکانی دیکەی لە بیر کرد. بە زەحمەت هەستا و بە پەنامەکی بەرەو مەیدان رۆیشت.

..........................................................

لەم کاتە دا یەکێک لەم ماشێنانە بە تڕەتڕ و تەپ و تۆزەوە، هاتە نێو مەیدانی وەرامین. پیاوێک لە ماشێن دابەزی. بەرەو پات چوو و دەستێکی بە سەری داهێنا. ئەم پیاوە خێوەکەی نەبوو، پات فریوی نەخواردبوو، چونکە بۆنی خێوەکەی خۆی باش دەناسییەوە. بەڵام چلۆن کەسێک پەیدا بوە کە دەستی بە سەر دادێنێ؟ پات کلکی لەقاندەوە و بە دوودڵییەوە چاوی لەو کابرایە بڕی ـ ئایا فریوی نەخواردبوو؟ بەڵام ئیدی قەڵادەی بە ملەوە نەمابابوو کە لەبەر ئەو دەستی بە سەر دابێنن. پیاوەکە گەڕاوە و دیسان دەستێکی بە سەری داهێنا. پات وەدوای کەوت و سەرسوڕماویی پتر بوو چونکە پیاوەکە چوە ژوورێکەوە کە ئەو زۆر باشی دەناسی و بۆنی چێشتی لێدەهاتە دەر. لە سەر نیمکەت لە پەنا دیوار دانیشت. نانی گەرم، ماست، هێلکە و خۆراکی دیکەیان بۆ هێنا. پیاوەکە نانی دە ماست هەڵدەکێشا و دەیهاویشتە بەری. پات لە پێشدا بەپەلە لە دوایی لەسەرەخۆ ئەو نانانەی دەخوارد و چاوە مۆر و گەش و بێدەرەتانەکانی خۆی وەک سپاس لە کابرا بڕیبوو و کلکی دەلەقاند. ئایا بەخەبەر بوو یا خەونی دەدیت؟ پات ژەمەنانێکی خوارد بێ ئەوەی کە ئەم خواردنە بە تێهەڵدان کۆتایی بێ. ئاخۆ لەوانەیە خێوێکی تازەی دەست کەوتبێ؟ سەرەڕای گەرما پیاوەکە هەستا. چوە هەمان کۆڵانی بورج، لەوێ کەمێک وەستا. لە دوایی بە کۆڵانە پێچاوپێچەکان دا رۆیشت. پاتیش بە شوێنیەوە، هەتا ئەمە کە لە ئاوەدانی دەرکەوت و چوە نێو هەمان وێرانەوە





کـە چەند دیواری هەبوو و خـێـوەکـەشـی هەتا وێ چووبوو. لەوانەیـە ئەم خـەڵکەش بە شـوێن بۆنی دایکیـانـەوەن؟ پات لە پەنا سـێـبـەری دیوار چاوەڕوان ماوە، دوایە بە ڕێگایەکی دیکە دا گەڕانەوە مەیدان.

پیـاوەکـە دیسان دەسـتێکی بە سـەری داهێنا و دوای گـەڕانێکی کورت بە دەوری مەیدان دا چوە نێو مـاشێنێکەوە کە پات دەیناسی. پات نەیوێرا وە سەر کەوێ، لە پەنا ماشێن دانیشت، چاوی لەو بڕی.

لە نەکاو ماشێن بە نێو تەپ و تۆز دا وەڕێ کەوت، پاتیش دەستبەجێ بە دوای مـاشـێن دا دەسـتی بە هەڵاتن کرد. نا، ئەمجارە ئەو نەیدەویست ئەم پیـاوە لە کیس بدا. هانکـەی دەهات و سـەرەڕای ژانێک کـە لە لەشی دا هەستی پێدەکرد بە تەواوی هێزەوە بە دوای ماشێنەوە هەلینگی دەدا و بە هەشـتـاو هەڵدەهات. مـاشـێن لە ئاوەدانی دوور کـەوتەوە و بە نێو سـارا دا تێدەپەڕی، پات دوو سێ جار گـەیشتـەوە سـەر ماشـێنەکە بەڵام دیسـان وە دوا کەوتـەوە. تەواوی هێزی خـۆی کۆ کردبۆوە و لە بەر ناهومێدیی بازدی دەدا بەڵام مـاشـێن لەو توندتر دەڕۆیشت. ـ ئەو هـەڵەی کـردبوو چونکە سـەرەڕای ئەوکە نەدەگەیشتـەوە سـەر مـاشێن، بێهێز ببوو و تێشکابوو. دڵی دەبووراوە و لەپڕ هەسـتی کـرد کـە تەواوی ئەندامـەکـانی لـە ژێر فـەرمـانی ئەو دانین و توانایی چووکترین جووڵەی نیە. هەموو هەوڵەکەی بێخود بوو. هەر نەیدەزانی کە بۆ هەڵاتوە، نەیدەزانی کە دەچێتە کوێ، نە ڕێی پێشی هەبوو نە ڕێی پاش. وەسـتـا، هانکەهانکی دەهات، زمـانی لە زاری هاتبوو دەرەوە. بەر چاوی تاریک ببوو. بە سـەری شۆڕ بـە زەحمـەت خۆی کێشا قەراغ جادە و چوە نێو قاناوێکی پەنا مـەزرا و زگی لە سـەر لمی داغ و شێدار دانـا و بە غـەریزەی خۆیەوە کە قـەت فـریوی نەدەخـوارد هەستی کرد کە ئیدی لێرە ناتوانی ببزوێ. سـەری دە گێژەوە دەهات، بیر و هەسـتـەکـانی سـڕاوە و تـار ببـوون، ژانی زۆری بـە زگ دادەهات و شـۆقـێکی ناخـۆش لە چاوەکـانی دەترووسکاوە. دە نێوان لـەرز و ئێش و برکەوە دەست و پێیەکانی سڕ دەبوون، ئارەقـەیەکی سـارد تەواوی لەشی داگرتبوو، جۆرێک فێنکایی نەرم و خۆش بوو...

.........................................................

نزیک ئێـوارە سێ قـەلەڕەشـەی بـرسـی لە سـەر سـەری پات دەخـولانەوە، چونکە بۆنی پاتیـان لە دوورەوە کـردبوو. یەکـێک لەوان بە پەنامـەکییـەوە لە پەنای نیـشت، بـە وردیی چاوی لێکرد، هـەر کـە دڵنیـا بوو پـات هێـشـتـا نەتۆپیـوە، دیسـان فڕیـوە. ئەم سێ قەلە هـاتبوون دوو چاوە مۆرەکانی پات دەرهێنن.





ئابجی خانم خوشکە گەورەی ماڕوخ بوو، هەرکەس کە پێشینەی نەبا و ئەوانی دیبا باوەڕی نەدەکرد کە خوشکی یەکترن. ئابجی خانم بالآبەرز، رەقەڵە، رەش ئەسمەر، لێوەکانی ئەستوور و پرچی رەش بوو، بە گشتی ناحەز بوو. لە حاڵێک دا ماڕوخ کورتەبالآ، سپیکەڵە، کەپۆ چووک، پرچی قاوەیی و چاوەکانی گیرا بوون و هەر کاتێک پێدەکەنی چاڵێک دەکەوتە سەر کوڵمەکانی. لە بابەتی ئاکار و کرداریشەوە جیاوازییەکی زۆریان هەبوو. ئابجی خانم لە منداڵییەوە بیانووگر و جینگەنە بوو و دەگەڵ خەڵک هەڵینەدەکرد، تەنانەت دوو سێ مانگ لە دایکی دەگۆڕی، بە پێچەوانە خوشکەکەی هەڵکەر، لەسەردڵان، ئاکارباش و دەم بە پێکەنین بوو. دایکی حەسەنی دراوسێیان ناوی نابوو « خانمەخانم ». دایک و باوکیشی پتر ماڕوخیان خۆش دەویست کە پاشەبەرە و ئازیز و نازەنین بوو. هەر لە منداڵییەوە دایکی لە ئابجی خانمی دەدا و تێیهەڵدەپێچا بەڵام لە ئاست خەڵک، لای هاوساکان بە رواڵەت دڵسۆزیی بۆ دەکرد. دەستی لە پشت دەستی دەکوتا و دەیکوت: « چ لەم بەدبەختەی بکەم ها؟ کێ کچی وا ناحەز دێنێ؟ دەترسم ئاخری لە سەر دەستم بمێنێتەوە! کچێک کە نە





ماڵی هەیە، نە جەماڵ و نە کەماڵ. کام بەستەزمان ئەوەی بێنێ؟ » ئەوەندە ئەم قسانەیان بەرەورووی ئابجی کوتبوو ئەویش بە تەواوی هیوابڕوا ببوو و دەستی لە مێرد کردن هەڵگرتبوو و زۆربەی کاتەکەی خەریکی نوێژ و تاعەت بوو. جارێکیش ویستیان ئەو بدەن بە کەلب حوسێنی شاگرد دارتاش، کەلب حوسێن نەیویست. بەڵام ئابجی خانم لە هەر کوێ دانیشتبا دەیکوت: « مێردم بۆ پەیدا بوو بەڵام بۆ خۆم نەمویست. پەح، مێردەکانی ئێستا هەموویان ئارەقخۆر و هەرزەن و بۆ سەر پان کردنەوە دەبن! من قەت مێرد ناکەم. »

بە رواڵەت قسەی وای دەکرد بەڵام دیار بوو کە دە دڵی دا کەلب حوسێنی خۆش دەویست و زۆری پێخۆش بوو مێرد بکا. بەڵام چونکە لە پێنج ساڵییەوە بیستبووی کە ناحەزە و کەس نایخوازێ، لەبەر ئەوە کە خۆی بێبەریی لە خۆشییەکانی ئەم دونیایە دەدیت دەیەویست بە زۆریی نوێژ و تاعەت لانیکەم ئەوانی دونیای دیکە بکاتە هی خۆی. بەمجۆرە دڵی خۆی خۆش دەکرد. ئادی ئەم دونیایە دووڕۆژەیە چ حەسرەتێکی دەبێ ئەگەر دەستی بە خۆشییەکانی رانەگا؟ دونیای هەرمان و هەمیشەیی هی وی دەبێ. هەموو خەڵکی جوان و هەروەتر خوشک و گشت کەس ئاوات بەو دەخوازن. کاتێک مانگی مەحەڕەم و سەفەر دادەهات دەمی خۆ هەڵسووڕاندن و خۆ نواندنی ئابجی خانم دەستی پێدەکرد. لە هیچ رەوزە خوێندنەوەیەک نەبوو کە لە سەرووی کۆڕ نەبێ. لە تازیەکان دا سەعاتێک بەر لە نێوەڕۆ جێی خۆی دەگرتەوە. تەواوی رەوزەخوێنەکان ئەویان دەناسی و زۆریان پێخۆش بوو کە ئابجی خانم لە پای مینبەرکەیان دانیشێ هەتا کۆڕەکە بە گریان و ناڵە و شینی خۆی گەرم بکا. زۆربەی رەوزەکانی لەبەر کردبوو، تەنانەت ئەوەند لە پای وەعز دانیشتبوو مەسەلەی دەزانی و زۆربەی هاوساکان دەهاتن و سەهویاتی خۆیانیان لێدەپرسی. سپێدەی بەیانی ئەو بوو کە خەڵکی نێو ماڵی هەڵدەستاند. لە پێش دا دەچوو بان سەری خوشکەکەی. شەپێکی لێدەدا و دەیکوت: «ئەوە نیوەڕۆیە، ئەدی کەی هەڵدەستی نوێژەکەت بکەی؟ » ئەو بەستەزمانەش





هەڵدەستا خەواڵوو دەسنوێژی هەڵدەگرت و نوێژی دادەبەست. بە بانگی بەیانی، قووقەی کەڵەباب، شنەی بەرەبەیان، ورتەورتی نوێژ حاڵەتێکی تایبەت، حاڵەتێکی رووحانیی بە سەر ئابجی خانم دادەهات و لە ئاست ویژدانی خۆی سەربەرز بوو. بە خۆی دەکوت « ئەگەر خودا من نەباتە بەهەشت ئەدی کێ دەبا؟ » پاشماوەی رۆژیش دوای پێڕاگەیشتنێکی چووک بە کارەکانی ماڵ و ئیراد گرتن لەم و لەو تەسبێحێکی رەش کە لەبەر زۆر هەڵسووڕاندن زەرد ببوو بە دەستیەوە دەگرت و سەڵەواتی دەنارد. ئێستاش هەموو ئاواتی ئەمە بوو کە بە هەر لەونێک کە بوە سەفەرێک بۆ کەربەلا بکا و لەوێ نیشتەجێ بێ.

بەڵام خوشکەکەی هیچ سەرنجێکی تایبەتی نەدەدا بەم بەشە و هەر کاری ماڵی دەکرد، دوایەش کە بوو بە پازدە ساڵە، چوو بۆ خزمەتکاریی. ئابجی خانم بیست و دوو ساڵی بوو بەڵام لە ماڵ مابۆوە و لە بنەوە ئێرەیی بە خوشکەکەی دەبرد. لە ماوەی ساڵ و نیوێک کە ماڕوخ چووبوو خزمەتکاریی جارێک ئابجی خانم نەچوو بۆ سەردان و حاڵ پرسینی. پازدە رۆژ جارێکیش کە ماڕوخ بۆ دیتنی کەس و کاری دەهاتەوە ماڵ، ئابجی خانم یا دەگەڵ کەسێک شەڕی دادەمەزراند یا دەچوو سەر نوێژ و دوو سێ سەعاتی پێدەخایاند. لە دواییش کە لێک کۆ دەبوونەوە لاتاوی بە خوشکەکەی دادەدا و دەستی دەکرد بە مۆعیزە لەمەڕ نوێژ، رۆژوو، تەهارەت و شک. بۆ وێنە دەیکوت: « لەو دەمەوە ئەم ژنە فرتۆڵانە پەیدا بوون نان گران بوە. ئەوەی رووی دانەپۆشێ لە دونیای دیکە لە دۆزەخ بە پرچ هەڵیداوەسن. ئەوەی غەیبەت بکا سەری بە قەرا کێوێکی لێدێ و ملی بە قەرا موویەک. لە جەهەننەم ماری وای لێیە کە پیاو پەنا بۆ ئەژدیها دەبا... » و شتی لەم بابەتەی دەکوت. ماڕوخ هەستی بەم ئێرەییە دەبرد بەڵام وە رووی خۆی نەدێنا.

رۆژێک لای ئێوارە ماڕوخ هاتەوە ماڵ و ماوەیەک دەگەڵ دایکی سرت و خورتی کرد و رۆیشت. ئابجی خانمیش چووبوو لە بەر دەرگای دیوی بەرامبەر دانیشتبوو و مژی لە قەننە دەدا، بەڵام لەبەر ئێرەییەک کە





هەیبوو لە دایکی نەپرسی کە خوشکەکەی چی دەکوت و دایکیشی هیچی نەکوت.

سەری شەوێ باوکی بە تەپلەی لبادیی کە دۆغاوی گێچی بە سەر دا تکابوو و لە بەننایی دەگەڕاوە جلەکانی داکەند، کیسەی توتن و سەبیلەی دەست دایە و چوە سەربان. ئابجی خانمیش کارەکانی تەواو یا ناتەواو وەلانا دەگەڵ دایکی سەماوەری تەنەکە، دیزی، بادیەی مسی، ترشی و پیوازیان هەڵگرت و چوون لە سەر بەڕەیەک لێک کۆ بوونەوە. دایکی قسەی دەست پێکرد کە عەبباس نۆکەری ئەوماڵەی کە ماڕوخ لەوێ خزمەتکارە بەتەمایە ئەو بێنێ. ئەمڕۆ بەیانیش کە ماڵ چۆل بوو دایکی عەبباس هاتبوو خوازبێنی. دەیەوێ حەوتەی دیکە مارەی بکا، بیست و پێنج تمەن شیربایی دەدا، مارەییەکەی سی تمەن و ئاوێنە، لالە، کەلامولّلا، جووتێک کەوشی چەرم، شیرنی، کیسەی خەنە، لەچکەی ریشوودار، دەرپێی چیت... دەبێ. باوکیشی کە هەروا بە باوەشێنێکی قەراغ دوراو خۆی باوەشێن دەکرد و قەندی لە سووچی زاری نابوو و چای دیشلەمەی دەخواردەوە، سەری لەقاند و سەرزمانیی کوتی « زۆر باشە، مەبارەک بێ قەیدی نیە. » بێ ئەوەی کە پێی سەیر بێ، خۆشحاڵ بێ یا رایەک دەربڕێ. دەتکوت لە ژنەکەی دەترسێ. ئابجی خانم پیشی دەخواردەوە. هەر کە باسەکەی زانی، ئیدی نەیتوانی باقی رێک کەوتنەکە گوێ بداتێ بە بیانووی نوێژ دەستبەجێ هەستا چوە خوارێ بۆ ژووری پێنجدەریی. لە ئاوێنەیەکی چووک روانیە خۆی. بە بڕوای خۆی پیر و شکاوە بوو، دەتکوت ئەم چەند دەقیقەیە چەند ساڵی پیر کردبوو. گنجی نێوان برۆکانی خۆی هەڵسەنگاند. دە نێوان تووکەکانی دا موویەکی سپی دیتەوە. بە دوو قامکان هەڵیکەند. ماوەیەک لە بەر چرا زەق چاوی لێکرد، هەستی بە کزانەوەی شوێنەکەی نەکرد.

چەند رۆژ تێپەڕی، هەموو دانیشتوانی ماڵ وەخۆ کەوتبوون. دەچوونە بازاڕ و دەهاتنەوە. دوو دەست جلیان هەڵگرت، تونگە، شەربە، تورمە، گوڵاوپاش، ئاوخۆریی، ئارەقچن، سووراوسپیاو، وەسمەجۆش، سەماوەری





زەرد، پەردەی قـەڵەمکار و هەمـوو شـتـێکیـان کرِی و چونکە دایکی بە حـەسـرەتـەوە بوو ئەوەی لە وردەواڵە و خـرت و پرتی نێـو مـاڵی وەگـیـر دەکـەوت بـۆ گـیـازی مـارِوخی وەلا دەنا. تەنانەت بەرِمـاڵی تورمـەیی کـە ئابجی خانم چەند جار لە دایکی داوای کردبوو و نەیدابوویە، بۆ مارِوخی دانا. ئـابجی خـانم لـەم چەند رۆژە دا بێـدەنگ و کـرِ لـە بنەوە دەیرِوانیـە هەموو کارێک و هەموو شتێک. دوو رۆژ بوو کە خۆی لە سـەرێشە دابوو و خەوتبوو، دایکیشی پەیتاپەیتا سەرکۆنەی لێدەدا و دەیکوت:

« ئەدی خـوشکایـەتی بۆ چ رۆژێکی باشـە ها؟ دەزانم لە حـەسـوودییـانە، حەسـوود بە کـاو و مرادی ناگا، خۆ جوانیی و ناحەزیی بە دەست من نیـە کاری خودایە. دیتت خـۆ ویسـتم بتدەم بە کەلب حـوسـێن بەڵام تۆی بە دڵ نەبوو. ئێسـتـاش بە قەسـتی خۆت لە نەخـۆشی داوە هەتا دەست لە رەش و سپی نەدەی. لە بەیانی هەتا شـەوێ خۆتم بۆ لە مـوسـڵمـانەتی دەدەی! من بێچارەم کە دەبێ بەم چاوە کەم سۆمایانەم درووما‌نێ بکەم! »

ئابجی خـانمیـش بەم ئێـرەییـەی کـە لە سـەر دڵی خـرِ ببـۆوە خـۆی دەخواردەوە و لە بن لیفەوە وڵامی دەداوە:

« باشــە، باشــە، ئاخـری عـومـرت داغ بە دڵی سـەهـۆڵەوە دەنێی! بەم زاوایەی کە دیتـووتەوە! لە قوونی هەر سەگێکی هەڵدەی هـاوتای عـەبباسـی لێــدەردەپەرِێ، چ تیـر و تـانەیەکم لێـدەدا، بـاشــە هـەمــوو کــەس دەزانێ عەبباس چ کارەیە. چەلێ لەوەی گـەرِێن کە مارِوخ زگی دوومانگە پرِە، من خـۆم دیتم کـە زگی هـاتۆتە سـەر بەڵام وە رووی خـۆم نـەهێنا. مـن ئەو بە خوشکی خۆم دانانێم ... »

دایکی دەرهەڵدەبوو: « رەببـی لاڵ بی، خودا بتبـاتەوە، داغت لە سـەر دڵم بمێنێ کـچـەتیـوە بێشـەرمـە، برۆ جـەهـەننەم بە، دەتەوێ کـچـەکەم عـەیبدار بکەی؟ دەزانم ئـەوانە ئی دڵ تۆقـینە، تـۆ بشـمـری بەو شـوبار و قـەڵافـەتە کـەس ناتهێنێ. ئێسـتا لـە داخـان بوختـان بۆ خـوشکەکەت هەڵدەبەسـتی؟ مەگـەر بۆ خۆت نەتکوت خودا دە قـورئانی خۆی دا نووسـیـویەتی کە درۆزن کـەززابـە هـا؟ خـودا روحـمـی کرد کـە تۆ جـوان نـەبووی دەنا هـەر ئەودەمـەی





کە بە بیانووی وەعز لە ماڵ دەردەکەوی دەکرا قسەت بۆ ساز کەن. برۆ، برۆ ئەم هەموو نوێژ و ڕۆژوویەت لەعنەتێکی شەیتانیش ناهێنێ، هەمووی بۆ خەڵک هەڵخەڵەتاندن بوە! »

لەم چەشنە قسانە لە ماوەی ئەم چەندە ڕۆژە دا دەکوترا. ماڕوخیش مات چاوی لەم دمەقاڵە دەکرد و هیچی نەدەکوت هەتا شەوی مارەیی داهات. هەموو هاوساکان و ژنە شەلەختەکان بە برۆی وەسمەکێشراو، سووراوسپیاوکراو بە چارشێوی گوڵدۆزیکراو، چەتری زولف و خەرگەوە کۆ ببوونەوە. لەم بەینە دا دایکی حەسەن مەیدانی کەوتبوو دەست، فێڵەزانانە، بە بزەوە ملی خێچ دەکرد و تەپڵی لێدەدا و ئەوەی دە بارانی دابوو دەیکوت:

« ئەی تەدارەک بێ مەبارەک، یارەبی لێت بێ مەبارەک! »

« زاوا لە بووکێ مەدە، توخودا لە بووکێ مەدە

ئەگەر لە بووکێ بدەی، تێک دەچێ دەسرە و شەدە »

ئەوانەی پەیتاپەیتا دەکوتەوە، دەهاتن و دەچوونە سەر حەوز و خۆڵەمێشیان دە مەجوعەمە هەڵدەسوو، بۆنی قاورمەسەوزیی وڵاتی داگرتبوو. یەک لە ئاشپەزخانە ختەی لە پشیلە دەکرد، یەکێک هێلکەی بۆ شۆرباوهێلکە دەویست. چەند منداڵی چووک لێک کۆ ببوونەوە و کایەی دایە مەمدە بە گورگیان دەکرد. ئەو سەماوەرە مسوارانەی کە بە کرێ هێنابوویانەوە، پێوەیانەوەنا. بە هەڵکەوت خەبەریان دا کە خانمەکەی ماڕوخیش دەگەڵ کچەکانی دێنە مارەیی. لە سەر دوو مێزیش شیرنی و میوەیان چنی و دوو سەندەڵییان لە بەر هەر کامیان دانا. باوکی ماڕوخ دەهات و دەڕۆیشت و بیری دەکردەوە کە خەرجێکی زۆری کەوتۆتە سەر دەست، کەچی دایکی پەڵپی پێگرتبوو کە بۆ سەری شەوێ پەردەبازیی پێویستە. بەڵام لەم هات و هەرایە دا باسێک لە ئابجی خانم نەبوو. لە دووی نیوەڕۆیەوە ڕۆیشتبوو دەر و کەس نەیدەزانی لە کوێیە، لەوانەیە چووبوو پای وەعز!

کاتێک لالەکان هەڵبوون و مارەیی بڕاوە و هەموو ڕۆیشتبوون جگە لە





دایکی حەسەن، دەستی بووکیان دە دەستی زاوا نابوو و لە دیوی پێنجەدەریی دانیشتبوون و دەرگاکان داخرابوون، ئابجی خانم وە ماڵ کەوتەوە. یەکسەر چوە ژووری پەنا پێنجەدەریی هەتا چارشێوەکەی لێکاتەوە. کە چوو ژووریّ دیتی کە پەردەی دیوی پێنجەدەرییان کێشاوە. لەبەر پرساییەک کە هەیبوو سووچی پەردەی لادا. لە پشت شووشەوە دیتی کە خوشکەکەی مارۆخ خۆی رازاندۆتەوە، وەسمەی کێشاوە، لە بەر شۆقی چرا جوانتر لە جاران لە پەنا زاوا کە لاوێکی بیست ساڵە دیاری دەدا لە بەر ئەو مێزەی کە شیرنی لە سەر بوو، دانیشتبوون. زاوا دەستی دە نێوقەدی مارۆخ کردبوو و شتێکی پێکوت وەک ئەوەی کە ئەویان دیبێ، لەوانەشە خوشکەکەی ئەوی ناسیبێتەوە بەڵام بۆ ئەوەی کە بیچڕزێنێ پێکەنین و رووی یەکتریان ماچ کرد. لە بنەبانی حەسار دەنگی تەپڵی دایکی حەسەن دەهات کە دەیکوت: « ئەی تەدارەک بێ مەبارەک، یارەبی لێت بێ مەبارەک! » هەستکی تێکەڵ بە رق و ئێرەیی ئابجی خانمی داگرت. پەردەی داداوە، چوە لە سەر دەستەنوێنێک کە لە پەنا دیوار دایاننابوو دانیشت بێ ئەوەی کە چارشێوی رەش لە خۆی بکاتەوە دەستەکانی وە بن چەنەگەی دابوو و چاوی لە عەرز دەکرد و لە نەخش و گوڵی مافووره زەق ببۆوە. ئەوانی دەژمارد و بە شتێکی تازەی دەهاتە بەر چاو و لە رەنگەکەیان خورد دەبۆوە. هەرکەس هاتبا رۆیشتبا ئەو نەیدەدیت یا سەری هەڵنەدێنا کە بزانێ کێیە. دایکی هاتە بەر دەرگای ژوور و پێیکوت: « بۆ شێو ناخۆی؟ بۆ رەزای خۆت گران دەکەی ها، بۆ لێرە دانیشتووی؟ ئەو چارشێوە رەشە لە خۆت بکەوە، بۆ خۆت بەدقەدەم دەکەی؟ وەرە رووی خوشکت ماچ کە، وەرە لە پشت شووشەوە چاو لەو بووک و زاوایە بکە دەڵێی مانگن، مەگەر تۆ حەسرەتت دە دڵ دانیە؟ وەرە ئاخر تۆش شتێک بڵێ ئاخر هەموو دەیانپرسی کوا خوشکەکەی؟ من نەمدەزانی چ وڵامێک بدەمەوە. »

ئابجی خانم سەری بەرز کردەوە و کوتی: « من شێوم خواردوە. »

.............................................................





نیوەشەو بوو، هەموو بە یادی زەماوەندی خۆیان خەوتبوون و خەونی خۆشیان دەدیت. لەپڕ وەک ئەوەی کە کەسێک دە ئاو دا پەلەقاژەی بکا، دەنگی شڵپەشڵپ هەموو خەڵکی نێو ماڵی لە خەو راپەڕاند، دە پێش دا پێیانوابوو پشیلە یا منداڵ دە ئاوی حەوز کەوتوە و سەرڕووت و پێخواس چرایان هەڵکرد. هەموو جێیان پشکنی بەڵام شتێکی تایبەت نەقەومابوو. کاتێک ویستیان بگەڕێنەوە و بخەون دایکی حەسەن دیتی تەقتەقیلەکانی ئابجی خانم لە بەر دەربیجەی ئەنباراو کەوتوون. چرایان بردە پێشەوە و دیتیان کەلاکی ئابجی خانم کەوتۆتە سەر ئاو، پرچە هۆنراوەکانی وەک مار دە ملی هاڵابوو، کراسە کەسکەکەی بە لەشییەوە نووسابوو، روخساری حاڵەتێکی بەشکۆ و نوورانی هەبوو وەک ئەمە بوو کە چووبوو جێگایەک کە نە ناحەزیی و نە جوانیی، نە شایی و نە شین، نە پێکەنین و نە گریان، نە شادیی و نە غەم لەوێ نەبوو. ئەو چووبوو بەهەشت!





هەموو خەڵکی شیراز دەیانزانی کە داش ئاکۆل و کاکا روستەم بە خوێنی سەری یەک تینوون. رۆژێک داش ئاکۆل لە سەر سەکۆی قاوەخانەی **دوو میل** هەڵتروشکابوو، هەرئەو شوێنەی کە مەکۆی هەمیشەیی بوو. قەفەسی هەوێردەکەی کە پارچەیەکی تەنکی سووری پێدادابوو، لە پەنا خۆی دانابوو و بە سەری قامکی سەهۆڵی لە پەرداخێک ئاو دا دەخولاندەوە. لە پڕ کاکا روستەم وەژوور کەوت، بە سووکی چاوێکی لەو کرد و هەروا کە دەستی دەبەر پشتبەندی نێوقەدی نابوو چوو لە سەر سەکۆی بەرامبەری دانیشت. دوایە رووی دە شاگردقاوەچی کرد و کوتی:

« دا ک ک کوڕە، چ چایەکی بێنە بزانم. »

داش ئاکۆل چاوێکی پڕ مانای لە شاگرد قاوەچی کرد وەها کە چاوی خۆی خورد کردەوە و گوێی خۆی لە داوای کاکا ئاخنی. ئیستکانەکانی لە جامی زەرد دەردێنا و لە سەتڵی ئاوی هەڵدەکێشا و دوایە دانە دانە و لە سەرەخۆ ویشکی دەکردنەوە. لە بەر سڕینەوەی شووشەی ئیستکانەکان بە خاوڵی، کرەکرِ هەڵدەستا.





کاکا روستەم لەم بێ گوێییە تووڕە بوو، دیسان هەرای کرد:
« مەمەمەگەر کەری! دەدەگەڵە تۆم نیە؟! »
شاگردقاوەچی بە بزەیەکی تێماو روانیە داش ئاکۆل و کاکا روستەم ددانەکانی دەچیرەوە برد و کوتی:
« بەبە بە سەری بابیان، ئەوانەی ق ق قسەی زەلام دەکەن ئەگەر لۆلۆتین ئەئەوشۆ دێن و زۆرەبانی دەگرین! »
داش ئاکۆل هەروا کە سەهۆڵی لە پەرداخەکە دا دەگەڕاند و لە بنەوە ئاگای لە دەوروبەری بوو پێکەنینێکی زۆردارانەی کرد وەها کە ریزێک ددانی سپی قایم لە ژێر سمێلی خەنە لێدراوی بریقەی هات و کوتی:
« خوێڕییەکان هات و هاواریان هەیە، ئەودەم روون دەبێتەوە پیاو و ناپیاو کێیە. »
هەموو پێکەنین، نە لەبەر زمان گێرانی کاکا روستەم، چونکە هەموو دەیانزانی کە ئەو زمانی دەگیرێ، بەڵام داش ئاکۆل لە شار دا وەک گای بەش ناودار بوو و هیچ لۆتییەک نەمابوو کە چینێکی لە دەست نەخواردبێ، هەموو شەوانە ئەودەم کە لە ماڵە مەلا ئیسحاقی جوولەکە قاپێک ئارەقی دووکولّی پێدا دەکرد و لە پێش گەڕەکی **سەردووزەک** رادەوستا، کاکا روستەم سەهڵە، ئەگەر حەوت پشتیشی هاتبا دەبەزین. کاکا بۆ خۆشی دەیزانی کە پیاوی مەیدان و حەریفی داش ئاکۆل نیە، چونکە دوو جاران بریندارى کردبوو و سێ چوار جاریش ئەژنۆی لە سەر سێنگی داکوتابوو. چەند شەو لەوە پێشیش کە کاکا روستەمی چارەڕەش مەیدانی چۆل دیتبوو و تەپ و تۆزێ وە حەوا خستبوو، داش ئاکۆل وەک ئەجەل گەیشتبوە سەری و کۆڵێک لاتاوی پێدا دابوو و پێیکوتبوو:
« کاکا، پیاوەکەت لە ماڵ نیە. وا دیارە تریاکت پتر کێشاوە، چاکی لوول کردووی. دەزانی چیە، ئەو کارە چەپەڵ و خوێریانە وەلانێ، خۆت لە لاتێتی داوە، خەجاڵەتێ ناکێشی؟ ئەوەش جورێک سواڵکەرییە کە کردووتە پیشەی خۆت. هەموو شەوی خودا بەری خەڵک دەگری؟ بە **پووریای وەلی** سوێند ئەگەر جارێکی دیکە بەدمەستێ بکەی سمێڵت هەڵدەپاچم، بەو





کێردە دوو لەتت دەکەم. »

ئەودەم کاکا روستەم کلکی دە نێو گەڵۆزی گرت و رۆیشت، بەڵام رقی داش ئاکۆلی لە دڵ نا و لە بیانوویەک دەگەڕا هەتا تۆڵەی لێبکاتەوە.

لە لایەکی دیکەوە هەموو خەڵکی شیراز داش ئاکۆلیان خۆش دەویست. چونکە هەر ئەودەمەش کە بەر گەڕەکی **سەردووزەکی** داگیر دەکرد، کاری بە کاری ژن و منداڵانەوە نەبوو، بە پێچەوانە دەگەڵ خەڵک زۆر بە نەرمی دەجوولاوە و ئەگەر بەخت وەرگەڕاوێک گاڵتەی بە ژنێک کردبا یا کەڵەگایی لە کەسێک کردبا ئیتر بە سلامەت گیانی لە دەست داش ئاکۆل نەدەبردە دەر، زۆر جار دەدیترا کە داش ئاکۆل دەستی خەڵکی دەگرت، دەستاوەڵە بوو و ئەگەر لە سەری دابا باری خەڵکیشی دەگەیاندەوە ماڵێ.

بەڵام چاوی وەی نەبوو کەس لە خۆی سەرتر ببینێ، ئەویش کاکا روستەم کە رۆژێ سێ مسقاڵ تریاکی دەکێشا و هەزار ئەدا و ئەتواری دەردێنا. کاکا روستەم لەو سووکایەتییەی کە لە قاوەخانە پێیکرابوو وەک ژەهری مار دانیشتبوو، سمێڵی دەجووت و ئەگەر چەقۆت لێدابا خوێنی لێنەدەهات. دوای ماوەیەک پێکەنینەکان بڕانەوە و هەموو ئارام بوونەوە جگە لە شاگردقاوەچی کە بە کراسی بەرۆک ئاوەڵە و کلاو و شاڵواریەوە دەستی لە سەر زگی دانابوو و وەک مار لە خۆی هالابوو و پتر لە خەڵکی دیکە بە کەنینی ئەو پێدەکەنی. کاکا روستەم هەڵچوو، دەستی دایە قەندانی بلوور و بە سەری شاگردقاوەچی دادا. کەچی قەندان وە سەماوەر کەوت و سەماوەر لە سەر سەکۆوە بە چادانەوە کەوتە زەوی و چەند فینجان شکان. دوایە کاکا روستەم هەستا، تووڕە و تۆسن لە قاوەخانە وەدەرکەوت.

قاوەچی بە شێواویی چاوی لە سەماوەر کرد و کوتی:

« روستەم بوو بەو دەست و چەکە، ئێمە و ئەم سەماوەرە کەتە. »

ئەو وتەیەی بە لەونێکی غەمینەوە کوت، بەڵام چونکە لاتاوی لە روستەم دابوو، خەڵک پتر پێکەنین. قاوەچی لە داخان شالاوی بۆ شاگردەکەی برد،





بەڵام داش ئاکـۆڵ بە بزەوە دەسـتی لە گـیـرفـان نـا و توورەکـەیەکی پارە دەرهێنا و بۆی هـاویشت.

قاوەچی توورەکەکەی هەڵگرتەوە، هەڵیسەنگاند و بزەی هاتێ.

لەو کەین و بەینە دا پیاوێک بە پەستەکی مەخمەر، پاتۆڵی فش، کڵاوی چووکی لباد هەراسان هاتە قاوەخانە، چاوێکی لە دەورووبەر کرد، چوە پێش داش ئاکۆڵ و سڵاوی کرد و کوتی:

« حاجی سەمەد عەمری خودای کرد. »

داش ئاکۆڵ سەری هەڵێنا و کوتی:

« خودا عافووی کا! »

« مەگەر ئێوە نازانن کە وەسیەتی کردوە. »

« من کە ماڵـی مردووخۆر نیم. بـڕۆ مردووخۆرەکان بانگ کە. »

« ئاخر ئێوەی کردۆتە وەکیل و وەسی خۆی... »

دەتکوت بەو قسەیە هەودای داش ئاکۆڵ ئاڵۆز بوو، دیسان چاوێکی لە سەر و گوێلاکی کرد، دەستی بە نێوچاوانی داهێنا، تەپڵەی کۆمی وەک هێلکەی چوە دواوە و نێوچاوانی زەقی وەدەرکەوت کە نیوەی تاوەسووت و قاوەیی ببوو و نیوەی دیکە کە لە بن کڵاو بوو سپی مابوو. دوایە سەری لەقاند، سەبیلەی دەسک خاتەمی خۆی دەرکێشا، لە سەرەخۆ تووتنی تێکرد و بە قامکە گەورەی دایگرتەوە، دایگیرساند و کوتی:

« خودا حاجی عافوو کا، هەرچێکی بوو گوزەرا، بەڵام کارێکی باشی نەکرد ئەمەی تووشی گێچەڵ کرد. باشە، ئەتۆ برۆ، من بە دوات دا دێم. »

ئەو کەسەی کە هاتبوو پاکاری حاجی سەمەد بوو و خێرا وەدەرکەوت.

داش ئاکۆڵ چرژ و نێوچاوانی تێکنا، لەخۆوە مژی لە سەبیلە دەدا و دەتکوت کە بەری هەوای پێکەنین و شادیی قاوەخانە بە هەوری رەش داپۆشرا. دوای ئەوە کە داش ئاکۆڵ سووتووی سەبیلەکەی رشت، هەستا قەفەسی هەوێردەکەی سپاردە دەست شاگردقاوەچی و لە قاوەخانە وەدەرکەوت.

کاتێک داش ئاکۆڵ گەیشتە حەوشی حاجی سەمەد، پرسە تەواو ببوو،





تەنیا چەند قورئانخوێن و بەردەستەکانیان لە سەر پارە کێشەیان بوو. دوای ئەوە کە تاوێک لە دەم حەوز چاوەڕوان بوو، ئەویان بردە دیوێکی گەورە کە پەنجەرە شووشەبەندەکانی بەرەو حەسار کرابوونەوە. خانم هاتە پشت پەردە و دوای سڵاو و چاک و خۆشی ئاسایی داش ئاکۆل لە سەر دۆشەگ دانیشت و کوتی:

« خانم بۆ خۆتان سڵامەت بن، خودا لە منداڵەکانتان خۆش بێ. »

خانم بە دەنگێکی نووساو کوتی:

« هەر ئەوشەوەی کە حاجی حاڵی تێکچوو، چوون ئیمامی جومعەیان هێنا بان سەری و حاجی لە بەر چاوی هەموویان ئێوەی کردە وەکیل و وەسی خۆی، لەوانەیە پێشتر حاجیتان ناسیبێ؟ »

« پێنج ساڵ لەمەوبەر لە سەفەری کازروون پێکەوە ناسیاو بووین »

« حاجی رەحمەتی هەمیشە دەیکوت ئەگەر پیاوێک هەبێ فلانییە. »

« خانم، من ئازادی خۆم لە هەموو شتێک خۆشتر دەوێ، بەڵام ئێستا کە ئەرکی مردوو کەوتۆتە سەر ئەستۆم، سوێند بە تیشکی هەتاو ئەگەر نەمرم بە هەموو ئەو کەلەم بەسەرانە نیشان دەدەم. »

دوایە هەروا کە ئاوڕی داوە، لە کەلێنی پەردەیەکی دیکەوە کیژێکی روو سوورهەڵگەڕاوی بە چاوی رەش و گەشیەوە بینی. دەقیقەیەکی نەکێشا کە چاویان تێکبڕی، بەڵام کیژ دەتکوت شەرمی کرد، پەردەی داداوە و کشاوە دواوە. ئاخۆ ئەم کیژە جوان بوو؟ لەوانەیە، بەڵام بە هەر حاڵ چاوە گەشەکانی کاری خۆیان کرد و داش ئاکۆلیان تێکدا، ئەو سەری داخست و سوور هەڵگەڕا.

ئەم کیژە مەرجان، کچی حاجی سەمەد بوو کە بۆ سەرەتاتکێ هاتبوو داش ئاکۆل، ناسیاوی شار و قەییومی خۆیان ببینێ.

داش ئاکۆل لەو رۆژەوە خەریکی پێڕاگەیشتن بە کارەکانی حاجی بوو، دەگەڵ سمسارێکی شارەزا، دوو لۆتی گەڕەک و میرزایەک هەموو شتیان بە وردیی نووسی و پێرستیان هەڵگرت. ئەوەی زیادە بوو لە ئەنباری نا. دەرکەکەی قفڵ و مۆر کرد، ئەوەی بە کەلکی فرۆتن دەهات فرۆشتی. دای





قـەباڵەی مـڵکەکـانیـان بۆ خـوێندەوە، قـەرزەکـانـی وەرگـرتـەوە و ئەوەی لە سـەری بوو دایەوە، هەمـوو ئەو کـارانەی بە دوو شـەو و ڕۆژان جێـبـەجێ کـرد. شـەوی سـێـهـەم داش ئاکـۆل مـاندوو و شـەکەت بە نـزیک چوارڕێی سـەید حـاجی غـەریب دا دەچۆوە مـاڵێ لە ڕێیـە تووشـی ئیـمام قولّی قفڵ ساز بوو و کوتی:

« ئەوە دوو شـەوە کاکا ڕوسـتـەم چاوەڕێی تۆیە. دوێنێ شـەوێ دەیکوت کابرا چاک لە قۆچەقانی ناین، پێموایە قەولەکەی لە بیر چۆتەوە! »

داش ئاکۆل دەستی بە سمێلی داهێنا و کوتی:

« گوێی مەدەیە! »

داش ئاکـۆل چاکی لە بیـر بوو کـە سـێ ڕۆژ لەمـەوپێش لە قـاوەخـانەی **دوومـیل** کـاکـا ڕوسـتــەم خـەت و نیـشـانی بۆ کـێـشـا بوو، بەڵام چـونکە غـەنیـمـەکـەی دەناسی و دەیزانی کـە کاکا ڕوسـتـەم دەگـەڵ ئیـمـام قـولّی سازاوە هـەتا ڕووی ئەو کەم کەنەوە، زۆر گـوێی نەدایە، ڕێی خۆی گرتە بەر و ڕۆیـشت، لـە ڕێ دا هـەمــوو هـۆشی لـە ســەر مــەرجــان بـوو، هـەرچـی دەیەویست سـیـمـای ئەو لە بـەر چاوی دوور خـاتەوە پـتـر و توندتر دەهاتە بەر زەینی.

داش ئاکۆل پیاوێکی سی و پێنج ساڵە، کەڵەگەت بەڵام ناحەز بوو. هـەر کەس بۆ یەکەم جـار دیتبای لە قیافـەی دەسڵەمیـەوە، بەڵام ئەگەر کەڕەتێک لە کۆڕی قسە کردنی دانیشتبا یا چیرۆکانـی سەردەمی ژیانی کە لە سەر زمـانان بوون بیـسـتـبـای، گـیـرۆدەی دەبوو، ئەگـەر ئەو برینە خـوار و خـێـچـانەی قـەمـە کـە وە ڕووی کەوتبـوون، لە بەر چاویـان نەگـرتبـا، داش ئاکۆل قـیافـەیەکی نـەجیب و ڕاکـێشـەری هـەبوو: چاوی کـاڵ، برۆی ڕەشـی پڕ، ڕوومــەتی پان و کـەپۆی باریک بـە ڕیش و سـمـێـڵـێکی ڕەشـەوە. بەڵام برینەکان کـاریان خراپ کردبوو، لە سەر ڕوومـەت و نێوچاوانی جێ برینی قـەدارە دەدیـترا کـە نارێک وێک هاتبـوونەوە و گـۆشـتـی سـوور لە نێـوان خەتەکـانی ڕووی دا بریقەیان دەهات و لە هـەمـوان پیستر یەک لە وان پەنا چاوی چەپی داکێشابوو خوارەوە.





باوکی ئەو یەکێک لە زەویدارە گەورەکانی فارس بوو، کاتێک کە مرد هەموو ماڵی بە کوڕی تاقانەی گەیشت. بەڵام داش ئاکۆل دەستاوەڵە و دەستبڵاو بوو، بایەخی بۆ پووڵ و ماڵی دنیا دانەدەنا، ژیانی لە سەر جوامێریی و ئازادیی و گەورەیی و بەخشینەوە دانابوو. هیچ هۆگریەکی دیکەی لە ژیان دا نەبوو و هەموو ماڵی خۆی بە هەژار و نەدار و بێ ئەنوا بەخشی، یا ئارەقی دووکوڵی دەخواردەوە و لە سەر چوارڕێیان دەینەڕاند و یا لە بەزم و شایی دەگەڵ تاقمێک ئاواڵی هەژگەڵ خەرجی دەکرد.

هەموو عەیب و چاکەی ئەو بەوەندە دەبڕاوە، بەڵام شتێکی کە سەیر دەهاتە بەرچاو ئەوە بوو کە هەتا ئێستا ئەوین و ئەویندارییی پێی دە ژیانی ئەو نەنابوو. چەند کەڕەتیش کە ئاواڵەکانی چوونە بنیەوە و بە نەهێنی ژنیان هێنابۆوە ئەو هەمیشە خۆی پاراستبوو. بەڵام لەو ڕۆژەوە کە ببوو بە وەکیل و وەسی حاجی سەمەد و مەرجانی دیت، لە ژیانی دا ئاڵوگۆڕییەکی تەواو پێکهات، لە لایەکەوە ئەرکی مردووی لە سەر شان بوو و خۆی بە بەرپرس دادەنا و لە لایەکی دیکەوە گیرۆدەی مەرجان ببوو. بەڵام ئەم ئەرکە پتر لە هەموان ئازاری دەدا ـ کەسێک کە ماڵی خۆی بە با دابوو و لە بەر کەمتەرخەمیی هەندێکی ئاگر دابوو، هەموو ڕۆژێ بەری بەیانی کە هەڵدەستا لە بیری ئەمە دابوو کە داهاتی زەوی حاجی پتر کا. ژن ومنداڵەکانی ئەوی بردە ماڵێکی چووکتر، ماڵەکەیانی بە کرێ دا، مامۆستای بۆ منداڵەکان هێنا سەر ماڵ، پووڵەکەی وەگەڕ خست و لە بەیانیەوە هەتا شەوێ خەریکی هاڵات هەڵاتێن و پێڕاگەیشتن بە ماڵ و مڵکی حاجی بوو.

لەوە بەدوا داش ئاکۆل لە شەوگەڕیی و سەر چوارڕێ گرتن خۆی دوور خستەوە. ئیتر دەگەڵ ئاواڵەکانی وێک نەدەکەوتن و مەیلی جارانیشی نەمابوو. بەڵام هەموو لۆتی و لاتەکان کە رقەبەرەیان دەگەڵ هەبوو و بە دنەی مەلایان دەستیان لە ماڵی حاجی کورت ببۆوە، هەلیان بۆ رەخسابوو و فریان داویشتە داش ئاکۆل و قسە و باسی ئەو ببوو بە نەقڵی کۆڕ و قاوەخانەکان. لە قاوەخانەی **پاچنار** زۆرجار لاتاویان پێدادەدا و دەکوترا:





« داش ئاکۆلی دەڵێی؟ دمی گوڵە لێی داوە، کێ بە سەگی دادەنێ؟ فلانی چاک بۆی دەرچوو، لە ماڵە حاجی کلکە سووتەی دەکا، دەڵێی شتێکی هەڵدەکرێنێ، ئێدی هەر دەگاتە گەرەکی سەر دیزەک کلکی دە گەڵۆزی دەنێ و تێی دەقوولێنێ. »

کاکا روستەم بەو رق و گریمانەی کە دە دڵی دابوو بە زمانی پسکی دەیکوت:

« بە سەری پیری بۆم ئاشق بوە! کێردەکەی داناوە! خەڵکی هەڵخەڵەتاند و قسەی قۆڕی دە زاران خست هەتا خۆی کردە وەکیلی حاجی و هەموو ملکەکەی هەڵلووشی. بە زیاد بی شانس و بەخت. »

داش ئاکۆل ئیتر وچەی جارانی نەمابوو و کەس ئاردی بە کلاوی نەدەپێوا. دەچوە هەر کوێ خەڵک سرتەسرتیان دەکرد و پێیان رادەبوارد. داش ئاکۆل لێرە و لەوێ ئەم قسانەی دەبیستەوە بەلام وە رووی خۆی نەدێنا و گوێی نەدەبزووت، چونکە ئەوینی مەرجان وەها لە گیانی دا رەگاژۆ ببوو کە کار و بیرێکی جگە لەوە نەبوو.

شەوانە لە بەر شێواویی ئارەقی دەخواردەوە و بۆ خۆ خافلاندن تووتییەکی کڕیبوو. لە بەر رکەی دادەنیشت و دەردی دڵی بۆ تووتی هەڵدەڕشت. ئەگەر داش ئاکۆل خوازبێنی لە مەرجان کردبا دایکی لە حەوا لە سەر دوو دەستان مەرجانی پێشکێش دەکرد، بەلام لە لایەکی دیکەوە ئەو نەیدەویست کە خۆی بە ژن و منداڵەوە ببەستێتەوە، دەیەویست ئازاد بێ، هەر ئەو جۆرەی کە راهاتبوو. جگە لەوە لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە کە ئەگەر ئەو کیژەی کە بەویان سپاردوە بیخوازێ سپڵەیی و ناندێن دڕاندنە، لە هەموان خراتر هەموو شەوێ لە ئاوێنە دا چاوی لە خۆی دەکرد، شوێنی خۆ گرتنەوەی برینەکانی قەمە، سووچی چاوی داچۆڕاوی خۆی هەڵدەسەنگاند و بە دەنگێکی گڕ، بەرز دەیکوت:

« بەشکەم منی خۆش نەوێ! بەڵکەم مێردێکی جوان و جەوان ببینێتەوە... نا، لە پیاوەتی بە دوورە... ئەو چاردەساڵیەتی و من چل و چوار ساڵ... بەلام چ بکەم؟ ئەو ئەوینە من دەکووژێ... مەرجان... تۆ منت





کوشت... بە کێ بڵێم؟ مەرجان... ئەوینی تۆ منی کوشت..!»

فرمێسک لە چاوی دا قەتیس دەماوە و پەیتاپەیتا ئارەقی دەخواردەوە. ئەودەم بە سەرئێشەوە هەروا کە دانیشتبوو خەو دەیبردەوە.

بەڵام نیوەشەوان، ئەودەم کە شاری شیراز بە کۆڵانە خوار و خێچەکانی، باغی خەمڵاو و شەرابە ئاڵەکانیەوە دەخەوت، ئەودەم کە ئەستێرەکان ئارام و بە راز و رەمز لە سەر ئاسمانی وەک قیر چاویان لە یەکتر دادەگرت، ئەودەم کە مەرجان بە کوڵمی وەک گوڵی لە جێ دا ئارام هەناسەی هەڵدەکێشا و ژیانی رۆژانەی بە بەر چاو دا تێدەپەڕی، ئەوکات بوو کە داش ئاکۆلی راستیی، داش ئاکۆلی ئاسایی بە تەواوی هەست و هەوا و هەوەسییەوە، بێ هیچ شەرمێک لە نێو توێژێک کە داب و نەریتی کۆمەڵ پەرژینی لێدابوو، لە نێو بیر و باوەڕێک کە لە منداڵییەوە دە مێشکیان ئاخنیبوو، دەهاتە دەر و بە ئازادیی مەرجانی یەک بە خۆ لە هەمێز دەگرت، کورکەی دڵ، لێوی ئاگرین و لەشی نەرمی هەست پێدەکرد و کوڵمەکانی رادەمووسی. بەڵام کاتێک لە خەو رادەپەڕی، جوێنی بە خۆ دەدا، تووکی لە ژیانی دەکرد و دیناسا لە ژووریٚ دا لە دەوری خۆی دەخولاوە، بە ورتە قسەی دەگەڵ خۆی دەکرد و پاشماوەی رۆژیش بۆ ئەوەی بیری ئەوین لە خۆی دا بکووژێ خەریکی هەڵات هەڵات و پێڕاگەیشتن بە کارەکانی حاجی دەبوو.

حەوت ساڵ بەم جۆرە تێپەڕی، داش ئاکۆل لە پێڕاگەیشتن و لێبوردوویی بە ژن و منداڵی حاجی کۆتایی نەکرد. ئەگەر یەکێک لە منداڵەکانی حاجی نەخۆش دەکەوت شەو و رۆژ وەک دایکێکی دڵسۆز شەونخوونی لە سەر دەکێشا و هۆگریان ببوو، بەڵام هۆگریی ئەو بە مەرجان شتێکی دیکە بوو و لەوانەیە هەر ئەوینی مەرجان بوو کە ئەوی ئارام و دەستەمۆ کردبوو. لەم ماوەیە دا هەموو منداڵەکانی حاجی پێگەیشتبوون و خڕۆکە ببوون.

بەڵام، ئەوەی کە نەدەبا بووبا بوو و پێشهاتێکی گرینگ رووی دا: مەرجان خوازبێنی بۆ پەیدا بوو، ئەویش چ مێردێک کە هەم پیرتر و





هەمیش دزێوتر لە داش ئاکۆڵ بوو. داش ئاکۆڵ وە رووی خۆی نەهێنا و بە پێچەوانە زۆر لە سەرەخۆ خەریکی تەیار کردنی گیاز بوو و بۆ شەوی مارە کردن داوەتێکی شایەنی بۆ گرت. ژن و منداڵی حاجی دیسان بردەوە نێومالّی خۆیان و وەتاغی گەورەی شووشەبەندی بۆ میوانە پیاوەکان تەرخان کرد، هەموو سەرزلەکان، تاجرەکان و دەمڕاستانی شاری شیراز بۆ ئەم زەماوەندە بانگێشتن کرابوون.

سەعاتی پێنجی دوای نیوەڕۆی ئەورۆژە، کاتێک میوانەکان لە دەورادەوری ژوورەکان لە سەر فەرش و مافوورەی پڕ بایەخ دانیشتبوون و خوانچەی شیرینی و میوەیان لە بەر چندرابوو، داش ئاکۆڵ بە هەمان سەر و سەکوتی لۆتیانەی کۆنی، بە پرچی لوولی شانە کراو، چاکەتی رێ رێ، قەدارەی نێو قەد، پشتبەندی گرێچن، پاتۆڵی دەبیتی رەش، کەلاشی ئابادە و تەپلەی تازە و نوێ وەژوور کەوت. سێ کەسیش بە دەفتەر و دەزگاوە بە دوای دا هاتنە ژوور. هەموو میوانەکان روانیانە سەر و سەکوتی. داش ئاکۆڵ بە هەنگاوی بڵێند چوە بەر ئیمام جومعە، راوەستا و کوتی:

« ئاغای ئیمام، حاجی رەحمەتی وەسیەتی کرد و حەوت ساڵی رەبەق ئەمەی توشی گێچەڵ کرد. کوڕی هەرە چووکی کە پێنج ساڵە بوو ئێستاکە دوازدە ساڵیەتی. ئەمەش حیسێب و کتێبی ماڵ و ملّکی حاجی. ( دەستی بۆ لای ئەو سێ کەسەی راداشت کە لە دواوەی بوون) هەتا ئەمڕۆش هەرچی خەرج بوە دەگەڵ خەرجی ئەمشۆ هەمووم لە گیرفانی خۆم داوە ئێستاش ئیدی من بە خێر و ئەوانیش بە سلامەت! »

کە گەیشتە ئێرە کوڵ بەری ئەوکی گرت. دوایە بێ ئەوەی شتێک لە قسەکەی زیاد کا یا چاوەڕێی ولاّم بێ، سەری داخست و بە چاوی فرمێسکاویی وەدەرکەوت. لە کۆلان هەناسەیەکی راحەتی هەڵکێشا، هەستی کرد کە ئازاد بوە و باری ئەرکی سەر شانی هەڵگیراوە، بەڵام دڵی شکاو و زامدار بوو. هەنگاوی خێرا و خۆڕایی هەڵدێناوە، هەروا کە دەرۆیشت ماڵە مەلا ئیسحاقی ئارەقسازی جوولەکەی ناسیوە. بێ سێ و





دوو به پلیكانه شێداره خشتیەكان دا چوه خوارێ و گەیشتە نێو حەوشێكی كۆنه و دووكەلاویی كه دەورانده‌وری دیوی پیسی چووكه بوو، كه به دەلاقه كون كونەكانیەوه وەك شانه هەنگ دەچوو و، سەر ئاوی حەوز لیتەی سەوز دایگرتبوو. بۆ ترش و برش و سارداوی كۆن له هەوا دا بلاو ببۆوه. مەلا ئیسحاقی لاواز به كلاوی میلی چڵكن و ردێنی بزنی و چاوی نێزی هاته پێش، بزەیەكی به قەستی كرد.

داش ئاكۆل بێواز كوتی:

« قوربانی ئەو جوته سمێلانەت بوترێكی هەره باشم دەیه گەرووی پێ تەڕ كەم. »

مەلا ئیسحاق سەری راوەشاند و به پلیكانەكانی ژێرخان دا چوه خوار و دوای چەند دەقیقه به بوترێكەوه هاته سەر. داش ئاكۆل بوتریەكەی لێوەرگرت و زاركی له كونی دیوار نا و سەری هەڵپچڕی، ئەوجار نیوەی پێداكرد، فرمێسك له چاوەكانی دا كۆ بوونەوه، بەری كۆخەی گرت و به پشت دەستی دەمی سڕیوه. كوڕی مەلا ئیسحاق كه مندالێكی زەردەڵەی چڵكن بوو، به زگی هەڵمساو و زاری داپچڕاو و چڵمی داچۆڕاوی چاوی له داش ئاكۆل دەكرد، داش ئاكۆل قامكی له سەره خوێدان دا كه له سەر تاقەی حەسار داندرابوو و ده زاری نا.

مەلا ئیسحاق هاته پێش، له سەر شانی داش ئاكۆلی كوتا و كوتی:

« مەزەی لۆتی خاكه! »

دوایه دەستی له پارچەی جلەكەی دا و كوتی:

« ئەوه چیه دەبەرت كردوه؟ ئەو چاكەته ئێستا ئیدی باوی نەماوه. هەركاتێكی نەتەویست من لێت هەڵدەگرمەوه. »

داش ئاكۆل به داماویی پێكەنی، له گیرفانی پارەكەی دەرهێنا، له بەری دەستی نا و له ماڵ هاته دەر. دەمەو ئێواره بوو. لەشی گەرم و بیری ئاڵۆز بوو و سەری دێشا. كۆلانەكان هێشتا له بەر بارانەی نیوەڕۆ شێدار بوون و بۆنی كاگڵ و بەهارنارنج له هەوا دا دەگەڕا، سیمای مەرجان، كولمه سوورەكانی، چاوه رەشەكانی و برژانگی درێژ بەو بسكەی كه





کەوتبوە سەرتەوێڵی دیار و نادیار هاتبوە بەر چاوی داش ئاکۆل. ژیانی رابوردووی خۆی وەبیر هاتەوە، یادگارە کۆنەکانی یەکەیەکە بە بەر چاوی دا تێدەپەڕین. ئەو گەشتانەی کە دەگەڵ ئاواڵەکانی لە سەر قەبری سەعدی و بابا کووهی کردبوویان وەبیری هاتەوە، جارجارە بزەی دەهاتێ، هەندێک جار مۆن دەبۆوە. بەڵام شتێکی کە لێی روون بوو ئەمە بوو کە لە ماڵە خۆی دەترسا، تاقەتی ئەو رووداوەی نەبوو، دەتکوت دڵی هەڵکەندرابوو، دەیەویست بڕوا و دوور بێتەوە. بیری کردەوە ئەمشەویش ئارەق بخواتەوە و دەگەڵ تووتی دەردی دڵ بکا! سەراسەری ژیان بۆی چووک و سووک ببوو. لەم دەمە دا شێعرێکی وەبیر هاتەوە، بە بێوازی ورتەیەکی لێوە هات:

« ئێرەیی دەبەم بە شەونشینی بەندییان
دەنکی زنجیرە شەوچەرەی
کۆڕیان »

هەوایەکی دیکەی وەبیر هاتەوە، هەندێک بەرزتری خوێندەوە:

« دڵم دێوانە بوو، ئەی ئاقڵان، زنجیرێ بۆم بێنن
کە چارەی نیە دین و شێت، لە زنجیری
بهاڵێنن »

ئەو شێعرەی بە لەونێکی هیوابڕاو و غەمینەوە خوێندەوە، بەڵام وەک ئەوەی کە وازی نەمابێ، یا بیری لە جێیەکی دیکە بێ بێدەنگ بوو.

تاریک ببوو کە داش ئاکۆل گەیشتە گەڕەکی **سەردووزەک**. ئێرە ئەو گۆڕاییە بوو کە پێشتر وەختێک هێز و وزەیەکی هەبوو داگیری دەکرد و کەس نەیدەوێرا بێتە پێش. لە خۆوە چوە سەر سەکۆی بەردینی بەر ماڵێک دانیشت، سەبیلەی دەرکێشا و دایگیرساند، بە کاوەخۆ دەیکێشا. وا هاتە بەر چاوی کە ئێرە خراپتر لە پێشوو بوە، خەڵک لە بەر چاوی گۆڕابوون، هەر ئەو جۆرەی کە خۆی شکاو و گۆڕابوو. چاوی رەشکە و پێشکەی دەکرد، سەری دێشا، لە نەکاو تارماییەک وەدیار کەوت کە لە دوورەوە بۆ لای دەهات و هەر کە نزیک بۆوە کوتی:





« لۆ لۆلۆتی شەوی تاریش دەیناسێتەوە.»

داش ئاکۆل کاکا روستەمی ناسیوە، هەستا، دەستی لە کەمەری دا، تفی رۆکرد و کوتی:

« بە سەری بابت خوێڕی، تۆ پێت وایە زۆر لۆتی، بەڵام غەڵەتت کرد شیرت لە مەمکی دایکت نەخواردوە! »

کاکا روستەم بزەیەکی گەپجاڕانەی هاتێ، هاتە پێش و کوتی:

« دەدەدەمێکە لەو دەودەورووبەرانە دیار نی! ئە ئەئەوشۆ لە ماماماڵی حاجی مارە کردنە، مەمەمەگە تۆیان رێ رێ نەنەدا... »

داش ئاکۆل قسەی بڕی:

« خودا تۆی ناسی کە نیوەی زمانی دایەی، ئەو نیوەی دیش من دەمەوێ ئەوشۆ بیبڕم. »

دەستی برد و کێردی هەڵکێشا. کاکا روستەمیش وەک روستەم قەمەی بە دەستەوە گرت. داش ئاکۆل قەمەی لە زەوی داکوتا. دەستەونەزەر راوەستا و کوتی:

« ئێستا لۆتییەکم دەوێ کە ئەم قەمەیە لە زەوی دەرکێشێتەوە! »

کاکا روستەم شالاوی بۆ برد، بەڵام داش ئاکۆل وەهای لە مەچەکی کوتا کە قەمە لە دەستی دەرپەڕی. بە دەنگ و هەرای ئەوان تاقمێک رێبوار کۆ بوونەوە، بەڵام کەس نەیدەوێرا بچێتە پێش یا نێوبژیان بکا.

داش ئاکۆل بە بزەوە کوتی:

« برۆ، برۆ هەڵیگرەوە، بەڵام بەو مەرجەی ئەوجارەی قایمتری راگری، چوونکە ئەوشۆ دەمەوێ کۆنە حسێبەکانمان پێکەوە پا کەینەوە! »

کاکا روستەم بە مستان لێی هاتە پێش و هەردووک تێک گلان. هەتا نیو سەعاتان لە سەر زەوی دەگەوزان، ئارەقە لە سەر و روویان دەتکا، بەڵام هیچکامیان سەرنەدەکەوتن. لەو گێرە و کێشەیە دا سەری داش ئاکۆل وە بەردەرێژ کەوت، لەوانە بوو بێهۆش بێ. کاکا رۆستەمیش ئەگەرچی بە تەمای کوشتن دەیوەشاند، بەڵام برستی بڕابوو، لەپڕ لەودەمە دا چاوی بە قەمەی داش ئاکۆل کەوت کە لە بەر دەستانی بوو، بە هەموو





دەمای خۆی دەریکێشا و لە کەلەکەی داش ئاکۆلی کوتا، وای تێکوتا کە دەستی هەر دووکیان لە کار کەوت.

تەماشاچیەکان هەڵاتنە پێش و داش ئاکۆلیان بە زۆریی لە زەوی هەڵگرتەوە، خوێن لە کەلەکەی دەڕژا، دەستی لە سەر برین دانا، چەند هەنگاو بە دیوار دا خۆی کێشا، دیسان کەوتەوە دوایە ئەویان هەڵگرت و لە سەر دەستان بۆ ماڵییان بردەوە.

بەیانی ئەورۆژە هەر کە هەواڵی بریندار بوونی داش ئاکۆلیان بە ماڵی حاجی سەمەد دا، وەلی خانی کوڕە گەورەی بۆ سەردانی چوو. کە گەیشتە بان سەری داش ئاکۆل دیتی بە ڕەنگی بزرکاو لە جێ دا کەوتوە، کەفی خوێناویی لە زار دێتە دەر و چاوی لێڵ بوە، بە زەحمەت هەناسە هەڵدەکێشێ. داش ئاکۆل دەتکوت لە ئاویلکەدان دا ئەوی ناسیوە بە دەنگی نووساوی لەرزۆک کوتی:

« لە دونیا دا ... هەر ئەو تووتیەم... هەبوو... تۆ گیانی خۆت... گیانی تووتی... ئەوی بدە... بە... »

دیسان بێدەنگ بۆوە، وەلی خان دەسرەی هەوریشمی دەرهێنا، فرمێسکی چاوی سڕیوە. داش ئاکۆل بێهۆش بوو و دوای سەعاتێک مرد.

هەموو خەڵکی شیراز بۆی گریان.

وەلی خان قەفەسی تووتی بردەوە ماڵێ.

ئێوارەی ئەورۆژە بوو، مەرجان قەفەسی تووتی لە بەر خۆی دانابوو و چاوی لە ڕەنگی پەڕ و باڵ، دندووکی خوار و چاوی خڕ و بێ حاڵەتی تووتی دەکرد. لەپڕ تووتی وەک داش ئاکۆل بە لەونێکی گڕ کوتی:

« مەرجان... مەرجان... تۆ منت کوشت... بە کێ بڵێم... مەرجان... ئەوینی تۆ... منی کوشت. »

فرمێسک لە چاوەکانی مەرجان هاتنە خوار.



